دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی
**ئاراس**

زنجیرەی رۆشنبیری

**خاوەنی ئیمتیاز: شەوکەت شێخ یەزدین**

**سەرنووسەر: بەدران ئەحمەد حەبیب**

* * *

کتێب: بۆ کوردستان
دیوانی: هەژار
سەرپەرشتیی چاپ: شوکور مستەفا و بەدران ئەحمەد
دەرهێنانی هونەری: بەدران ئەحمەد
بەرگ: محەمەد قادر
بڵاوکراوەی ئاراس- ژمارە: ٤٦
چاپی چوارەم - چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە
هەولێر- ٢٠٠١
لە کتێبخانەی بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی رۆشنبیری و هونەر
ژمارە (٧٨)ی ساڵی ٢٠٠٠ دراوەتێ
*

# وشەیەکی پێویست

ئەرکی لە چاپدانەوەی «بۆ کوردستان»ی شاعیری گەورەی کورد «هەژاری موکریانی» ، لەلایەن سەرۆکی خۆشەویست کاک مەسعود بارزانی یەوە، بە ئێمە سپێردرا. ئەرکی ئێمە لە سەرپەرشتیی چاپی ئەمجارەی دیوانەکەدا ئەوە بووە کە شیعرەکانمان هێناوەتەوە سەر رێنووسیی ئێستەی کوردی و هەڵەبژێریمان تێدا کردووە بەو هیوایەی بێ هەڵە و کەموکورتی دەربچێ. هەوڵیشمان داوە ئەگەر لەملا و لەولا شیعرێکمان دەست کەوێ بەگەڵ ئەم چاپەی بخەین، بەداخەوە جگە لە تاک و تەرایەکی پاشکۆی «مەم و زین» و «خەیام»ەکەی، شتێکی ترمان دەست نەکەوت. مامۆستا فەرهاد شاکەلی لە سوید کۆمەڵێک شیعری هەژاری لە نامیلکەیەکدا بەناوی «بەیادی تۆ دەژی دڵم» بڵاوکردووەتەوە کە لە سێ چاپەکەی پێشوودا نین، ئەوانیش ئەو شیعرانەن کە هەژار ساڵانە لە ساڵوەگەڕی ماڵئاواییی نەمران «مەلا مستەفای بارزان و کاک ئیدریسی جوانە مەرگ»دا گوتوونی. زۆربەی شیعرەکانی بەشی چوارەمی ئەم کتێبە لەو نامیلکەیە وەرگیراون. نامیلکەکەی شاکەلی هەندێ هەڵەی چاپی تێ کەوتووە، هەوڵمان داوە لێرە بەپێی دەسەڵات ڕاستیان بکەینەوە.

سوپاسی بەڕێز سەرۆک مەسعود بارزانی دەکەین کە ئەرکی سەرپەرشتیی ئەم چاپەی «بۆ کوردستان»ی پێ سپاردین و هیواداڕین ئەوەی کردوومانە مایەی ڕەزامەندیی بەڕێزیان بێت.

مام هەژار لە هەموو چاپەکانی پێشوودا نووسیویە: «سوپاس بۆ خودا کە دەست و زمانمی بۆ خزمەتی کوردی خستۆتە کار. سوپاس بۆ باوکی کورد و برای هەژاران (مەلا مستەفای بارزانی) کەوا دووجار ئەم دیوانەی بۆ چاپ کردم». ئێمەش هەموو هیوامان ئەوەیە کە گیانی باوکی کورد و برای هەژاران (مەلا مستەفای بارزان) و گیانی هەژار خۆیشی بەم کارە شاد بن و، کتێبخانەی کوردی بۆ یەکەم جار بەئازادییەوە باوەش بۆ «هەژار بۆ کوردستان» بکاتەوە.

شوکور مستەفا و بەدران ئەحمەد

٢٧ ئایار ٢٠٠٠

# وەسیەتنامەی هەژار

## بەناوی خودا

حەدیثی پێغەمبەرە سلاوی خودای لێ بێ: «لەو دنیا هەر کەس دەگەڵ ئەوانە حەشری دەکرێ کە لەسەر دنیا خۆشی ویستون»

خواش ئاگادارە کە منی هەژار لە هەموو تەمەنی ژیانمدا هیچ کەسێکم بە قەدەر مەلا مستەفا بارزانی خۆش نەویستوە... کە بەرانبەر بەو حەدیثە دەبێ حەشرم دەگەڵ ئەو بێ و هەروەک لە دنیا لێیەوە نزیک بووم لە قیامەتیش بە یەکێک لە نزیکانی خۆیم قبوڵ بکا.

وەسیەت دەکەم بۆ ئەو کەسانەی دۆست و نزیکمن ئەگەر ئەوەندەی بۆیان مومکین دەبێ کاتێ مردم لاشەکەم لەبەر پێی مەرقەدی مەلا مصطەفا بارزانی بنێژن. یان لانی کەم لەو گۆڕستانەم بنێژن کە ئەوی تێدا نێژراوە... لەوانەش کە دۆست و نزیکی بارزانین و لەپاشی بەجێ ماون دەپارێمەوە، ئیجازە بدەن کە قەبرم لە قەبری مستەفا بارزانییەوە تا دەکرێ دوور نەبێ. تاوەک لە دنیا هەموو دڵخوشی و شانازیم بەدیتن و نزیکبوون لەو بوو.. لاشەکەشم نزیک بە جەنازەی پیرۆزی ئەوبێ و ئەگەر خوای کرد و لە سایەی ئازادبوونی کوردەوە جەنازەکەیان بردەوە بارزان، شتێک لە ئێسکی منیش بەرن و لەبەر پێی ئەودا ژێر خاکی کەن. ئەگەر بۆیان مومکین نەبێ وەسیەتەکەم جێبەجێ کەن قەیدی نییە، خۆ ئەگەر بۆیان مومکین بێ‌و زەحمەت‌و دەردی سەری لەدوو نەبێ و بە وەسیەتەکەم عەمەل نەکەن لە قیامەت لای بارزانی گلەیان لێ دەکەم. لێشم روونە هەروەک لەسەر دنیا لاگیری لێ دەکردم ئەوساش لاگیریم لێ دەکا...

امضاء: عبدالرحمن شەرفکندی. هەژاری شاعیر.

ئەم وەسیەتە رۆژی ١٧/ شعبان ساڵی ١٤٠٤ هجری قمری= ٣٩/ اردیبهیشت ١٣٦٣ هجری شمسی ١٩/ مانگی مای ١٩٨٤. لەگوندی سلیڤان نووسراوە... هەژار

## پێشەکی چاپی سێهەمین

ئەم دیوانە جگە لە «ئاڵەکۆک» و «خەیام» و «مەم و زین» و ناوئاخنە بە بەندەکانی «شەرەفنامە» و «هۆزی گاوان»، دەکرێ بێژم زۆربەی زۆری ئەو هەڵبەستانەی تێدایە کە لە ساڵی ١٩٤٨ی میلادەوە گاگا بەهۆی ڕووداوێکی سەرنج ڕاکێش، یاخۆ هەروا بە ئارەزوو درەنگ یا زوو تاک و تەرا هۆنیومن و نووسیومنەوە.

بۆیەش وتم زۆربەی زۆر و ناڵێم هەمـوو، چونکە کـەرتێکم لێ ئاوەکی بوون و بۆم نەلواوە هەرچییـەک بە پەرژوبڵاوی لە ڕۆژنامـە و کـۆوارەکـانی بڵاودا بڵاو بوونەوە، هەموویان بەسەر گرمەوە. ئەنجار بەهۆی کۆسپ و گرێی ژینی دژوار و نالەبار جاروبارە دەستەوارێک کراونە چاوگەی ئاگر و بوونە مشکی. چەند برێکیش بەر لرفەی لافاو کەوتوون و توون بەتوون چوون. پەڕ پەڕێکیش بە ونجڕ ونجڕ کراوی بەدەم ڕەشەبادا دراون و هیچیانم لە بیر نەماون. کۆمایەکیش هەروا ماون و چاوەچاون بێنە بەرچاو تا هاوزمانانی کوردم چاوێکیان پێدا بخشێنن.

## بوێژی ڕووت چکارەیە؟

وێژەناسان لایان وایە هەر بوێژێک لە هەر دەور و زەمانێکا هەر ڕێبازێکی گرتبێ یان بەبێ ڕێ ڕۆیشتبێ، بەهەر ئاوات و نیازێک هەڵبەستی هۆنیبێتەوە ئەو بوێژە لە ماوەی ژیانی خۆیدا ڕموزنێکی درۆزن، یان خوخۆش و ڕاستگۆ بێ، سفت یان بێ تان و پۆ بێ، بەلەنگاز یان ساز و کۆک بێ، بوێر بێ یان ترسەنۆک بێ. بێ ئەوە خۆی ئاگا بکا بێ گومان هەڵبەستەکانی ئاوێنەیێکی ڕوونوێنی ڕوودانی ژین و کردەوەی ئاپۆرەی ڕۆژگاری چەرخی خۆیەتی. بۆ بەڵگەی ڕوون باسی ئەبو نەواس دەکەن:

ئەو کابرایە لە سەتا هەشتای هەڵبەستی لەسەر مەستی و بادە و سادە و تۆڵازی و نێر و مێبازی و پەسنبێژی و فرهاوێژی دەبرێتەوە. بەو حاڵەش ڕا تۆژەرەوانی وریا و زیت بەوردبینی و بەزانیاری کە لێیان کۆڵیوەتەوە؟ وەک فیلمێکی ڕەنگین و پڕ وردەکاری نووک و بە دیی داب و کرداری دەرباری هاروون و ئەمین دەردەخا. وێڕای ئەوەش ژینی ئەوسای دەوڵەمەند و دڵمەندانی حەشاماتی هاوژیانی و بیر و بڕوای موسوڵمانانی لێک جیای ئەو دەورە دەور ئەکاتەوە و بە ڕۆشنی شانی ئەدا.*

* ئەبو نوواس: ٧٥٧-٨١٤ ی میلاد، ناوی حەسەن کوڕی هانی، خەڵکی ئەهواز شاعیری دەرباری هاروون ئەلڕەشید و ئەمینی خەلیفە بووە. نوواس واتا: جۆلاتەنەی جاڵجاڵۆکە.

## بەسەرچڵی تۆزێک لە بەسەرهاتەکەم

با هیچ کارمان بەوە نەبێ کە من ئاخۆ چ ڕێبازێکم گرتووە و لە هۆنینەوەی هەڵبەستم نیاز و مەبەستم چ بووە؟ شایەرم یان لاپرەسەنم؟ خۆشم نازانم کامیانم. بەڵام ڕوون و ئاشکرایە سی و چەند ساڵی تەمەنم دەربەدەر و ماڵانگەڕ بووم. نزم و بەرز و پیس و پاک و بەد و چاکی زۆرم دیوە. بە دەردی کوردە گوتەنی: دنیام قونە کەو کردووە. بۆ نانەوشکی ڕۆژانە و بۆ جێ خەوێکی شەوانە لە شاگرد مەیخانەچیەتییەوە بگرە تا عەنباڵی و قوڕەکاری و گەسک لێدانی ماڵان و کاشی ماڵی و ئامان شوشتن و زبیڵ ڕشتنم کردووە. ئەوەی بەسەر من هاتووە بەدەردی حاجیەکە گوتی: بەسەر حەسەن و حوسێن هاتبا سەکەت دەبوون. بە قەتاری دەرەجە سێ، ئۆتۆبۆسی دەرەجە دوو، کەڵەکی فوو. بە سەفەر چووم. لە ناو جەرگەی هەژاراندا لە نەداریدا یەکەم بووم و دەگەڵ هەژاراندا ژیاوم. زۆر بە پاو گاگاش بە سواری زۆر باژێڕ و گوند و گۆڕ و شیو و بەربنار و شاخ و دۆڵ و دەشتی بێروونو وشکارۆ و چۆڵ و هۆڵ و پان گەڕاوم. شەوگار لە هەرزانترین خان یان لەسەر بانی مزگەوتان، جارجار لەسەر ڕەڵمی گەرم لە سارایە، زۆرجار لەو کەژ و چیایە لە ئەشکەوتان، لەسەر بەردان لەبەر باران و لەنگێزە ستارم گرتووە و خەوتووم. بەرگ شڕی و بێ شمەکی و کەوش چەکی و چڵک و چەپەڵی و گەمارییی بێ ئەسپۆنی و ئەسپێونی هۆگریان پێوە گرتووم و چاومیان بەخۆ ڕاهێناوە. گوێچکەم بە جوێن و پلاری خاوەن کاری نالەبار و ڕژد و خوێڕیلە خاراوە.

واتا دەردی هەژارانم نە بەدەم، بە دڵ چێشتووە. مەسەل دەڵێ: سەد بژیشک بە ئەندازەی دەردەدارێک نازانێ نەخۆشی چییە؟ ویستوومە ڕۆژگارێک دابێ هەژار لە بێگار ڕزگاربێ و بەگیاندارێکی بەئابڕوو حەساو بکرێ و هەر بەسەری زیندوو نەمرێ. بۆ پێکهاتی ئەم ئاواتەش شنگڵێکی پێداویست بۆ لە خۆ بدرێ و کارێک بکرێ هەژار بە بێچارە خۆران نەخورێ. پێشینانمان گوتوویانە: مناڵی مناڵ ئاساییش تا نەگری شیری نادەنێ. ماف کە نەسێنرێ نادرێ.

سەرباری دەردی هەژاری و لەش بەباریش گەلێک ساڵان بەرخ ئاسایی لە گورگی ورگن ترساوم، پۆلیس و مووچەخۆرانی دەوڵەتانی داگیرکەری وڵاتەکەم هێرشیان بەتاو بۆ هێناوم، ناچاربووم بە زگی برسی خۆ لە قوژبنان قایم کەم نەمدۆزنەوە. دایم لەجێ گۆڕکێدا بووم نەک لە شوێنێک پێم بزانن و بم قۆزنەوە.

له ئێران ڕام کرد بۆ عێراق، له عێراق پۆلیس ڕاوی نام بۆ سووریا، له سووریا بوومه قاچاغ و لەوێش دەبوو له شوێنەونکه قۆچاغ بم. «ئۆباڵ بەستۆم ناهەقیش نەبوو بمگرن» چونکه منی نیومن و نیونیومنیش نا، بێ کەس و بێ دەر و بێ کار وەک جەنابی مەلا فەرمووی بەزگێک تێر له دووزگان برسی، هێشتانێ عارم نەنابوو، بەخێر سیاسەتم دەکرد، واتا لەسوور دۆڕاندبووم لەکایەم تێ هەڵدێناوە. وەک دەڵێن «کوێر هەتا دەمرێ هەر بەئاواتی چاوانە». بۆ ئازادی تێ دەکۆشام، له هاوالی ڕێ دەگەڕام، بە شکو ڕۆژێک له سایەی هاوکاریی واندا ئەو ڕۆژانه ببینمەوە که کوردستانی دڵبەرم ماوەی ساڵێک تیا ژیاوە و ئاڵای خۆی لەسەر شەکاوە.

هەر کۆمەڵێک بەدەم یان بەجیرەی قەڵەم بیگوتایە بیری ئازادیم لەلایە، دەچوومە لای. دەگەڵ سووره خۆماڵییەکان بوومه ئاشنا، هێندیان قسەی خۆش بۆ کردم، هێندیان بە دەم دڵخۆش کردم کە لام وابوو هەر کەسێ سمێڵی سووربێ هەمزاغایە. سوور له پیلی کورد دەنەون و بەرەو بەهەشتی ڕادەدەن. تا سەرەنجام بۆم دەرکەوت ئەو بابه ڕاستەش زڕخاڵه و فەرمووده‌یان کرچ و کاڵه و تۆپی پتە و ناو بەتاڵه. ئەوانەی هەوسارم دەگرن بەرەو کەندەڵانم دەبەن، چیم هەیە لەویشم دەکەن، عارەبە ڕەشکەی خۆسوورکەر بۆ عەرەبایەتی کردن دەستی نازیی ئاڵمان خوازی بە بزمار له تەختە دابوو. تەنانەت سووره کوردەکەش کە بۆیان فریو درابوو بە شانازی خۆی بە تازی حەساو دەکرد، بۆ ڕەگەز پەرستی عارەب ببووە نۆکەری بێ مز و کوردایەتیی بە لاوه گوناح و سووچ بوو. بە زمانی خۆی کە کوردی بوو نەیدەدواندم، له عارەبیش کۆڵەواربوو. سەیری خۆشیش لەمەدایە لەوەتا له وڵاتی عارەب کمۆنیستی پەیدابووە؟ هەتا ئێستاش له میسر و سووریە و عێراق – مەگین چلۆنکایی بووبێت – ئەگینا کەوچک بە دەستی حیزبەکانی بە گفتی خۆیان «کمۆنیست»، سەرلەبەریان بەچکە کورد بوون. هەمووش تێکڕا مامۆستا «خالید بەگداش»یان بە مامۆستای هەرە باشیان پێ ناساندوین. بەگداشی کورد و مامۆستاش ناوی کوردی بیستبایە وەک دڕکی وەبن کلکی دەن جووتەی داوێشت. سوور مانای ئەوە بوو وابێ، کوردەکەش بکاتە عارەو. تازە لەو ڕەنگەی گرتوویە نابێ هەرگیز کاڵ بێتەوە، جا مەگین تاکتیک تێکی دا.

پیاو با قسێکیش بۆ دز بکا، ماڵم هەقە جار جارە ڕەنگیان دەگۆڕا. ئەویش کەنگێ؟ مەسەل دەڵێ «بۆز بە لەڕی». هەرکاتێ تێیان دەگیرا و له لایەن دەوڵەت ڕاودەکران یاخۆ له هەتیتە دەدران. بۆ تەفرەدانی ئەوانەی کورد و کوردستان پەرستن تا پەنایەکیان

دەسکەویّ و لە ناو کورد بپارێزرێن و سەر لەنویّ ببووژێنەوە. بە زەرتک خۆیان ڕەنگ دەکرد و وەکو ژێ کافەکەی خۆمان کوردستانی یەکپارچە و مەزنیان دەویست. بەڵام هەر ترسیان دەرەوی، بار دەگۆڕا. وەک فتیلەی ناو تەویلە دوای وەی کاریان پێ نەدەمابن پفێکیان لێ دەکردین و لە دەلاقەیان دادەناین. عەلاقەیان دەگەڵ کوردپەروەران دەبڕی و هەرکەس کوردبا و بیگوتایە من عەرەب نیم دەمیان دەشکاند.

## ئەوجار پارتی

دەگەڵ پارتی «هەمزە» و «برایم ئەحمەد»دا- واتا خەزوور و ماموّستای ئەم مامجەلالەی ئێستامان، کە دەیانگوت ئێمە بۆ کورد خەبات ئەکەین. هەر لە ئێرانەوە دەرچووم ڕاستەوخۆ چوومە لایان و لە ژێر سێبەری ئاڵایان وەک سۆفیلکێکی ساویلکە لە لاشیپانەی دەرگایان دەستەونەزەریان دەویستام و فەرمانیانم بەپێی توانا بە گیان و دڵ پێک دەهێنا. لە پاش چەند ساڵ، دوای هەزار ئەزموونی سوێروتاڵ تازە بەخێر تێ گەیشتم وەک لە بەیتێکا گوتوومە «پووچ هاتووم بە شوێن کڵاوی قووچا». پارتەکەی جێ هومێدیشم خۆی بە هیچ کارە دەزانی و ببووە کلکی ئەو تاخمە سوورە زرتانەی تانەی چاوی کوردخوازان بوون، کامەی لە پارتییە کوردەکەی لەچاو مەمانان چازان بوون خۆیان ناونا ئاوی ئاوی کەروێشکەکە و دەشیان گوت ئێمە خەست تر و بۆ برایەتیی گەلانی کورد چەوسێنەوە بەکارتر و بەهەست ترین، بەڵام هەرچەند کلکەسووتە و ماستاویان کرد بەهیچ ئاوا کوردایەتی و کمۆنیستیی ئەو سەردەمە پێکەوە پیلۆز و جوت باقیە نەکرا و هەرچی وتیان گەمەی پێ کرا و وەک کوردە لە هەردووک جێژنان بووین. ئیتر منی هەژاری دەربەدەر و زویر وەک گای ئاوکێشی کۆڵ و بیر لە جەغزێکی بێ جەمسەردا دەخولامەوە. هەڵە، یان ڕاست، وازم زۆر لە کوردایەتی بوو. دەهۆڵی کوردایەتییەکەش داخەکەم دەنگی نەدەدا، نمی ئەنتەرناسیۆنالیستی کێشابوو. یان بەقەولی کاک زەبیحی: کۆزمۆپۆلیتیی تێی ڕیابوو.

لەبەر ئەم دەپاڕامەوە، لەلای ئەو دەڵاڵمەوە پیاوی چابن وەرن کوردبن. ئەگەر هەر کمۆنیستیش بن بڵێن کمۆنیستی کوردین و دەمانەوێ بەو ڕێگەدا کوردستانمان ئازاد بکەین. ناڵێم دۆستی و ئاشنایەتیی گەلانی دراوسێ مەکەن. دەڵێم ئێوە نانی خۆتان لە سەر سفرەی تورک و تاجیک و عارەبان دەرخواردی میوانان مەدەن. با بزانن خانەخوێ کورد بوو. بەلانی کەم مرۆ دۆست بن. سوور دەزانن هەر کوردە لەڕووی دنیادا نە ناو نە

ناسیاوی هەیە. لە زۆر شوێنان کۆمەڵی بەزەی جانەوەر هەیە هیچ نەبێ ئێوەش کۆمەڵێک بۆ ئاگا لەو جانەوەرەی کە ناونراوە گەلی کورد پێک بهێنن. چ دەقەومێ؟ زوو پەرسڤیان دەدامەوە تورک و تاجیک و عارەبیش بە بیست و چەند دەوڵەتەوە هەموو برا گەورەمانن. تا برای زل ژن نەهێنێ برا چووکە هەقی نییە متەق بکا.

ئێمەی بە خۆمان دەڵێین کورد لەبەر هەر حوکمێکدا دەژین لەسەرمانە قڕوقپ بین، نەڵێین کوردین. ئەگەر پێیان فەرمووین چەرموین، ئێمە ئێژین «بەفری کەژین» ئەگەر گوتیان تاڵە جوانە دەبێ بێژین «کلۆی ڕەژین». دەبێ هەریەکەی لەلایەک بلێین. ئارین، بەچکەی قەحتان و نزارین، تورکی کێوین. بەزمانی ئەوان داخێوین. خۆمانیان بۆ بەکوشت ئەدەین. تا هەموو وڵاتەکانیان بەرەبەرە وەک خوێنی پژاومان سوور دەبێ و وەک شیلان و دەنکە مەرجانی ناو بەرموور دیمەنیان دێتە بەرچاومان، هەرگا ئەوان سوور هەڵگەڕان خۆیان فەرمانمان پێ دەدەن بێژین کوردین «کەرە مەمرە بەهار دێ» عاسمان دوور و زەوی سەخت ئەمن چ بکەم؟ پیاوی دڵدار لە ڕێگەی گەیشتن بە یار هەر کارێکی لا ڕەوایە. چاری ناچار بۆ ئەوە هەلم دەسکەوێ و دادی کوردان بەگوێی ئازادانی دنیا دادەم، بەهەزار تەڵەکە و کەڵەک دەگەڵ تازەڕەنگ ئاڵێکی دەڵەمەی هێشتا کورد و کاڵ خۆم ڕێک خست و هەرچۆنێک بوو خۆم گەیاندە جەژنی لاوان لە بوخارێست، دەردی کوردم بۆ ئازادیخوازانی جیهان شی کردەوە، کیژە تورکێک دەسکێ گوڵی پێشکەش کردم و زۆر عوزرخوازی لێ کردم کە کورد لە وڵاتەکەی ئەودا بەرستەمە. نوێنەرانی گەلانی دیش هەر کەسە بە نۆرەی خۆیان دڵسۆزیی خۆیان دەربڕی. برا کوردە سوورەکانی هاوڕێم نەبێ کە لەسەر ئەم کوردایەتییە کارێکیان بەسەر هێناوم «عارەب بەسەر گامێشی خۆی نەهێناوە».

جارێکی تر بۆ بەشداری لە فێستیواڵی مۆسکۆدا کە برا سوورەکانی عێراق گوتبوویان قەی ناکا بچن؟ خۆم تەیار کرد. برا کوردە سوورەکانی سووریایی کە دەیانزانی هەر کوردم. کارێکی وایان پێ کردم «با بە دەواری شڕی ناکا»، من و دوو هەواڵەکەمیان کە یەکیان کاک زەبیحی بوو ناونا «خوێنتاڵ و ئیمپریال»، پێت وانەبێ منیش دەستم دادەنەواند. مستی وام تێ دەسرەواندن گورچووبڕبێ و حاڵیان شڕ بێ، دە جار ناویان نام جاسووس و سەدجار پەشیمان بوونەوە و دەستەوداوێن دەبوونەوە هاوکارییان دەگەڵدا بکەم یا کەمتر ئازاریان بدەم. جا ئەگەر لەسەر کوردێنی لۆمەی سوورە زرتەم دەکرد؟ مامۆستاکانی پارتیمان لە بنەوە کەیفیان پێ دەهات. بەڵام لە ترسی مەلعوون بوون نەیان دەوێرا دەری خەن. ئەو ژیانەی کە من لەو ماوەدا ڕام بوارد ئەگەر بە درێژی باس بکرێ مەسنەوییەکی

حەفتا هەزار مەنیی دەوێ! سوور ئەو سوورەن کە لە کوردایەتی توورەن. پارتی کوردیش بێ دەسەڵات و بێ بڕشت هەموو ئاواتی ئەوەیە بەلانی کەم بە ئاڵی و کاڵی حەساو کەن. بەڵام لێیان قبووڵ ناکەن، ئێژی سوورم، دەڵێن شینی! دەڵێی واکم، دەڵێن هینی و نامانەوێی. دەوڵەتیش دژی هەردووک لا.

منیش جارێک بە سووری تۆخ، هەلێک بە شینی چویتی، چەلێک بەناوی ئێرانی سنوور پەڕێنی غەوارەی بەدکار دادەنێن و بە چراوە لە دووم دەگەڕێن کە بمگرن. ببوومە مەتەڵی ئەسپێ «ئەولام تات و ئەمەلام تات وەی بابە جیقم دەرهات». قاسم کوودەتایەکەی کرد، مەلا مستەفا بارزانی پاش چەند ساڵ ژیانی تاڵ کە لەسەر کوردایەتییەکەی بە بۆمبارانی دەوڵەتی هەرەزلی ئەو سەردەمە لەخاکی خۆی دەرکرابوو، لە مهاباد یاریدەی کۆمەڵەی کورد و کۆماری کوردانی دابوو، لەپاش تێکچوونی کۆمەڵەش، دەستی بۆ دوژمن نەدابوو، چووبووە ڕووسیەی شورەوی و بە پەناهەندەیی ژیابوو، گەڕایەوە بۆ بەغدایە. بە هاتنەوەی پارتیی ژاکاو، بووژایەوە، کوردایەتیی زۆر بە هێز هاتەکایەوە و ناوی کورد و کوردپەرستان لە دنیا دەنگی دایەوە. لەمن هەر مەپرسە چۆن بووم! چەند بەو موژدە گەشامەوە. کۆنە ئاشنای چواردە ساڵ لەمەوبەرم بوو، ئەوساش هەر تاجی سەرم بوو، هەر کە دیتمی و دواندمی، زانیم ئەوەی لە دووی وێڵم دۆزیمەوە، ئاواتی کوردستانە و بەس. هیوای منی هەژارۆکە و ئەو مەردە ئازا و بەکارەی لەخوا نەبێ ترسی لە هیچ کەسێک نییە، تەواو یەکتر دەگرنەوە. خۆم بە سۆفیلکێک دەشبهاند کە نزیک بەناهومێدبوون خوا پیرێکی زۆر پیرۆزی بۆ گەیاندم. زۆر بە بەختی خۆم دەنازم کە لە پەنای خۆی پەنای دام، لە سای ئەودا بەرگی لالایی و مەرایی ساڵەهای ساڵم سووتاند و هەودای ترسانم پساند و دەروازەی خەمم داخرا و گرێی دەمم کرایەوە. لەوساوە لەبەرپێی ئەودا، کە تادەمرم تۆزی بەرپێی بە پیرۆزترین شت دەزانم، تا لێک دیدار ئاخرەت بووین بە ئازادی چیم بەدڵدا دەهات دەمگوت، هەر تەنگانەشم بۆ دەهات دەیپاراستم.

بارزانی نەک تەنیا بۆ من بۆ هەموو نووسەران چابوو. بۆ بێکەس وەختی خۆی کەس بوو. بۆ قانیع و مام هێمن و جگەرخوون و گش نووسەر و شاعیرانی بێ بەش و ناکام برابوو. ئەگەر کەسانێک وا بزانن کە من بۆرە خزمەتێکم بە زمانی کوردی کردووە، با مەمنوونی بارزانی بن، چونکە ئەگەر ئەو نەبوایە کەس پەڕێکی چاپکراوی لە نووسراوی من نەدەدی. باسی پیاوەتی و ئازایی و کوردایەتی و مەردایەتیی مەلا مستەفا بارزانی زۆر کتێبی گەورەی دەوێن تا دەناسرێ، کە لێشم ڕوونە دەنووسرێن. بەڵام هەرشت

بەوەختـی خـۆی. من دەزانم تـاریخ داوەرێکی چاکـە، هەڵە ناکـا و پەلەش ناکـا. بە ڕۆژی خۆی پـاک و پیس لێک هەڵداوێرێ. لە زۆر زەردە قۆڕەی ئەمڕۆ کە هەردەم ڕەنگێ دەگۆڕن خۆ دەبوێرێ و بەناوی ئەو کوردە مەردە سەر ڕووپەڕی ڕێزە ناوی هەمـوو کوردی شۆڕشگێڕ و پیـاوی ئازادیخوا و ئازا و کوردسـتـان پەرسـتی کۆن و تازە دەڕەنگێنێ. ئەوی کـە دەڵێن «بارزانی مرد و نەما» زۆر نەزانن، بارزانی هەرگیـز نامرێ و نەش مردووە. گـەلێکیش لەو دەم هەڵانەی دەڵێن زیندووین، لای من بە مـردوو حـەسـاون. دەریا دوڕ دەشـارێتـەوە و ئاومالک و کەف وەسەر دەخا. با چاوەنۆڕی تاریخ بین، دوا ڕۆژ هەمـوو شت دەردەخا.

جا ئەی خوێنەری بەڕێز و خۆشەویستـی هاوزمانم. ئەوا چاپی سێیـەمـینی دیوانەکـەت پێشـکـەش دەکەم. تکایە تا سەرلەبەری نەخوێنیـەوە. نە جوێن بدە، نە باسم بە چاکە بکە، بە پەلەشی مـەخوێنەوە، لێی ڕامێنە، وردی کەوە. بەرانبەر بە ڕۆژ و کـاتـی نووسراوەکەی پێ نووسراوە و بۆی نـووسراوە بیر بکەوە. با تێم بگەی کە من چیم و چم ویستـوە. ژیانم چلۆن تێ پەڕیوە و چهام دیوە. ئەگەر بە کەیفێشت نەبێ هیچ نەبێ ئەوە فێر دەبی کە وەکو من هەڵە نەبی و لە هەزار جێ دەسـتت بەزاخـاودا نەچێ. لەوانەشـە کـەسـانێک کـە سـەرزارەکی دەیانناسی و بە پیـاگی خـاسیـان دەزانی بیـان ناسی چین و چیـان دەوێ. یان کـەسانێک کـە فێـڵبـازان بە شـات و شـووت بە دزێویان نیـشـانداوی لە خوێندنەوەی ئەم دیوانە تێ بگەی کە فریودراوی و لە هەڵە پاشگەز ببیەوە.

بەسـەرهات و تەجرەبەی سی و دوو سـاڵی ڕابردووی ئاوارەییی مـنی هەژار بەهێـواشی شی بکەوە و گەوەکانی تێک خەرەوە و بیدە بەر بیری ڕووناکت. ئەوسا ئەگەر هیچی وات وەبەر چاوکەوت کەموسکێک کەڵکێکی هەبێ ڕەحمەتێکم بۆ بنێرە. خۆ ئـەگەر چی باشت نەدی و ڕێگەکـەمت بەشاش زانی ئەوسا گـەردنت ئازابێ، جوێنێـک بدە و بەدەردی کـوردە گوتەنی «تفی خۆت باوێژەو بڕۆ» .لە کۆتاییدا دەمەوێ کورت و کرمانجی پێت بڵێم «کوردم و بەس» . هەرکـەس کـوردپەرسـتی ڕاست بێ سـڵاوەتم لە دیداری. ئەمـڕۆ ئەوپەڕی ئاواتم ڕزگـاربوونی کوردستـانە لە بێگانە. بە فـەرمایشی مـام هێمن «وەتەن خـەرابە چ دەربەستی بیرلەن و پەکەنم» . سا ئەوە تۆ و ئەوە دیوانی «دێوانەی کوردستـان» .

هەژار

١٣٥٨ /١٠ /٥

## پێشەکییەک بۆ چاپی دووهەم

لەسەر تۆم دوژمنە دنیا – قضیة مانع الجمع –ە
کە تەرکی تۆ نەکەم تەرکی هەموو دنیا نەکەم چبکەم؟

مەحوی

ساڵی١٩٦٦ «هەژار بۆ کوردستانم» خستە بەردەستی خوێندەوارانەوە و هەستم بۆ ڕاگرت و گوێ قولاغی دەنگ دانەوەی بووم، ئەوی ڕاست بێ خوێندەوارانی هاوزەمانم بوونە چەند بەشێک و ئێستاش هەروا لکیان لێ دەبێتەوە، ئەوانەی ڕکیان لە شیوعی و دەستە چەپیەکان دەبێتەوە گوتیان «هەژار شیوعییەکی پیسە و بۆ ئەوە نابێ دیوانەکەی بخوێنرێتەوە!».

ئەوانەش کە وشکە شیوعی کوردن و هەموو دنیایان لە بیرە کورد و کوردستان نەبێ. گوتیان«هەژار فاشیست و ڕەگەزاوی و کۆنە پەرستە و لە ئەنترناسیۆناڵ و دەیالەکتیک نازانێ و فڕی بەسەر تەقەددومیەتەوە نییە».

مامۆستا جاشکەکانی ٦٦ وەک مامۆستا برایم ئەحمەد و مامۆستا جەلال تالەبانی و گەجەر گوجەری دەور و بەریان کە خۆیان هاویشتۆتە کۆشی بێگانان و کوردە نامووسی خۆیان بە پارە و پوول بە دوژمنانی کورد و کوردستان فرۆشتووە، نووکی قەڵەمی منیان وەک نەقیزە تێڕاچوو، جووتەیان لە ئاسمان دا. چاویان قووچاند و دەمیان کردەوە، دوژمنی ڕای ئیمانت بێ ئەو جوێنی ئەوان دایان و ئێستاش هەروا دەیدەن، ژنە قەرەج خۆزگەیان پێ دەخوازێ، دوای ئەوە کە سەرزارەکی تێریان جوێنی بازاڕی و بێشەرمانە دا، لەسەر ڕووپەری ڕۆژنامە عەرەبییەکەیان (نەوەر) و لە کۆواری (ڕزگاری لە نامووس)یاندا نووسیان کە «هەژار شایەری دەرباری بارزانی ـ یە و کێ نانی بداتێ بەو هەڵدەڵێ و بێگانەیەکی خوێنتاڵە و دژی تورک و فارس و عەرەبی برامانە و خزمەتکاری ترێستات و کۆمپەرادۆرانە» خوای تۆ ئەیزانێ ئێستاش نازانم ترێستات و کۆمپەرادۆر بەچی دەڵێن!

جاشەکانی ڕەمەکی و عەشیرەتی بەبێ ئەوە تێ بگەن چم گوتووە بەشوێن دیوانەکەدا ئەگەڕان و بەلایانەوە شتێکی سەیر و خۆش بوو. تەنانەت هێندێک لەو هەڵبەستانەی دژی ئەوانم گوتبوو کردبوویانە گۆرانی و گەڕی ڕەشبەڵەکیان پێ دەگێڕا.

هێندێکی ڕەشخوێن و هەڵەش کە بە پەلە چاوێکیان پێدا خشاندبوو، تاقەتی

سەرنجدان و لێکۆڵینەوەیان نەببوو. گوتیان «هەژار هەردەمە لەسەر بارێکە و کەس نازانێ بڕوای بەچییە!».

بەڵام ئەو کوردانەی کە بەتێکڕایی پەسەندیان کرد و لایان وابوو ئەرکی خۆم وەک پێشمەرگەیەک بەرانبەر بەگەل و نیشتمانەکەم پێک هێناوە، زۆر لەو ڕەخنە گرانە زۆرتربوون و زۆر بە دڵگەرمی پێشوازییان لێ کرد. تەنانەت لە هێندێک مەڵبەندەکانی کوردستاندا وای برەو پەیدا کرد کە لە بازاڕی ڕەشدا نرخی تا بایی دە دیناری عێراقی هەڵچوو. زۆریش نامەی ئافەرین و پەسەندم لە هەموو لایەکەوە بۆ هات و دڵخۆشیان کردم و جێ برینی دەم پیسانیان بۆ برژاندمەوە. جا لێرەدا من لام وایە ئەوی هەقی بووبێ تووڕەبێ هەر مامۆستا جاشکەکانن، چونکە ئەوان دەیانەوێ پارەی خەیانەتی هەرە گەورەیان بەبێ دەنگی بدەن بە شەراب و گۆشت و کەس لێیان لەهەرانەدا. دەشزانن خوێندەوارانی دیوانی من لە کوردستاندا چەندن و کێن! ئەوی من لەسەری بنووسم زۆر گرانی بۆ تەواو دەبێ.

ئەو برا کوردانەی گوتیان هەژار شیوعییە و ئەوانەی فەرموویان کۆنەپەرستە و ئەودەستەی لایان وابوو لەسەر هیچ باران نیم - گەردنیان خۆش و ئازابێ - بەو مەرجەی لەبەریان گران نەیە و ئەمجارەش بڕواننە نووسراوەکانم و هەر لە ڕووپەڕی هەوەڵی پێشەکییەکەیڕا تا دوا دێڕی دوامین پەڕی بە لەسەرخۆیی و سەرنجدانەوە سەرلەبەر بخوێننەوە. ئەوسا بۆیان ڕوون دەبێتەوە کە من کوردم و بەس. کوردستان لای من لە سەرووی هەموو شتێکەوەیە و ڕووگەی هەرە پیرۆزمە و هەرگیز ڕووم لەم ڕووگەیەم وەرنەگێڕاوە و لە پەرستنی پاشگەز نەبووم و ناشبم:

عاشقی کوردستانم، گێلمە گێلمەی نازانم

نەفارسم و نەعەرەو، تێ ناگەم ئیمشی و برەو

ئەگەر بە ستالینم هەڵدەگوت، لام وابوو کوردستان ئازاد دەکا. ئەگەر بەگژ هێندێک شیوعی عێراقی و سووریدا دەچووم پێم وابوو زیانیان بۆ کورد و کوردستان هەیە. هەرکەس دۆستی کوردستان بێ و بۆ کورد بەهرەی هەبێ، من کۆیلەی ئاڵقە لەگوێی دەبم و پێی هەڵدەڵێم و لەبەری دەپاڕێمەوە و هەر کەس و هەر گەلێک دژی ئازادی کوردبێ و کوردستان داگیر بکات یان یاریدەی داگیرکەرانی کوردستان بدا، ئەگەر هەزار جار سوور و زەرد و بۆربێ و هەزار کۆمپەرادۆر و مۆمپەرادۆر بێ بەپێی توانا بەگژیدا دەچم و لەسەر

تەناف هەڵی دەخەم و ئەگەر دەستم بیگاتێ دوودانە شەقی تەڕیشی ڕێ دەخەم. هەرکەسیش لەسەر ئەو بیروباوەڕەم لێم تووڕە دەبێ و جوێنم پێ ئەدا کەیفی خۆیەتی. بەڵام دەبێ ئەوەندە بزانن کە لەسەر کورد و کوردستان جوێنیشم پێ بدرێ و خوێنیشم بڕژێ هەر بە خەڵاتی دەزانم، وەک لە گۆرانیدا دەڵێن:

دەگەڵ تۆمە چاوی چاوم
لەسەر تۆ زۆریان لێ داوم
وەمزانی خەڵات کراوم

خوێندەواری بەڕێز:

وەک زانیت لە چاپی هەوەڵی ئەم دیوانەدا زۆربەی ئەو شیعرانەم چاپ کرد کە لەنێوان ٩٤٨ و ٩٦٦دا نووسیبوومن. وا لە چاپی دووهەمدا ئەوانەشم خستە سەر، کە لە نێوان ٦٦و ٦٩شدا نووسیومن و هەروەها هێندێک لە کۆنە شیعرەکانیشم کە نەمدەویست ون بن لەم چاپی دووهەمەدا جێم بۆ کردوونەوە. بەهومێدم لە دەرفەتێکی تریشا ئەوانەی کە لەمە بەولاوە دەیان نووسم پێشکەشتی بکەم. بابزانین مەرگ ماوەمان پێ ئەدا یان هەر لە ئێستاوە لێک دیدار ئاخرەت دەبین! خوا ئەیزانێ!

هەژار
٢٩/ ١٢/ ١٩٦٩
بێ خۆڵان – چۆمان – باڵەکایەتی

* * *

## پێشەکییەک بۆ چاپی یەکەم

خوێندەواری زیرەک، لام وایە بیستووتە کە لە «قەیسی عامیری»یان پرسیوە: تۆ پێت وایە گەورەییی موسوڵمانان ئەبێ بۆ ئیمام عەلی بێ یان بدرێ بە معاویە؟ گوتی ئەگەر راستتان دەوێ بەشی لەیلای منە و کەسی تر مافی بەسەریەوە نییە! واتا ئەویندارى راست جگە لە دلبەر و گراوی خۆی کەسی لەبیر نامێنێ و هەزار گۆرانی و ئاهەنگی جۆر بە جۆری وەپێش کەون ئەو هەر بە یارەکەی خۆی هەڵدەڵێ.

من دڵداری کوردستانم و لەوەتا بیر ئەکەمەوە بە تین و تاوی ئەو ئەوینەوە ئەسووتێم. باوکم مەلا بوو، فێری کردبووم، ئەگەر نیازێکم هەبێ لەخوا بپارێمەوە بۆم پێک دێنێ. زۆر جاران زۆر بە هەژاری دەستم بەرەو عاسمان بەرز ئەکردەوە و ئەمگوت "خوایە پاتشایەکی چکۆلووکانەی جوانکیلەی کوردم بدەیە. زۆرم خۆش دەوێ!" ئەبێ چەند مناڵ بووبم کە پێم وابووە پاتشای کوردیش وەک لەیستۆک مناڵ ژیر ئەکاتەوە!

ئەم خۆشەویستییەت لە دڵی پڕ پەژارەما
تێکەڵ بەشیر مژیم و لەدووی گیان ئەچێتە دەر

ئەم دڵدارییەم کە وا بە کاڵ و کرچی هاتە روو. پێ بەپێ هەنگاو بە هەنگاو لە گەڵما گەورە بووە و تا پتر چاوم کراوەتەوە و دڵم بەهێزتر لێی داوە. بەو پێیەش ئەوینی نیشتمان و ئاواتی ئازادیم پتەوتر بە تەوژم و پان و پۆڕ و بەهێز و گوڕتر بووە. ئێستاش کەوا پیر بووم زۆرتر بەو گڕی ئەوینەوە ئەسووتێم و کە ئەڵێن «پیرەدار باشتر گڕ ئەگرێ» ، لەمن رووی داوە.

هەموو ئاواتم لە دنیادا ئەمەیە " گەلی کوردیش وەک هەموو گەلانی خوداپێداوی سەرزەوی لە ژێر چنگی داگیرکەران و چەوسێنەران رزگاربێ و کوردستانێکی ئازاد و سەربەخۆ پێک بێت، ئاڵای کوردستانی ئازاد و بەهێز لەسەر هەموو مەڵبەندەکانی کوردستان بلەرێتەوە، تا بستێک لە خاکی کوردستان لەژێر دەستی بێگانەدا مابێ و تا کوردێکی هەژار بەرهەمی رەنجی شان و نرخی خوەدانی ناوچەوانی بچێتە ناو گیرفانی داگیرکەرانی بێگانە و چەوسێنەر و دەستبڕانی ناوخۆ، من بە ئاوات نەگەیشتووم!"

زۆر کەس زۆر جار گاڵتەم پێ ئەکەن و ئەڵێن "ئەوەی تۆ لە دووی وێڵی زۆر دوورەدەست و حەستەمە و هەرگیز دەست نادا!" بەڵێ رەنگە زۆر چەتوون و گران بێت و لەوانەیە بمرم و نەیبینم، بەڵام نابێ دڵداری راست لەرێگەی نیازا بیر لەتاریکیی شەو و

کەند و کڵۆی ڕێگە و دەست لێوەشاندنی جنۆکە و دێوەزمە بکاتەوە. هەر هێندەی لەسەرە هەتا ماوە بەپێی توانا بۆی ماندووبێ و لێی ماندوو نەبێ، ئەوسا ئەگەر لە ڕێگەشا بمرێ هەر بەختەوەرە.

دەڵێن سلێمان پێغەمبەر مێرووڵەیێکی دیت، زۆر بەلەز و هەڵپە خەریکە گڵ لە دامێنی چیایەکی بەرزەوە ئەگوێزێتەوە، لێی پرسی: چیتە وا شەکەتی؟ گوتی: دڵم لەسەر مێرووڵەیێکە و پەڵپی لێ بەستووم هەتا ئەو کێوەی بۆ نەگوێزمەوە مێردم پێ ناکا. سلێمان گوتی: هەی هەژاری چارە ڕەش! خۆ ئەگەر سەد هەزارساڵیشت تەمەن مابێ. هێشتا هەزار یەکی ئەم کەژەت پێ لەبەین ناچێ. مێروو گوتی: قوربان لە ئاینی دڵداراندا لێک دانەوە دروست نییە!

هەر کە چاوم کراوەتەوە و بە دەوری خۆما ڕوانیومە دیتوومە"کوردستانی دڵبەرم لەنێوان تورک و ئێرانی و عارەبا دابەش کراوە و ئەو سێ گەلە موسوڵمانە، هاو ئاینانە، زۆر نامەدرانە و بێ بەزەیی دەمیان تێ ناوە و خوێنی گەلی کورد ئەمژن. تێش گەیشتووم ئەگەر هێزی ئیستیعمارگەرانی زل پشتی نەگرتنایە نەیانئەتوانی بمانخەنە ئەو قەفەزە پۆلاینەوە و تا ئێستا تیا نەدەماینەوە.

ئەڵێن دوژمنی دوژمنت دۆستی تۆیە، منیش بەو پێیە و بەبیری خۆم تەنیا پەنا و پەسیوێکی بۆ کوردی بێچارە ئەمایەوە هەر سوپاگەی ڕۆژهەڵات و بەرەی ئیشتراکی بوون کە دوژمنی سەرسەختی ئیستیعمار و دژی چەوسانەوەی گەلانن و خۆیان بە دۆست و یاری بەشخوراوان و لێقەوماوان دەزانن. هەر چەندی لە دەستم هاتووە بۆم نووسیون و تا دەنگم بڕی کردوە هاوارم لێ کردوون و هانام بردوونە بەر.

کە گەلی کوردیش وەک خەڵکی کووبا و جەزاییر و میسر و کوێ و کوێ لێقەوماون و بگرە هەزار پلە کڵۆڵ و چارە ڕەشترن، ئاوڕێکیان لێ بدەنەوە. کە تا ئێستاش هەر بەهومێدی ئەو ئاوڕدانەوە مل کەچی ئاوڕ دانەوەم! جا ئەگەر جارێکیش لە ڕۆژگارێکا هەستم کردووە کە هێندێک لەوانە خۆیان بە پێشکەوتوو ئەزانن! ڕەفتاری دواکەوتووانەیان ڕەچاو کردووە و لێیان خۆش نەهاتووە باسی کورد و کوردستان بکرێ. یاخۆ ئەگەر منی هەژاری دەربەدەری خاکەسەر بەهەزار ناری عەلی خۆم ساز کردوە و بەر و بوخچەم بەرەو مۆسکۆ تێک ناوە، تا دادی گەلی هەژارم بەرمە بەر پەسارەی خانەدانی گەورە. هێندێک لە برادەرانی کورد و عارەبی ئازادیخواز! لێم بوون بە چقڵی مەم و زینان

و نەیانهێشتووە دەنگی هاوارم بگاتە دادگای هەژاران. ناچار بووم لەسەر بیروبڕوای خۆم و لەسەر کوردستانی دڵبەرم وەدەنگ بێم و ڕەخنەیان لێ بگرم. تا کەریم قاسم بۆ کورد باش بووە خۆشم ویستووە و ئەگەر لە پاشدا هەڵی تۆزاندووە و لە بەڵێنی پێشووی پاشگەز بۆتەوە. منیش هەر بەو گەز و ڕبەیەم بۆ پێواوە. ئەگەر لە جەنگەی شۆڕشی پیرۆزی کورددا زانیومە خرۆشۆف چەکی بۆ قاسم ناردووە، لۆمە و سەر کۆنەم کردووە و پێم وابووە نابێ بە چەکی کرێکار و وەرزێران کرێکار و جووتیاری کوردی هەژاری هێمن و بێکەس بکوژرێ. کورت و کرمانجییەکەی ئەمەیە "کۆیلەی کوردستانم و نۆکەری باینجان نیم". هەر کەس بۆ کوردستان باش بێت سوپاسی ئەکەم و هەر کەسیش زیانی بۆ گەل و نیشتمانم هەبێ بەگژیا ئەچم. جابا کوڕی حەزرەتی پەلەپیتکەش بێت.

لەماوەی ئەو بیست ساڵەدا کە ناوئاخنی ئەم دیوانەی تیا نووسراوە. زۆر شتی پێچەوانە و دژی یەکترمان دیوە. دیارە نووسەریش یەکێکە لە گەلەکەی خۆی و بیەوێ و نەیەوێ ناچارە بەسەر هاتی گەلی خۆی تۆمار ئەکا. جا من ڕەنگە لەو ماوەیەدا جاروبارە تۆزێک تامی زارم گۆڕابێ. بەڵام ئەگەر بەوردی سەرنج بدرێ دەرئەکەوێ کە نیازی دڵم هەرگیز نەگۆڕاوە و هەروەک هەمیشە پەپوولەیەکم بەدەورەی گڕی ئەوینی کوردستانی جوانەوە و تا نەبمە چنگە خۆڵەمێشێک بە دەم باوە دەست لە باڵەفڕە و پەلەقاژە هەڵناگرم. وەک«مەحوی» فەرموویە:

لەسەرخۆ چوونە، شەیدا بوونە، قوڕ پێوانە، سووتانە
هەتا مردن مەحەببەت ئێشی زۆرە، ڕێزی لێ دەگرم

بیخوێنەوە و بەچاوێکی بێ لایەنەوە سەرنجی بدە. بەشکە شتی وای تێدا هەبێ بەر دڵت بکەوێ. خۆ ئەگەر هەمووشیانت پێ چرووک بوو. بیر لەوە بکەوە کە زۆر وشەی کوردیم خستۆتە سەر کاغەز. ئەمەش وابزانم هەر باشە.

هەژار ١٩٦٦/٦/٥

***

# بەشی یەکەم

لەپاش تێکچوونی کۆماری کوردستان، منیش دەربەدەر بووم بە شارانەوە. تاسابووم و وەکو کەو لە فڕە چووبووم. نان پەیداکردن بۆ من زۆر دژوار بوو، ئەبوایە شەو و ڕۆژ بچەوسێمەوە لە ڕێی بژیوێکی نەمر و نەژیدا سەرباری دەربەدەری و هەژاریشم دووچاری لەش بەبارییەکی زۆر گران و حەستەم بووم. جا لەبەر هەڵوەدایی بەشوێن نان و لان و دەرمانا، زۆر کەم پەرژاومەتە سەر نووسین و بیرکردنەوە. ئەوانەش کە نووسیومن یان لە نەخۆشخانە. یان کاتی وابووە کە دەستم لە هیچ ئیش و کارێک بەند نەبووە. ناوئاخنی ئەم دیوانە بەشێکی زۆر لەو شیعرانەن کە لە نێوان ساڵانی ١٩٤٨ و ١٩٦٦دا نووسیومە. بەهومێدم لە هەلێکی تریشا ئەوانەی ماون و چاپ نەکراون، ئەگەر تەمەن مەودا بدا، ئەوەی لەمەولاوە بتوانم بینووسم چاپ بکرێ و لە ناونەچێ.

***

بەغدا ٩/ ٧/ ١٩٤٨- ئەم شیعرانەم لە پشتی وێنەیەکی یادگاری نوسیووە:

## هەر کوردم

بە دەربەدەری یان لە ماڵی خۆم
لە خاکی عەرەب، لە ئێران و ڕۆم
کۆک و پۆشتەبم، ڕووت و ڕەجاڵ بم
کۆشکم دەقات بێ، وێرانە ماڵ بم
ئازا و ڕزگار بم شادان و خەندان
یان زنجیر لە مل لە سووچی زیندان
ساغ بم جحێڵ بم بگرم گوێ سوانان
یان زار و نزار لە نەخۆشخانان
دانیشم لەسەر تەختی خونکاری
یان لە کۆڵانان بکەم هەژاری
کوردم و لە ڕێی کورد و کوردستان
سەر لە پێناوم گیان لەسەر دەستان

بەکوردی دەژیم بە کوردی دەمرم
بەکوردی دەیدەم وەرامی قەبرم
بەکوردی دیسان زیندوو دەبمەوە
لەو دنیاش بۆ کورد تێ هەڵدەچمەوە

***

بەغدا، ١٥/ ١٠/ ١٩٤٨- تووشی نەخۆشی سیل ببووم و لە مردن بووم، ئەمانەم بۆ کێلی قەبرەکەم نووسیوە:

## نامرادێک

لاوەکان گەورە کچان نازاران
دڵبەران، دڵتەڕەکان، دڵداران
دەمەڕۆن تاوێ بمێنن لێرە
فاتحاییێکی بخوێنن خێرە
لەنێو ئەم گۆڕە هەژار نێژراوە
زۆر لە ڕێی ئێوە جەفای کێشاوە
ژینی خۆی کردە فیدای خۆشیی کورد
لە ڕێی ئازادی بە ناکامی مرد
توخوادا کاتێ کە ئازادیو سەند
ڕەگەزی خوێن مژەکانو هەڵقەند
کیژ و کوڕ هەرچی بە لاما لادا
پێم بڵێ و پایێ بە قەبرم دادا
ئەی هەژار بەسیەتی مردن هەستە
موژدە بێ مەوتەنەکەت سەربەستە

***

بەغدا،٥/ ١١/ ١٩٤٨: لە بەغدا نەخۆشی سیل زۆری بۆ هێنابووم، دوکتۆریش مزگێنی مردنیان پێ دابووم منیش ئەمانەم وەک ئاواتێک نوسیوە:

## خۆشیی دوارۆژ

دێتــــەوە وەخــــتی هەرا کـــاتی خــــەبات
دێتــــەوە باوی مـــحــــەمـــەد ســـەڵەوات
زوو بەزوو پێک دێ هەمـــوو دڵخــوامـــان
لـە بـڵـنـدان دەشـــــــەکێ ئـاڵامـــــــان
دێتــــەوە باوی ئەوەی دەســــتــــەی کـــوڕ
بـێـنـەڕیـز نـێــــــــــزە بـەدەست و دڵ پـڕ
ســــــــــاز دەبـێ لـەشـکـری بێ ئـەنـدازە
بە هـەمـــــوو جـــــۆرە چەکــــێکی تازە
لەشکری کـــوردی بە ئازا مـــەشـــهـــوور
دەرسی جەنگ فـێـربێ لەکن ئۆردووی سوور
بێ بەزە هەڵ دەکـــەنە ئیـــســـتیـــعـــمـــار
دادەپاچن ســــەری خـــوێنمـــژ وەک مـــار
پاک لـە ڕێی ئەم وەتەن و ئەم خـــــاکـــــە
تا لە پێـــــشـــــدای بکوژن پێی چاکـــــە
کـیـژە کـورد دوورنیـیـە یەکـتـر بان کـەن
زامی ئەندامی کـــوڕان دەرمـــان کـــەن

***

نامـــێـنێ ڕۆژو شــــەو، ئاغـــاو تاجی
ڕاوبکەن، بچنەوە کــــۆشکی عــــاجی
کــاتێ دێ ڕەعــیــەتی دەس قــەڵشــاوی

لەسەرووی ئاغا بنووسرێ ناوی
ڕۆژێ دێ ڕەنجبەری بێ نان و ماڵ
سەری حاجیان بکا زیندە بە چاڵ
ها کە دیت سۆفی و دەروێش جووتن
تێ دەگەن بۆچی نەدارو ڕووتن
ڕیشی مام شێخی لە بندا دەبڕن
ئابڕووی دەڕژن و ورگی دەدڕن
هەربینا دیت کە مەلای خایینی گەل
ڕۆژی ئیقباڵی سەرەو ژێرە لەکەل
بەپەت و داری هەڵاوەسراوە
سەد هەزار چەپڵە لەدووی لێ دراوە
نیشتمان پاشی فڕێ دانی بژار
پاشی پەی کردنی دەستی زۆردار
وەکو ئێستا هەیە وا نامێنێ
گەلی مەرد ئەو دەمە خۆ دەنوێنێ
کیژ و کوڕ پیر و جوان پیاو و ژن
کاری زۆریان هەیە راناوەستن
هەر کە ئاغا بەشەقان چووە بەر دێ
ملی گاجووتێ لە نیری دەردێ
هەر تەراکتۆرە کەوا بانگ دێڵێ:
هەر کەسەی با بەشی خۆم پێ بکێڵێ
دا دەچێنن بە گەنم دەشت و کێو
دێتە ڕوو هەرچی هەیە زێڕ و زێو

هەر وەکــو دەچتــە جــێگەی بەگ ڕەنجــبــەر
هەروەها لۆری دەچێـــتـــە جـــێی کـــەر
لادەچێ غـــــــــــارەرەشی دێــهـــاتـی
دێتــە جێ کــۆشکی ســپی و دوو قــاتی
بەرقـــــە دەبروسکێ لەناو هەر دێیــــەک
ڕۆژ دەبێ نـیـــــوە شــــەوی هەر جێ یەک
لە هەمـــوو شــوێنێ بژیشک و دوکـــتـــۆر
داو و دەرمـــــانی لە هەر چەشن و جـــــۆر
چـــــاری دەردیان دەکـــــــرێ خـــۆڕایی
هەیە مـــەکـــتـــەب لە هەمـــوو ئاوایی
تا لە چنگ دێوی جــــەهل ڕزگـــــار بن
عــــــالم و چاپک و ڕۆڵەی کـــــار بن
دەردەخـــــەن مـــــەعـــــدەنی پۆڵای ئاسن
چــونـــکــە زانـــا دەبـــن و دەی نـــاســـن
بۆ ڕێگای ئاسن و بۆ ئوتومـــــبـــــیـــل
لەت دەکـــەن جـــەرگی هەزار وەک قـــەندیل
کـــورد زمـــانێکی وەکـــو خـــۆت و خـــۆم
تەجـــرەبەی خـــاکێ دەکـــا بۆ ئاتـــــــۆم
ڕۆژێ هەڵدەفـــــــڕێ هەزار تەیـــــــــارە
کـــــە لەبن باڵی: بژی کــــــورد، دیارە

***

لاوەکـــان خـــۆشی لە خـــۆو ســـەرپاکـــو
وەک بەهەشـــتـــێکی دەبینن خـــاکـــو

داخـەکـەم من کـە نەخـۆشـیم سـەخـتـە
کـە ئەمـەش شـوێنی کـوڕی بەدبەخـتـە
زۆر دەترسـم کـە بـڕۆم نەی بینم
پێ نەگـا حـاسـڵی هێـشـتـا شـینم
تۆ بڵـێـی هێنده ئەجـەل ڕاوەسـتێ
عـەهدو پەیمانێ لە گـەڵما بەسـتێ؟
وەتەنم هەر وەکی بۆ خـۆم دەمـەوێ
سـەردەمێ چاومی وا پێ بکەوێ
ئەو دەمـەی گـیـان بە دەسی خـۆم تەسلیم
دەکـەم و نـامـەوێ با چیـدی نەژیم
***

نەخۆشخانەی بەحنەس- لبنان ٥/١١/١٩٥٠: زۆر جار لە رادیۆکانی ئیستیعماری و کلکەکانیەوە ئەمانبیست کە گۆیا خەتەری سوور هەڕەشە لە خەڵکی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست ئەکا و ئینگلیز و ئامریکا دەیان پارێزن، لە وەرامی ئەوەدا گوتوومە:

## لە خۆتم بپارێزە

سـەگ بە ڕیوی گـوت: کـەی جـێـژنەتانە
بێم بۆ دیـدەنی و بێنم جـێـژنانە
وتی ئـەو ڕۆژەی کـە تـۆ نابینم
گـەورەتر جـێـژنە لە مـاوەی ژینم
***
مـامـە تۆ سـەری سـاکـسـۆن و مـام سـام
تـۆ لەو بـەری ئاو مـن لە ئاسـیـام
پێم ناڵێی چی تۆی گـەیاندۆتە لام؟

بە درۆ و دەلەســـە خـــۆت کـــردە بـــرام!
دەتـــەوێ بـــە زۆر دۆســـت و یـــارم بـــی
لە خـــەتەری ســـوور پارێزگـــارم بی؟
بێ بەزە و خـــوێن مـــژ، خـــاوەنی هێـــزی
خـــواهی و نـەخـــواهی هەر دەم پارێزی
ئێـــســـتـــاش تۆ ڕەنگە بەوەم بزانـی
کـــە جـــاری جـــاران لێـــمت دەڕوانی
نا، نا وەک جـــاران نەمـــاوم مـــامـــە
نەت ناسم لەبەر ڕیش و عـــەمـــامـــە
دیـــوی ئـاوەژووت لـێـــم ڕا دیـارە
کـــارت شـــکاری گـــەلی نـــزارە
ئەگـــەر تۆ مـــەردی خـــودای نەخـــواستـــە
لە ملیـــۆن قـــســـەت یەکـــێکی ڕاســـتـــە
دەتـەوێ دەرچم لـە بـەڵا و خـــەتـەر
نەفـــەســـێک بدەم منی خـــاکـــەســـەر؟
ڕزگـــارم بکە لە چنگاڵی خـــۆت
من لە مـــاڵی خـــۆم، تۆ لە مـــاڵی خـــۆت
لـە تـۆ خـــەتـەرتـر دوژمـن نـانـاسم
تـەنـیـــا لـە تـۆیـە تـرس و هـەراسم
خـــەتەری شین و ســـوورم هەر خـــۆتی
بـەڵای نـزیـک و دوورم هـەر خـــۆتـی
هـۆی چـاوی ســـوورو ڕەنگی زەردم تـۆی

مایەی هەژاری و ڕەنج و دەردم تۆی
تۆ دەس هەڵگری و دەرچی لە دیارم
بە مەرگت ئەو دەم ئازا و ڕزگارم
***

لبنان، نەخوشخانەی بەحنەس ٢٠/٩/١٩٥٠- دەوڵەتی سۆفیەتی ئالآی ئاشتیخوازیی هەڵکردبوو، لە هەموو لایەکی دنیاشەوە فەقیر و هەژار چووبوونە ژێر سێبەریەوە. ئامریکاش شەڕی بە کۆریا فرۆشتبوو.
منیش لە زمان خوای شەڕەوە ئەمەم نوسیوە:

## بانگی شەڕ لە مارسەوە

هاوار کۆمەڵی سەرمایەداران
دەستەی خوێن مژان گەلی بەدکاران
ئەی خوێن مژانی فەقیر و هەژار
داگیرکەرانی گەلانی ڕزگار
ئەی جێ هومێدی خوداوەندی جەنگ
کە ئێوەم نەبێ بێکارم، دڵ تەنگ
جارێکە و ئەم جار لە منتان کەوێ
هەرگیز وەک ئێستاو بۆ هەڵ ناکەوێ
ئەگەر دەخوازن دنیا وێران بێ
خەڵکی سەرزەوی ڕووت و بێ نان بێ؟
ئەکەر دەخوازن پڕ بێ گیرفانوو
لاشە دابنێن لە چینی خانوو
موستەشفاو مەکتەب بڕووخێن پاکی
بکرێنە دەشتی کاکی بەکاکی؟
لە شارستانی بەڵگە نەمێنێ

له ئینسانیەت نەمێنێ شوێنێ
گیانی ملیۆنان لە ژن و منداڵ
دەرچێ و بۆ ئێوه ببێته کووتاڵ
دەخوازن زۆربن: بێوه ژن، هەتیو
ئەویش شک نەبەن دەرمان و بژیو
قیمەتی خوێنی پیر و جوانان
بدەن بە شەراب لە قومارخانان
گەر دەتانەوێ خوێنتان هەرشێن بێ
نازیەتی باقی لەسەر زەمین بێ؟
دەستتو دەکلکی ئامریکا گرن
هەتا ئەو مابێ ئێوه نامرن
تا ئەو بێ.. ماوه شەڕ و خوێن رشتن
ئیستیعباد کردن ، بێچاره کوشتن
مەڵێن نازی مرد کەس نەما بۆمان
هیتلەر ناوی خۆی ناوه «ترۆمان»
«ئاچیسون» کوڕمە. «چەرچیل» برامە
بێ ئەوان ژیان بۆ من بێتامە
بۆمی هێدروژین یان بۆمبای ئاتۆم
ناومەته دەستی ترۆمان بۆ خۆم
دوژمنم ڕەنج بەر یان کرێکاره
هێزی بەکاری پرۆلیتاره
ئەگەر من نەبم هەرزانی دەبێ
ژیان، دەرمان، زانین، هەموانی دەبێ

گــــەورە دوژمنی خـــوێن و شــــەڕ و شــــۆڕ
ســۆڤــیــتــســتــانــە و هێــزی ســوپای ســۆر
بــە سنــدمــی وان پــێـــــــوەنـد کـــــــــراوم
بــانــگی ئــاشـــــــــتی بـۆتـە لـغـــــــــاوم
ســـــــتـــــــالین دەســـــــتم وەبەر نـەهێـنێ
ســــــەرزەوی دەکــــــەم بە گـــــۆمی خـــوێنێ

* * *

بەغدا ١٩٥١/٢/١٥- دوکتۆر جەعفەر محەمەد کەریم لە دەست نووری سەعید ڕای کردبوو، لە لەندەن دەژیا، منیش لە بەغدا بووم وەک نامەیەک ئەم شیعرانەم بۆ نووسیوە:

## تابووتی زۆردار

بـرای دوور وڵات غـــــــەریبی شـــــــاران
تۆش زیـاد بـووی لە نـاو هـوردووی هەژاران؟
تۆش لـە ســــــەر وەتـەن بێ وەتـەن وەک مـن
تـۆش پـەنـا بـردوو بـەمـــــــــاڵی دوژمـن
بێ پەنا، بێ کــەس، بێ خـــاڵ و بێ کـــاک
بمرین بێ کـــفن، بێ هەڵگر، بێ خــــاک
کـــــورد پەرژو بڵاو لە ناو جـــیـــــهـــــاندا
دوژمن دەگــــــەوزن لە کــــوردســـــتـــــاندا
لە ئـێـــــــمــــــە ڕووی دا وتاری عـــــامی
دز بە خـــــانـەخـــوێ دەڵـێ: حــــــەرامی
بـە نـەوتـی کـــــــــــــوردان ئـاوروپـا دەژی
بۆ خـــــۆمــــان ئـاتاج بۆ چەنـگێک ڕەژی
مـن لـە پـاتـەخـــــــــتی پاپـەتـی و بـرسـی

تۆ لە سـەمـاوات لای عـەرش و کـورسی
من لەناو یابای فـەقـیـر، بەسـتـە زمـان
تۆ لای صـاحـێـبی ڕێوی و فـێـڵـەزان
من خنکاو لە ناو گـەرمـا و غـومـارا
تـۆش چاو دەچرێنی بە چوار کـەنـارا
بۆ من معـێدی ماست بەسەر لنگ ڕووت
لای تۆ شـۆخـانی مل پڕ لە یاقـووت
لێـرە برش و ڕەش بە قـورمی تەندوور
لەوێ نازاران لێـو و پەنجـە سـوور
دەزانی لە چین ئەم گـشت یاقـووتە
ئەشکی هەتیـوی بێ بەرگ وڕووتە
خـوێنی ملیـۆنها لاوچاک و گـەنجـە
تا کـیـژێک لەوێ سـوور دەکـا پەنجـە
بە ئێسکی ملیـار شـەرقی خـاکـەسـەر
بەرز بۆتەوە بورجی «ویست مـیـسـتـەر»
لە ناڵەی هەتیـو لەخـۆدانی ژن
ئـاوازە دەدا زەنـگـوڵـەی «بـیـگ بـن»
جومجومەی هێندی و سێلانی و سیـام
بوونە بناغـەی کـۆشکی «باکنگهـام»
لێـرە ڕووت لەناو قـوڕدا دەخـەوێ
کـۆشکی سـەدقـاتی بەرز ئەبێ لەوێ
لـێـــــرە نـاڵـەیـە لـە بـەر بـێ نـانـی

لەوێ جارییە شەتی شامپانی
لێرە سوالْکەرن پڕ بە کۆلانان
لەوێ قاقایە لە قومار خانان

***

لە گشتی خۆشتر گورگی ئیستیعمار
نێوی لێ ناوین: گەلانی ڕزگار
برسی و بی پێ خەف بنوین لە ناو قوڕ
صەلْەوات بدەین لە عالەمی حوڕ
بەڵێ ئازادین برسی و نەخۆش بین
حوڕڕین خائین و وەتەن فرۆش بین
ئازادین ئەگەر هەرگیز نەخوێنین
بۆ وان بەحیزی سەر دابنوێنین
بەلام هەر کەسێ بلێ: نان، ژیان
دەلێن: تێکدەرە و سوورە و بێ ئیمان
ئازادی بژیت بێ بەرگ و برسی
مەلعونیت ئەگەر سەبەب بپرسی
حوڕڕی هەرچەندی گێژ و ئەحمەق بی
خائینی ئەگەر داخوازی حەق بی
نەخۆش کەوتن و بێ دەرمان مردن
ئازادە بەلام نەک چارە کردن
ناوی موستەشفا بێنی لەعینی
دوکتۆر داوا کەی دوژمنی دینی

***

کاکە تۆ دوور نیت لە ئامەریکاوە
کە بۆ خوێن مژین بۆتە سەرچاوە
لەجیاتی هەزار هێندێک ولامان
بنێرە بە هۆی دەریای بێ سامان
بێژن بەتیمسال حورریەت تا چەند
دەبی بە گەپجاڕ خۆت ئەکەی وەپەند
تۆ تاکەی پشتت لە ئامەریکایە؟
بۆ جارێ ئاوڕ نادەیە دوایە؟
ڕۆیوە ئەودەمەی بەخۆت بنازی
خۆڵ وەسەر ئینساف کەر بۆتە قازی
لە جێی بازە قەل، لەجیات واشنتۆن
ترۆمان دەقڕێ و ماگی و ئاچیسۆن
بویتە تیمسالی خودای شەڕ و جەنگ
دەکرێیتە گوللە بۆ تۆپ و تفەنگ
مەشعەلی دەستت دنیا سوتێنە
ئیستعمار تینووی فرمێسک و خوێنە
خڕەی ئەسلەحەی مەرگە دێتە گوێ
خاوەنت بۆ شەڕ شمشێری دەسوێ
بە بۆمبای ئاتۆم کوڕانی مام سام
بەشەر قڕ دەکەن بۆ حیفزی سەلام
ناوی ئیستعباد بوویتە ئازادی
پێی دەڵێن سەلام جەور و بێ دادی
چەند ملیۆن زەنگی لە ژیان بێ بەش

بانـگ دەکـەن تیـمـســال رووی درۆزن ڕەش
ئەی تیـمسـالەکەی رەمـزی ئیـسـتیعـمـار
داڵدەی خـــوێنمـــژی گـــەلانـی ڕزگـــار
خـــۆزگـــە دەست بڕوا بت کـــەم بە بزمـــار
پێت دابـــــەســــــتم تابـووتی زۆردار
* * *

بەغداد ١٩٥١/٧/٨:

## مەی

دەرمـانی خـەفـەت: مـەیە، مـەیە، مـەی
خـەفـەتبـار نەکـەی هەرگـیـز تەرکی کـەی
هەرچی ســـەعـــاتێک خـــەم بڕەوێنێ
هەمـــوو گـــەنجـــینەی ســـەر زەوی دێنێ
گـەر لە حـەوت عـاسـمـان نیـتـە ئەسـتێـرە
خـــۆت بە پیـــاوەتیی ئارەق بســـپـــێـــرە
مـــــەی ئەسلەحـــــەیە لـەشکرە، پەرچەم
شــــــۆڕشـــــە دژی دیکـتـــــاتۆری غـــــەم
خـەم مـوحـتـەکـیـرە دەمـژێ خـوێنی دڵ
بە مـســتی مـەسـتی حـەل دەبێ مـوشکوڵ
لەزیندانی خـــەم یەخـــســـیـــرم زەلیـل
شــۆڕشی ســووری مـــەیی ناب دەخـــیـل
لەدنیـای مـەسـتی ئیـشـتـراکـیـیـە
فـــــەرقی هەژار و پادشـــــا نیـــــیـــــە

دنیـــــا تـازەیـە لەبـەر چـاوی مــــــەست
هێــشــتـــا تێی نەچوە پایە بەرز و پەست
مـەسـتی چەند خـۆشی، خەم بـار دەکـا لێت
کێ مــەســتی ناکــا با پێی بڵــێن شــێت

***

بەغداد ١٩٥١/٧/٨:

## مەی

هێنده ناهێنێ دنیــــا خــــەم بخــــۆی
ئـامــــــــانـەت هـاتـووی دەبـێ زوو بـڕۆی
خــــۆ بەتـایـبــــەتـی ڕۆژانـی پیـــــری
باشــە خــوو بگری بە گــۆشــەگــیــری
بـەبـێ خـــــــەم بـژی بـەبـێ خـــــــەم بمره
گــۆشـــەی تـاریـکی مـــەیخـــانه بگره
بەمــەســتی بمره بەمــەســتی هەســتــە
تا ڕۆژی مـەحـشـەر یەک مـەسـتی بەسـتـە
ســۆفی بەســیــەتی راســتی مــەپۆشــە
وەره لـەگـــــەڵ مـن پـێکـێـک بـنۆشـــــە
ئـێـــــــره بـۆ ئەولا وەکـــــــو مـــــــەزرایـە
کـــــڵـــــــۆشی ریشت چی لێ دەرنـایـە
کێ لـێـــــره مــــۆنە لە وێش هەرمـــــۆنە
لـێـــره ڕووخــــۆش بێ ئەوێش ئی خـــۆنە

***

بەغدا، ١/ ٥/ ١٩٥٢- ئامریکا و ١٥ دەوڵەت هێرشیان بردە سەر کۆریا، لەشکریان تا سەر چەمی «یالو» لەسنوری چین چوو. لەشکری سووری چین لە وێوە ڕاوی نان، لە یەکەمی ئەیاری ئەو ساڵەدا بەو هۆیەوە نوسیوومە:

## سەرما و بەهار

باشم لەبیـــــرە هەواخــــۆشــــیـی پار
نەرم و ســــووکـــیی با، بارگـــرانیی دار
خـێـــر و خـۆشــیی زۆر دەغڵ و دانی باش
دانەوێڵــەی چاک نیــسک و نۆک و مــاش
دەشت و دەر هەمـــووی بە مــیـــوە ڕەنگاو
بـژیـوی و ئـێــــــروو هەنگاو بە هەنگاو
دنیــــا هەر وەکـــو کـــۆریای پێــــرار
ژین و خـــۆشی بوو لە لادێ و لە شـــار
ئیـستـیعـمارەکەی سەرما و سەغڵەتی
لەویجــــدان بێ بەش لە شــــەرەف پەتی
وێنـەی ئـامــــــریکا پەلامـــــاری برد
لە گـــوێن کـــۆریا ژێر و ژووری کـــرد
مـیکرۆبی شـەخـتـەی لە مـەزرایە چاند
بۆمـــبـــای کـــڵــوانی بە ســـەردا ڕژاند
دوو عــەبدی سـەرمــان گـرانەتا و سـیل
وەک بۆ خودای شەڕ «شۆمان» و «چەرچیل»
منالّیــان ئەکــوشت بەند و بەســتــەڵەک
ڕیشــەیان کــرۆست کــەروێشک و دەڵەک
بولبـــول چۆڵی کـــرد بۆ کـــوندە بوومـــان
قـــەلەڕەش دەقـــڕی ببـــوە «تروومـــان»

داوای مــــــردن و بێ نـانـیـی دەکـــــــرد
ئـارەزووی چـۆڵـی و وێـرانـیـی دەکـــــــرد
بـۆ چـاوەی ئـاگـــــــر بـڕیا دار لـە دەشت
جـــەهەنـدەم نـریا لە جــــێگـەی بەهەشت
ســەرمـا بە زوڵم و دزی و کـوشــتــار هات
تـاچەمـی «یـاڵـۆ»ی دەمــــــەو بـەهار هات
***
بای شــــەمــــاڵـەکــــەی ئاواتی ڕەنج بەر
بەزەیی بزووت خـــۆی کـــردە لەمـــپــــەر
وەک هێـــــزی ســـــوپای چینـی ئازا و زۆر
ســەرمـــای ڕەپێنا کـــردی «مــاک ئارتۆر»
ســــەنگەری ڕنـووی ڕمــــاند بەســــەردا
ژەهری کــــردە دەم ســــەرمــــای نامـــەردا
کـــــوژرا کــــانـوون و شــــوبات و ئازەر
بوو بە ئۆف نەنە و مــــامــــێـــر و مـــازەر
چەکی ســـەرمـا و ســـۆڵ گـــێـــژ و کـــڕێوە
خـــۆی نەگــــرت لەبەر  بای خــاکـــەلێـــوە
***
ئەمـــــڕۆش لە جـــــێــــژنی یەکی ئەیارا
شـــەڕ گـــەرمـــە لەناو ســـەرمـــا و بەهارا
وشکە ســــەرمــــای کـــۆن ڕزیوی بن شـــڕ
بەهاری تـازە و بـەهـێـــــــز و لـە گـــــــوڕ
دیارە تا کـــەنگێ ســـــەرمـــا دەمـــێنێ
دیـارە چـۆن بـەهـار گـــــــــوڵ دەڕوێـنـێ

دنیا دەبێتە خۆشی و هەرزانی
ئیستیعمار کە چوو دێت کامەرانی

***

یەکەمی ئەیار جێژنی کرێکار
ڕۆژی لەرزینی دەزگای ئیستیعمار
کۆنەپەرستان کە پێت کافرن
بۆ پارێزگاریت لاوان حازرن
دڵت نەمێنێ بڵێی بێ پەنام
ئاورێک بدەوە لە چین، لە ڤێتنام
لە کۆریای ئازا و بۆرما و مەلایۆ
وا خوێن بەخشینە بۆ ژیانی تۆ
قەڵای کرێکار بەرز و پتەوە
پەنای ئاشتی و خۆشیان مەسکەوە

***

یەکەمی ئەیار هومێدم وایە
تا ئەیاری تر بمرێ سەرمایە
تروومان بچێ بە دەردی هیتلەر
دەرچن لە قامووس «ماگی» و «ڕۆکیفلەر»
ڕیشەکەن بکرێ داری ئیستیعمار
شەرەف و نامووس نەدرێ بە دۆلار
دنیایەک دابێ پڕ خۆشی و شادی
دەستەڵاتدار بێ هێزی ئازادی

گەلان ئاسنیان بکەن بە گاسن
برا بن هەموو یەکتر بناسن

***

بەهۆی شەڕی کۆریاوە ساڵی ٥٢ لە بەغدا نووسیومە:

## سەلام ئازاد بوون

نەسیم گەر دەچیە ڕۆژهەڵاتی دوور
سەلامم بکە لە کۆریای سوور
ببینە لاشەی ژن و مناڵان
لە مەزرای دێراو بە خوێنی پاڵان
سەلام لە دێهات لە شاری وێران
کە هێلانە بوون بۆ بێچوە شێران
گوێ گرە لە ناڵەی بێ دایک و بابان
ژنی بێ خاوەن پیاوی بێ کابان
بسڕە فرمێسکی برسی و فەقیران
سەرێ بکێشە مەکۆی ئەسیران
کەوا گیان دەدەن بە نووکی نێزان
خێزانیان بێ ماڵ، ماڵیان بێ خێزان

***

سەلام لە لاوی شیمالی دلێر
هەڵپە و نەعرەتەی وەکوو بەور و شێر
سەبا زانیوتە ناوی ئەو لاوە
تا دنیا و مێژوو مابێ هەرماوە؟
کاوە بە کوتکێ کردی «کودەتا»

سەرە مارەکەی «زەهاکی» کوتا
لاوی کۆریاش بە کوتک و داسێ
زۆر جوانی زانی لە خوێنمژ ڕاسێ
ئەم لاوە پشتی زۆر کەری شکاند
قەڵای هەیبەتی ئامریکای ڕماند
ئەم لاوە بەخوێن نامەی ئازادی
نووسی و هەڵی کەند ڕیشەی بێدادی
هەنجنی سەری ماری ئیستیعمار
کوشتی هەرچی دای شەرەف بە دۆلار
ڕووگەی ئیرتیجاع ئامریکای قەوی
لە ڕاست ئەم لاوە چۆکی دا زەوی
خوێنە سەوزەکەی ئەنگلۆ ساکسۆن
ڕژتی بە گاڵۆن بە تۆن بە کامیۆن
ئاوری ئازادی دایە بەر مەنجەڵ
بۆ مافپارێزی کردی بە دووکەڵ
شازدە دەوڵەتی لە ناودا کولاند
ملیۆن سەروپێی بە نێزە کراند
لەناو ئەو دیزە نەسیم بڕوانە
زۆرتر، بە تام تر، سەری تورکانە
کەسێک شەرەفی بە دۆلار فرۆشت
ئاخری لە داخان دەستی خۆی کرۆشت

***

سـلام كـۆريا، سـەلام بەيان ڕوون*
سـەلام ئازادی، سـەلام ئازادبوون
ئەی لاوی كـۆری بەرەو پێش ببزوو
پیاو چاكی دنیا دەگـەڵ تۆن هەمـوو
سـەلام ئەی هێزی سـەلامی چینی
سـەلام ئەی لاوی سوپای ڤێتمینی
سـەلام ئەی مـۆسكۆ قـەڵای ئازادی
پەنای هەژاران سـەرچاوەی شـادی

***

بەغدا ١٥/ ٦/ ١٩٥٣- ئەم شیعرانە لە ژمارەیەكی كۆواری «ڕزگاری»ی پارتیدا چاپ كراوە:

## كورد بێكەس نییە

ڕۆژی خـۆشیت هاتە ئاسـۆ ئەی گـەلی خـەمـباری كـورد
ڕۆژهەڵات ڕۆشن دەكـا شـەوگـاری تاڵ و تاری كـورد
كـۆتری پیكاسـۆ كـە مـوژدەی هێـمنی هێنا گـوتی:
مرد بەسەر چوو ڕۆژی ئیستیعباد و ئیستیسماری كورد
كـەوتە لەرزە تەنبـەڵی خـایین بەگـەل، مـێشك و دڵی
توندە ڕیشـەی داكـوتا هێـزی پرۆلیـتـاری كـورد
هێـزی ئیسـتیعمـار كـە هێندێک مـفـتـەخـۆری زگـزلن
چەرمی ملیـان خـۆش دەكـا زۆر زوو تەناف و داری كـورد
زوو دەبێ ئاسنگەر و جـوتیـر بە كـوتک و داسـەوە
هەڵبـڕن بوكتن بە جـووت ئەسـتـۆ و سـەری بەدكـاری كـورد

* كۆریا: بەیانی ڕووناک.

نایەڵین فاشیستی وەحشی ئامریکای داخوازی جەنگ
بیدەنە بەر بۆم منداڵ و ماڵ و لادێ و شاری کورد
کێ دەڵێ کورد بێکەسە؟ گشت ئاشتیخوازانی جیهان
خێرخواهی موڵکی کوردستانن و خەمخواری کورد
هیند و چین و کۆریا بۆ کوردەواری جەنگ ئەکەن
کرملینە و هێزی چین، پشت و پەنا و داژداری کورد
لاوەکان هەرکاتێ جێژنی ڕۆژی ئازادی دەکەن
بێننەوە بیرتان هەژارێک، شاعیرێکی زاری کورد
داوەتێکی ڕەشبەڵەک بگرن لە دەوری گۆڕەکەم
یەکتری ماچ کەن بە یادم دڵبەر و دڵداری کورد

***

بوخاریست ٢٧/ ٧/ ١٩٥٣: چوومە فستیواڵی لاوانی جیهان لە ڕۆمانیا. لەوێڕا ئەم شیعرەم وەک نامەیەک بۆ خێزانم نووسیوەو بە نەشمیل ناوم بردووە.

## نەشمیل

نەشمیل کچە کورد ئەی باوەفا یار
چاوکاڵ، خوێن شیرین، نازک و نازدار
پەروەردەی ئاووهەوای کوردستان
گوڵی سەرچڵ و شەمامەی بێستان
جوانیت وێنە بوو لەناو هەوالان
خەندەت سەد دڵی دەبرد بەتالان
وا تۆ حەوت ساڵە فرمێسک ئەڕێژی
لە دوور وەتەنیم سوێری دەچێژی

کــولّمی ســوورت بوون بە گــەڵای پاییــز
ژاکـــاوی و شـــێـــواو لە دووریی ئازیز!

***

نەشــمــیـل ئەو دەردەی لە توە لە منیــشــە
داری ســـــەبووریم دەرهات لە ڕیشـــــە
منیش وەکـــو تۆ هەناســـەم ســـەردە
ژینم هەمـــیـــشـــە هەمـــرازی دەردە
دڵ خـــوێن و چاوم ئەســـرین دەڕژێنێ
دوور دەســتــیت بەندی جەرگم دەپسێنێ
نەشـمـیـل سەبەبکار بەکۆی زووخـاڵ بێ
ئیـســتـیـعـمـار وەک من وێرانەمـاڵ بێ
تۆی بێـوەژن کـرد کـوڕتی کـرد هەتیـو
منیش دەربـەدەر، بێ جـــێـگاو بژیو
بـەڵام کـــە ژیاوم، ژیاوم بە ئەمـــــەل
وا ڕۆژی ئەمـــــەل هاتەدەر لە کـــــەل
بە کـــــوردی دەڵێن "بەری تەنگانە
کـورتە" مـەســەلی کـوردانە، جـوانە
زۆری نەمـــــاوە تووش ببین شـــادی
کـــــوردیش هەڵدەکـــا ئاڵای ئازادی
هەرچی ڕژێنرا لە فـرمـێـسک و خـوێن
کـۆ ئەبێ و بەدکـار تێـیـدا دەخنکێن
نەشـــمـــیـل ئەو ڕۆژە نەمـــا تەنیـــا بین
بێ کـــەس بێ داژدار بێ جێ و پەنا بین

هومـــێـــدمـــان نەبێ بە فـــریادڕەسێ
دەنگی کـورد نەگـا بەگـوێی هیچ کـەسێ
نەمـــا تـۆ کـــوردی نـایەمـــە یـاریت
دوعـــات لێ کـــراوە نـایە ڕزگـــاریت
نەمـا "کێ ڕەنگی ڕەشــە یان ئەســمــەر
بـۆ پیـاوی ســپی ببــێــتــە نۆکـــەر"
ڕەش و ســوور و زەرد، ســپی و گـەنم ڕەنگ
وا ئێسـتا یەک دڵ، یەک زمـان، یەک دەنگ
بۆ داوای ئـاشـــتی و ســەلام دەخـــرۆشن
بـۆ بـرایـەتیـی گـــــەلان دەکـــــۆشـن
***
نەشـمـیـل بریا تۆش بوای ئێـســتـە لەلام
وەک مـن بت دیبـا کــۆمــەڵی ســەلام
لـە هـەمـــوو جــــسن و زمـــان و دینێ
هەرچی پیـــاوچاکن لەســـەر زەمـــینێ
نوێنەریـان لێــرە دەست لەدەست دەکـــەن
خــوێنرێژی و زوڵم وزۆر بەربەست دەکــەن
دەریـایـەک شــــەرەف شــــەپۆلێ دەدا
شــــەڕ هـەڵایســـێن چۆن خـــۆ لێ دەدا
نـایـەڵن کــــوڕمـــان بـکوژرێ لە شــــەڕ
پێ بکەنە بەســیـــە چاوی ســوور و تەڕ
کـە تـۆ مـەنشـووری سـەلامت مـۆر کـرد
نووکی قـەڵەمت شـەیتـانی کـۆر کـرد

بۆمبا فرۆشان، چەتە و پیاوکوژان
خاوەن سەرمایەی خوێنی گەل مژان
لەو کۆخەی ئەوان ڕووخاندیان بە بۆم
چەند هەژارێکی وەکوو خۆت و خۆم
قازییە و یەک یەک دێتە بەردەستی
هەرکەس هەقی خۆی دەنێنە مستی

***

مەڵێ کۆخی مە تەنگە و ئەوان زل
تێوە ناچێ ئەو شان و زگ و مل
گەر داد ئەستێنی بە هەق بێتە جێ
وشتر بەکونی سوژندا ئەچێ
مەڵێ دەس نادەن قەڵایان بەرزە
عاسمان ڕووشێن نایەنە لەرزە
باوەڕمان پتر بەرز و قەوییە
لە ڕاست سباتمان عاسمان نەوییە
مەڵێ بە فڕۆکە دەردەچن لە چەنگ
خۆ دەشارنەوە لە جێی ڕەش و تەنگ
هوردووی کرێکار بەهێز و نەمر
ئەوان کەروێشک بە عەرابە گر
چاومان وا فێری ڕەشی زیندانە
دەبیندرێنەوە هەرکوێ جێیانە
کە نەما تۆوی خوێنمژ و زۆردار
دنیا دەکرێتە بەهەشت و گوڵزار

کۆشکی دە قاتی ئاغا بەش دەکرێ
ئێمەش چاوێکمان خانوو پێ دەبڕێ
نەشمیل من و تۆش بێ ترس دەژین
منداڵمان دێنە گەشکە و پێ کەنین
لێیان دەگەڕێن کوردی بخوێنن
بەزمانی زگماک یەکتر بدوێنن
کە کۆمەڵێ وا کۆ ئەبێتەوە
ئاڵای کوردانیش دەشەکێتەوە

***

بەغدا ١/ ٥/ ١٩٥٤: بەهۆی جێژنی یەکەمی مانگی مایۆی ساڵی ٥٤ گوتراوە

## سوێندێکی گەورە

لە خەو ڕاپەڕن کێ کرێکارە
مەچنە کار ئەمڕۆ یەکی ئەیارە
خەبەر بنێرن بۆ نزیک و دوور
کۆوەبن، هەڵکەن ئاڵایەکی سوور
ئاسنگەرێ بێ کوتکی لە سەر شان
ڕەنجبەرێ خۆی و داسێکی دەم پان
لە دەوری ئاڵا سروودی جێژن
بەئاهەنگی بەرز تێکڕا بێژن:

***

ئەی سەرمایەدار پیسی پارە زۆر
سپی لەش، دڵڕەش، زگزلی خوێن خۆر

تەنبـــەڵ، تەوەزەل، ترســـەنۆک، خـــوێڕی
بان بانکی نووستـووی سـەر کـۆمـای زێڕی
تاکـــەی تا کــــەنگێ دەکـــوژی، دەبڕی!
ئێـــمــــە بەو پارەت دەفـــرۆشی، دەکـــڕی!
چـۆن مـن شـــــــــەو و ڕۆژ ئـارەق بـڕێـژم
قـــەت تامی چەوری و شـیـــرنی نەچێـــژم!
چۆن گـــــــەنم چێـن بم شـک نـەبەم نـانـێ
چ دینـێـک ئـەمـــــــەی بـەڕاست ئـەزانـێ!
دەسکاری من بێ کـۆشک و سـەر سـەرات
کـــەچی جێ خـــەوێ لە من ببێ قـــات!
حـــــەریری بەرتـان مـن ڕســــــتم چنیم
ئێـــوەم پۆشـــتـــە کـــرد هەر خـــۆمم چنیم!
تاکـــەی دارتاش بم بێ دەرک و کـــــورسی
جـــۆلا و جـــوتێـــر بم بێ دەرپێ و برسی؟
تاکـــەی فـــــرمـــــێـــسکی ژن و منداڵم
ئـارەقـی ڕژتـووی ڕەنجـی چەنـد ســــــاڵم
دەدەی بە ئارەق خـۆت ســەرخـۆش دەکـەی!
من نەخـۆش دەکەی خـۆت بێهـۆش دەکەی!
ئـەی زاڵـم دنـیــــــــــا بـە پـێـچ و دەورە
بلەرزە و ببـــیـــە ئەم ســـوێنده گـــەورە:

***

ســـوێندم بە یەکـــەم جـــێـــژنەکـــەی ئەیار
ســــــوێندم بەهێـــــزی چینی کــــرێکار

سوێندم بە چرچ و لۆچی ناوچاوم
دەستی قەڵشاوم، لاقی سواوم
سوێندم بەو باسکە کوتک ئەوەشێنێ
سوێندم بەو پشتەی کۆڵ ئەرفێنێ
بەگاسن، بەداس، بە شانی بە قوڕ
بە پەستەکی کۆن، بە چۆغەڵەی شڕ
سوێندم بە ڕەنگی زەردی بێ نانان
سوێندم بە نووستووی شەو لە کۆڵانان

***

بەشۆڕشگێڕی ئوکتۆبری مەزن
پاڵەوانانی هەرگیز نابەزن
پارێزگارانی ستالینگراد
گیان فیدایانی سۆڤیاتی ئازاد
سوێندم بە لاوی کۆریا بە چین
بەزەبر و زەنگی لاوانی ڤێتمین
بەو توونسیانەی لە بەندا ڕزاو
سوێندم بە زەنگی، بە ڕمبی ماوماو
بەو خوێنەی پردی بەغدای کرد ڕەنگین
بە ڕاپەڕینی کانوون و تەشرین
بەو توودەی ناوی کرد لە دنیادا
بەوانەی کوژران لە مەهابادا
سوێند بە بارزانی چۆڵ کراو، سووتاو

بەقودسی و عیززەت، خەیرۆڵڵا و خۆشناو
سوێند بە ئاشتی، بە کۆتری سەلام
بەژین و خۆشیی گشتی و بەردەوام
هیچ سات و کاتێ دەس هەڵناگرم
یان هەق دەستێنم یان بۆی دەمرم
«ماکارسی» ، «دالاس» ، «دەویت زەناویر»
بە مانگ وەڕینیان بێ سوودە، بێ خێر
تێم بەردەی هەزار «کای» و «سینگمان ڕی»
ئاواتی دوارۆژ هەر دەهێنمە دی
بۆمبای میکرۆب و هێدرۆژین، ئاتۆم
دەیخەمە ملت و دەتهاوێمە گۆم
دە هێندەی دیکەش وەک زاهیدی و شات
نووری و بەیار و مەلای پیساوات*
هاکا توانەوە بوونە بەفری پار
هەر پایەدارە هێزی کرێکار
لافاوی مێژوو بە گوڕە و تاوە
پیسی و پڕ و پووش ئەخاتە لاوە
بەزم ئەگرین لەسەر گۆڕی زۆرداران
دنیا دەبێتە جێژنی هەژاران
* * *

* پیساوا: نیاز پاکستانە.

بەغدا ٢١/ ٣/ ١٩٥٥ – بەهۆی جێژنی نەورۆزەوە بەنهێنی لە ماڵە دۆستێک بانگ کرابووم، ئەمانەم نووسیوە:

## شۆڕشی خۆ کرد

تا دوێنێ دنیا پڕ لە سەرما و سۆڵ
بەفر گرتبووی دەشت و چیا و دۆڵ
ڕەنگی گوڵ، دەنگی بولبول دڵخۆشی
پێی دا درابوو پەردەی خامۆشی
ژینی هەزاران نەمامی ئازاد
بەزۆری سەختی شەختە چوو بەرباد
حوکمی پۆلیسی چلەی ناهەموار
قەل و کوندەبووی هێنایە سەرکار
دەقڕین بۆ قڕبوون، بۆ ماڵ وێرانی
بۆ درێژبوونی ژیانی زستانی
کێ ناوی کۆتر و سورگوڵی دەبرد
بەچنگ و دندووک چاویان دەرئەکرد
بەڵام منشوورە بەفر ئەچێتەوە
ڕووی ڕەش بۆ خەڵووز ئەمێنێتەوە
وابای وادە هات سەرما تەواو بوو
گوڵزار پڕتاو بوو، قەل بێ کڵاو بوو
شۆڕشە ئەمڕۆ هەور ئەگرمێنێ
باران دەڕژێنێ، بەفر دەمرێنێ
کوند وێرانە ماڵ، قەل قڕەی بڕا
سەرما داواکەر دەهۆڵی دڕا

نیشانگەی سەرما و شەختەی دنیاگر
نەماوە غەیرەز دوو کێلی قەبر
* * *
شۆڕشە شۆڕش، کۆتر ئەگمێنێ
گیا سەر دەردێنێ، گوڵ خۆی دەنوێنێ
ئەرخەوان ئاڵای شۆڕش لەسەر شان
سوپای مێلاقە و سوێسن گرتی سان
بولبول و قومری سروود ئەخوێنن
پیردار لە خۆشیان سەر ڕادەژێنن
قاسپەی کەو لە کێو، تەقڵەی باز لە دەشت
تا کوردستان بێ لە کوێیە بەهەشت؟
سازو ئاوازی «مێروو» هەزار دەنگ
سەد هەزاران گوڵ بە هەزاران ڕەنگ
وەنەوشە مل کز نەرگز دیدە مەست
لاسایی دەکەن ژێر دەست و سەربەست
* * *
پاشای نەوبەهار لەسەر تەختی گوڵ
ئەمڕۆ ڕووی کردە بولبولی سەرچڵ
وتی "کوردستان وا ژیایەوە
زیندوو بوونەوەی کوردان مایەوە
هەروەک نەورۆزی کوردەکان هەیە
ئاخۆ نەورۆزی ئازادییان کەیە!"
* * *

بەغدا ١٩٥٥/٧/١٢- فستیوالّی لاوانی جیهان لەوارشەو دەبەسترا چەند برادەرێکی کوردیش بەرەو وارشەو ئەچوون بۆ هاوار کردنی کورد، منیش ئەو شیعرانەم پێدا ناردن کە لەوێ بیخوێننەوە:

## نامە بۆ وارشەو

کـــــــوردێکـم دەوێ چـاپـک و پـتــــــەو
ســـــەفـــــەرێک هـەیە بۆم بـکا بە شــــەو
نەهـێــــــڵـێ تـورک و عـــــەجــــــەم بـزانـن
داگـــــیــــرکــــەرانـن لە کـــــوردســـــتـــانـن
مـــــاڵ لە خـــانـەخـــــوێ حـــــەرام کـــــراوە
مــــەســــەلـی کــــوردە و لە کـــــورد ڕووی داوە

***

پێــــشـــــان بچـــێـــتــــە شـــاری مــــهـــاباد
تـڵـــــــیــــــــشـێ بـێـنـێ لـەو داری بـێ داد
ئەو داری قـــازی و ســــەیفــیــــان پـێــداکـــرد
جــــمــــــهــــــوریەتی کــــــوردیان پـێ لابرد
بـچـــــتــــە ئاگـــــری داغ نـێــــزەیەک بـێـنـێ
ژەنگی هـیـنـابـێ بە دڵـۆپی خـــــــــوێـنـێ
کــام خــوێن! خــوێنەکــەی لاوانی کــوردی
لـە ڕێـی ئـازادی مــــــــردن بە مـــــــــەردی
ئەو کـــــوردەی گــــیــــانیـــان بە ئاواتەوە
ئـێـــســـــتـــاش لەو کـــێـــوە دەنگ ئەداتەوە
ئەو دار بـەو نـێـــــــزە دادەن وەک قــــــەڵـەم
قــــەڵـەمێ هەر خـــــۆی هاوارکـــــا بە دەم
خــوێـنە خــەســـتــەکــەی کـــوڕە بارزانی

که ئیستعماریان به سەگ ئەزانی
بەئاوی چاوی کوڕ کوژراوانی
بەر دەرکی سەرا لە سولەیمانی
شل بکرێتەوەو لێک درێ تەواو
بکرێتە کەللەی مستەفا خۆشناو
لە جلکی شڕی هەتیوبارەکان
یان دەربەدەر و شارەکان
ڕیتاڵێ بێنن بەو خوێن و خامە
هەژارێکی کورد بنووسێ نامە
کۆترێکی سپی تیژ باڵ، بە سەر ڕەو
نامە بەرێتە کۆنگرەی وارشەو

***

لاوانی دنیا ، پیاوچاکانی مەرد
شەریفانی هەرد، سافانی بێ گەرد
زۆر ملیۆنن کورد لە ئاسیادا
کۆنتری گەلان لە ڕووی دنیادا
وەحشی ئیستعمار لەسەریان زاڵە
بڕیویە ڕێگەی هەناسە و ناڵە

***

زمانی زکماک مەنع کراوە
دەرکی خوێندنمان لێ داخراوە
دەرمان و دوکتۆر بۆتە ئەفسانە
لێدان و قەمچی لە جێی دەرمانە

سێڵاوی نەوتم، پەیدابووی خاکم
تووتنم، گەنمم، خەرجم، پیتاکم
دەچێتە «ستی» و «واڵ ستریتەوە»
سەدیەکی بۆمن دەگەڕێتەوە
ئەویش دەستبەندی بۆمن پێ دەکڕن
یاخۆ تیغێکە سەرمی پێ دەبڕن
یاخۆ بۆ زیندان، دەمخەنە ناوی
یان بنکەی شەڕە و مەتاری ئاوی
کێوانمان هەمووی کرایە سەنگەر
هێزی شەڕ و شۆڕ لێی دەخا لەنگەر
موساعەداتمان هەرتۆپە و تفەنگ
لاومان دەکرێنە دەستەچیلەی جەنگ
چەک فرۆشانی شەڕ هەڵایسێن
لەژێری گەلان گەلێک دەترسێن
لە نیسێی خۆیان دەسڵەمێنەوە
لە گمەی کۆتر دەڕەوێنەوە
زمان هێمنی بڵێ دەیبڕن
قورعان سەلامی تیابێ ئەیدڕن
دەستێ بنووسێ وشەی ئاسایش
توند ئەکرێ لەناو کەلەپچە و قایش
* * *
بەڵام بێ گومان خەیاڵیان خاوە
مەودا نەماوە، کاریان کراوە

لێـــــــدان و بەنـد و زینـدان، زگ دڕین
قـــــەنارە و قـــــەبرو کــــوشتن و بڕین
دەرمـــــانی دەردی ئیــــرتجـــاع ناکـــا
بـارێی هەڵاتـن بـۆ خـــــۆی پەیـاکــــــا

***

لاوانی کـــوردیش لەســـەر ئەو حـــاڵەش
لـەگـــــــەڵ ئـەم ژینـەش، ئـەو ڕۆژە تـاڵـەش
دەست درێژ دەکـــەن بۆ دەســـــتی ئێـــوە
ســوێند ئەخـۆن لەسـەر مـەبەسـتی ئێـوە
تا تەڕاییی خـــوێن لەڕەگـــیـــان دا بێ
تا شـەڕ هەڵگیـرسـێن لە دنیـا مـابێ
بەبێ مـــاندوو بوون بێ شلی و ســــــتی
تێکۆشن بەگـــیـــان لە ڕێی ســەربەســتی
نەک هەرسـەربەسـتیی خـاکی کـوردسـتـان
بەڵکو ڕزگـــاریی هەمـــوو ژێردەســــتـــان
ئێـــــوەش ئەی لاوان نـامـــــە، هـاوارێک
لەو کــوردە زۆرە باسـێک، پرســـیـــارێک
کــوردیش وەک ئێـــوە تیـــرەی ئینســـانن
شـــەرمـــە خـــەبەر و باســـیـــان نەزانن
کـــــۆمـــــەڵی بەزەی جـــانەوەر هەیە
کــــورد کــــە ئینســــانە لێی بێ بەهرەیە
نابێ ویجــــدانتـــــان بەمـــــە ڕازی بێ
گــورگ لەناو مــەڕ هەرخـۆی قـازی بێ

لە ناو گۆڤار و ڕۆژنامەکانا
لە کۆبوونەوەی ڕۆژ و شەوانا
یادێکی بکەن لەکوردی هەژار
قوولّە لە گورگی وەحشی ئیستعمار
گەر ئێوە دەستێک بدەنە دەستم
هەر هێندەی لەناو زەلکاو هەڵدەستم
کوردم بەناوبانگ ئازا و بەکارم
یەک بم خەنیمی هەزار نەیارم
دڵ دانەوێکم ئێوە بۆ بنێرن
مەرگی داگیرکەر بەخۆم بسپێرن

***

بەغدا ١٩٥٦/٣/١٨- هەواڵێکی کورد گوتی کچێکی کینیایی هەیە لە لەندەن، گۆڤارێک دەنووسێ، گوتوومە شاعیرێکی کورد شیعری بۆ ماوماو نووسیوە، جا قەرارە بۆی بنێرم و ئەویش بە تەرجەمەوە چاپی کا، منیش ئەمانەم نووسی ناردم:

## پەیام بۆ ماو ماو

ماوماو من و تۆ دوو دۆستی هاودەرد
بەخوێنی گەرم و بە هەناسەی سەرد
هەردوو گیرۆدەی دەست ئیستعمارێک
هەردوو مارانگاز بەنێشی مارێک
ئەو وەحشەی بە دەم کینیا مژە
بە جووتە و چەپۆک کوردستان کوژە
من و تۆ ماڵمان بەرەڵڵا و بێ خێو
پڕنەوت و گەنم پڕ لە زێڕ و زێو

تۆ  بە قــســەی کــاهێن مـن بە گــفــتـی پیــر
تـەوەکــەل گــیــر بـوویـن، بێن خــوداگــیــر
لەیەکـــتـــر کـــوژی و دوژمـنـی یـەک بـوون
بیــــری یـەک بـوون و دوژمـن لـەبیــــر چـوون
دێوێکی پیــاوخـــۆر، فــێـلّــبــاز و بەدکـــار
لە پێـسـتـی مـەڕدا گــورگــێکی خــوێنخـوار
شـــەیـتـــان لە پێـــســـتی مـــەلائیکاندا
لەژێر ســـێـــبـــەری پیـــر و کـــەهاندا
شـارسـتـانیـەتیی سـپـیـان بۆ هێنایـن
گــورگــان کــەوتنە کـۆز، لـبـۆزیان تێ نـاین
هاتن فـــێـــرمـــان کـــەن چۆن مـــەدەنی بێن
چۆن نـانبـــــڕاوی دەســـــتی دەنـی بێن
چزوو مـــامـــۆســـتـــای ســـپی دز دەرچوو!
زگـــــــپـــــــڕی درۆ درۆی لـەبـەر چـوو
کــاڵ و کـــوڵێــویان گــشت لێ فـــڕاندین
گـۆشـتـیـان برژاندین ئێـسکیـان کـڕاندین
دزییـــان، بردییـــان هەر شـــتێ مـــاڵ بێ
وتیـــان مـــاڵ خـــوراو بە کــۆی زوخـاڵ بێ
***
ئێـســتـاش بە قــســە هەرخــۆی هەقــدارە
دروســـــتـــــە دز بێ خــــاوەن حـــــەزارە
قـــــــەینـاکـــــــا بـدزێ هەر نـانێ هەتـە
تۆ بـڵـــــێی برســــیم پێت دەڵێ چەتە

تۆ بۆ مەزەی ئەو جگەر کەبابی
مەلێ ئاخ و ئۆف دەبیە ئیرهابی
ئەوان بە بۆمبا بمانکوژن چش
وەحشین بەمێشیان ئێمە بلێین: کش
گەر بخنکێنن کۆرپە ساواکەم
دەبێ من بچم بووردن داوا کەم
تا کوڕی بۆر و ڕەشمان خنکاوە
مامۆستای سپی دەستی ئێشاوە
گەر بستڕمەوە تفیان لەسەر ڕووم
هێشتا هەر کێویم، ئەدەب فێر نەبووم
گەر نان بڕاو و خانە بەربادین
قەیناکا، لەگەڵ دنیا ئازادین
خانەوێرانی، شەقێ لە خەم دە
دڵ خۆشن خەڵکی «داونینگ ڕەقەم دە»
گوێ مەدەرێ خۆت کە ڕووت و برسیت
خۆش ڕادەبوێرن خەڵکی «واڵ ستریت»
گەر کورد و ماوماو بەبێ ڕۆن کوێرن
خۆ «داڵس» و «ئیدن» تەسەل و تێرن

***

گەر دیموکراتی و ئازادی گەلان
ئەمەیە، خۆزگەم بە ورچی تەلان
کەنگێ قانوونی جەنگەڵ وابووە
چ جانەوەرێک ئەمەی خواردووە!

ئەگـــەر ئـازادی مـــانـای هەر شـــادی
بـۆ بـەهـێـــــــزان بـێ، تـف لـە ئـازادی

***

بـرام خـــەم مـــەخـــۆ دەوران دەورانـە
هاکـــا تێک چوو ئەم دەور و دووکـــانـە
قـــانـوونـیـــان تـفـی ســـەربەرەو ژورە
مـەرگی سـەگی هـار مـەشـهـوورە سـوورە
ئـەو خـــــوێـنـە ئـاڵـەی ئـەوان لـە تـەنمـان
ڕژانـدیـان لەســـەر خـــاکی وەتـەنمـان
لاشـــەی لاوانی لـە خـــوێـنـدا شـــتـڵ
دەدێـرێ کـــــەوا خـــــراونـە بـن گـڵ
هەربینا شین بوو، بوو بەگـــوڵی ســوور
بـــۆنـــی ئـــازادی دا نـــزیـــک و دوور
نـەمـــامی باڵای شـــەهیـــدانی لاو
گـــوردانی کـــوردان مـــەردانی مـــاومـــاو
ئەو شـــەهیـــدانی ســـەربەست و ئازاد
چ لـە نـایـرۆبـی یـان لـە مـــــهـــــاباد
بـەرز دەبـنـەوە و دەبـنـە ســــێـــــدارە
پێـــیـــان دادەکـــرێ هەرچی بەدکـــارە
ئالای ئازادییـــان لەســـەر هەڵ دەکـــرێ
شـــۆقی ئـازادی دنـیـــا دادەگـــــرێ
نـاترســـێین خـــوێنمـــژ بێنەوە ســـەرمـــان
دەبنە کـوتـک و داس، ڕمب و خـەنجـەرمـان

ئەوسا هەموومان خۆش ڕادەبوێرین
لەشوێن ئیستیعمار نەفرین دەنێرین

***

قبور البيض، «توربەسپیان» سووریا، ١٩٥٦/٧/١٠

## سروود

وەتەن سوێند بەکێواتی سەر بەرزی تۆ
وەتەن سوێند بە داهاتی سەد تەرزی تۆ
وڵات سوێند بە بەفرت بەخۆشیی هەوات
بەنەفتت بە ئاوت بەدەجلە و فورات
هەتا قەترە خوێنێکی تەڕ شک دەبەین
بەقوربانی ئازادیی تۆی دەکەین
کوڕانت لە ڕێی کوردەواریی مەزن
لە کوژرانێ سازن بەڵام نابەزن
سەر و ماڵ بەقوربان دەکەین گشتمان
لەڕێی سەربەخۆبوونی تۆ نیشتمان
عەرەب، تورک و فارس لەسەر خاکی تۆ
سێ دڕکن لەسەر سینەکەی چاکی تۆ
هەچی خوێنمژی کورد و داگیرکەرە
کفن هەڵگرن با ڕووە و مەقبەرە
ئەبێ خواردنی ئێمە دەرکەن لە دڵ
چەقۆ گەییە ئێسقان و خوێن هاتە کوڵ

دەمی خەنجەری تیژ و مووکارمان
گەلێ تینووە بۆ خوێنی بەدکارمان
سەروماڵ بەقوربان دەکەین گشتمان
لەڕێی سەربەخۆ بوونی تۆ نیشتمان
لە ڕووی دۆست ڕووخۆش و گەش هەر منم
لە ڕووی دوژمنی مەوتەنم مەردنم
گەزەنفۆن و شێردڵ دەدەن شاهیدیم
کە شێری شەڕ و کۆتری ئاشتیم
بە دۆلار ئەوی ویستی دنیا گرێ
یەقین خۆی دەتۆپێت و کورد نامرێ
هەزار سوێندی بەغدا وەکو پووشە لام
لەسەر زۆرکەران مەرگە هێزی سەلام
سەرومال بە قوربان دەکەین گشتمان
لەڕێی سەربەخۆ بوونی تۆ نیشتمان

***

سووریا ، قبور البیض، ٢١/ ٤/ ١٩٥٧- نزیکەی ٣ ساڵ لە کوردستانی داگیرکراوی سووریا پەنا نوشینی خانەدانی حاجۆ ئاغا بووم و ئەوان بەخێویان دەکردم. لەو ماوەیەدا مەم و زینم وەرگێڕا سەر موکریانی و کۆمەڵە شیعرێکم بەناوی «بەیتی سەرەمەڕ» لەچاپ دا و ئەم پەسەندی بەهارە و چەند شتێکی تریشم هەر لەوێ نووسیوە:

## من و بولبول

بولبول ئەی یارەکەی دێرین
خونچیلانەی دندووک زێڕین
هاوفەردی زووم بۆ هەژاری

هاوڕێی پێشووم لە دڵداری
وەبیرت دێ پایزی پار!
ڕەشپۆشیی دەشت و زەردیی دار
گژە و گڤەت لە با دیبوو!
هەوای پێش تەرمی شادی بوو
دەیدا خشپەی گەڵاڕێزان
خەبەری مەرگی ئازیزان
بەژن و باڵای نێرگزی مەست
لە گێرەی گزرەدا پێ پەست
سوێسنە و مێلاقەی زەرد و سوور
بوونە دەستەچیلەی تەندوور
کلوە بەفری درشت و ورد
چۆن سەرزەویی کفن دەکرد!
کوندەبوومە و قەلی ڕووڕەش
کەلەپووریان دەکردن بەش
من و تۆی برسی و بێ پەسیو
لە کونجێ خزیو بێ بژیو
دەگریاین بە بانگ و هاوار
بۆ خونچە بۆ گوڵ بۆ بەهار

***

نەم گوت هەتا سەر وا نابێ!
چاوت لە بەزەیی خوابێ

بڕوانە لەبای شەماڵی
سەرمایەی سەرمای ڕاماڵی
سەرمایەداری سەرمایە
بێ سەرمایە و بێ سەر مایە
ڕێژنە بارانی ئازاری
ئازار بوو لە زستان باری
دوو پۆلوو کەوتن لە حووتا
ڕیشی سپیی چلان سووتا
گەرمیی هەردوو گرمەی هەوران
شۆڕشێ بوو گۆڕیان دەوران
تەرزەی گرد و خوناوکەی ورد
چاوی کرێوەی سپی کرد
تەزووی پیرێژن کوژاوە
ئاویان لە جێ ماڵی ناوە
ڕۆژ کەوتە کۆشکی کاوڕی
گیسکی مسیان بۆ سەربڕی
بەدەنگی زوڵاڵی بۆقان
سەرچاوەی دڵ ناسک تۆقان
قوڕاوە سووری بەهاران
دەرمانە بۆ دەردەداران
ڕای ماڵی پووش و چیلک و چاڵ
جێژنە و دەبێ خاوێن بێ ماڵ

## زەماوەندە

نەورۆزەی زەردی زێرینە
زەردەی لە لێوان ببینە
بەناز پێ لە زەوی دەنێ
بەرەو نەورۆز پێ دەکەنێ
گەزیزە مۆژدەی هێناوە
پێش پەیکی گیابەند و خاوە
هەر بمێنێ شای بەهارێ
دوو بووکان دێنێ بەجارێ
ئەرخەوان بووکی نەورۆزە
دەشت لە نیسانێ پیرۆزە
گۆوەندە و خۆشیی دڵانە
بەزمە و ئاهەنگی گوڵانە
شایلۆغان لە ماڵی شا بێ
دەبێ چ بێ و چیی تیابێ!
سەیرێ بکە لە گوڵزاران
تیپ تیپی ناسک و نازدارن
کەسک و سوور و زەرد و عابی
قاوەیی و شین و عەننابی
نەباتی و ئاڵ و کاڵ و گەش
سپی و مۆر و بنەوش و ڕەش
ڕۆنیاسی و خاکی و پەمبەیی
بۆر و سپات و سورمەیی

ڕازاوەی ڕەنگی خواکردن
لەو سەر زەماوەندە گردن
سۆسەنبەر و مالۆچە و گوڵ
مێخەکی و لاولاو و سونبول
تیکەڵ بوون وەک کەزیی یاران
لێک هاڵان وێنەی دڵداران
کۆڕی بەیبوون و هەڵاڵە
لەکن نێرگزی چاو کاڵە
سوێسنە و بیژان و بەڕۆنە
نەشە و گەشەی هەردوو بۆنە
کەلەم کاشوور و گۆزەروان
کوا جوان بکۆخێ لەبەر وان!
لالە هەباسی شۆخ و شەنگ
تافتەی لەبەردا بە حەو ڕەنگ
سەیدی پاتۆڵ زەرد، گێڵاخە
چاو دادەگرێ لە قازیاخە
دۆریە و مەندێی بالا بەرز
شاتەڕە و جاترەی سەد تەرز
سەیدۆکەی سەر گوڵینگەدار
ئەسپەندەر نوشتەی چاوزار
ناعنە و ڕێحانە بۆن خۆشن
حەتران لەو ناوە دەفرۆشن
کالاو بن چادری هەڵداوە

ڕێواس بەناز هەڵوێستاوە
وەنەوشە و بەژنی ببینە
چەند خشپیلە و نازەنینە!
گوێی لە سێوەڕە گرتووە
ملی لەسەر خوار کردووە
چاو لەو پەپوولە نازدارە
چەند دوودڵ و هەرزەکارە!
بەشەو لەگەڵ شەمێی ژوانە
بەڕۆژ لە دەوری گوڵانە

***

گوێ بگرە لە هەوری نیسان
کەوتەوە گرم و هۆڕ دیسان
دڵ خۆشە بەخرۆش و جۆشە
زاوای دەشتی سەوزە پۆشە
گوڵاوپرژێن دەکا لەسەر
دەینەخشێنێ سینە و کەمەر
تارای بۆ نارد لە مێلاقە
بۆی چنیوە کەوای تاقە
لە گوڵەبابوونە و کەنێرە
هێرۆ و شەشپەڕ و شلێرە
شێستپەڕ گوارەی پڕ پەڕەنگە
ئەڵماس تنۆکی ئاونگە
ملوانە لە چڵی بیزایە

پــــڕ چـــــنـــــوور و بـــــەڕەزایـــــە
نیـــــشـــــانی یـار ڕۆژی مــــارە
لیـــزگـــەی هەمـــیـــشـــە بەهارە
یاقــووتی خــاشــخــاشی تێــدا
جــا خــوا ئەو بەخــتــەی بە کێ دا!

سەیرانکەر

بـۆ ســــــــەیـری بـووک لـە هـەر لاوە
گـــــیـــــاوگـــــژ ســــەری دەرێناوە
کــەنگر، کــوڕادە، کــاردوو، پنگ
پرپرە، تیـــســـــوێ، هەڵز و شنگ
تـاڵـوو، تۆڵـەکــــــە، کــــــووزەڵـە
لووشـــە و چەقـــچـــەقـــە و ڕێزەڵە
پۆلکە و ترشـــۆکـــە و ئاڵەکـــۆک
گـوێ بەرخـە و مـیـژۆرد و کـیـفـۆک
قـــــــوریـنـگـان و زەرتـکـی ڕەنـگ
تاڵیـشـکە و خـوشـیلک و غـەربەنگ
مـێکووک، ڕەکـێـشـە، ئەسـپـەناغ
ئاڵـقـــــەتیـــــز و گـــــێلم بـەرباغ
تەنـانەت کـــــارگی کـــــەمـــــایە
هـاتـە دەر بـۆ تـەمـــــــاشـــــــایە
چی ڕووگـــــرژ و بێـن ناخـــۆشــــە
خــــراونە کـــــەنار و گـــــۆشــــە
کـــەکـــرەی تاڵ بێ هەواڵ مـــاوە
ســــیـــــر لە دەرکی مـــــار ڕواوە

## سەمای دارانە

کۆڵکەزێڕینەی پاش باران
تاقە بۆ پێشوازیی یاران
هاژەی هەڵدێر خوڕەی ئاوان
لاوک بێژی بووک و زاوان
سەوڵ و سنۆبەر، بی و چنار
بە مەی بەرامەی بای بەهار
سەرخۆشن خۆ ڕادەژێنن
باوەش لەیەکتر وەردێنن
داری سێو و هەڵووژە و بێ
قەیسی و خۆخ، بادام و هەرمێ
لە ژێر سێبەری کوڵووکان
جوانتر لە سەد تازە بووکان
کفر و گەز و گوێژ و چاڵووک
گوێز و بوز، بەن و بەلاڵووک
سپیندار و گێلاس و توو
مازوو، دەمووکانە و بەڕوو
دەس گیرانە لە هەر لاوە
سەما دەکەن بە دەم باوە
بەزمی باڵدارانە
سوڕە و سێروو دەڵێن پەستە
دار کوتکە دنبەک بەدەستە
دوڕنا زوڕنای خۆی هێناوە

پەپوو دەهۆڵی جۆش داوە
زەردەزیرە دەخولێتەوە
ئەوی دەیڵێ نایڵێتەوە
پاساری لاوی گوێ سوانان
هاتە ناو ڕیزی خۆشخوانان
کوڕ کوڕ تووڕاندیە شمشاڵی
شێلاقە خۆی لێ هەڵماڵی
بەرگا و قوڵتە و گۆریەچنە
هەوێردە و چوڕەپۆپنە
قومری و پۆڕ کەوتنە دیلانێ
سوێسکە ڕەوتێک باش دەزانێ
کەندەسمە بەناز خۆی نواند
تۆبەی تاق تاق کەرەی شکاند
ڕەش بەش لە دەستی کەلکایە
قاژو ماسیگرەی لایە
دۆی سوورەقانگ زڕە کەوە
بۆرچین سەرسەوزی گرتەوە
کۆتر و کەو سەرچۆپی کێشن
شۆخ هەمیشە هەر لە پێشن
شاهۆی سۆفیلکەی ناو ئاوان
لەو سەریەوە بۆتە گاوان
کاسەڵەشینکە و سریلە
دەڕوانن لە سووچ و سیلە

مۆزەشینەش بە چووزەلە
گوێلکی خستۆوتە هەلوەلە
لەکلەک بەیانی و ئێواران
لێ دەدا سێ تەپڵی سواران
پەرەسلێرکە پۆل بە پۆل
ڕمبازیانە لە دێ و لە چۆل
باڕە و کاڕەی ماک و زایە
سەمای هێنایە سەمایە
قاز و قورینگی عاسمانێ
ڕیز بە ڕیز دێنە سەیرانێ
سەرسامن بۆی ڕادەمێنن
باڵ و سەر ڕادەوەشێنن
باشووی بەگ سەقر و بازی خان
چەکمەڕەق شمقاڕ و تەڕلان
هەڵۆ و شەهێن پەڕینە کێو
زۆردار ڕێی نییە بێتە نێو
دەرکران سیسارگ و خەرتل
خوێنتاڵن کەچەڵ و زگزل
خۆشی خۆشیی مێشەنگوینە
جەنگەی شیرە هەڵمژینە
هەر لە خۆی دێ دەسترەنگینی
سەیری شانە و شانشینی
لە چێژەی گوڵ و گوڵووکان

ئاخنی شەش گۆشەی دووکان
پوختەی پەلکی شین و سوورە
شین و سپیی ناو پلوورە

بەمراد گەیشتنی بولبول

جا ئەی دەنگخۆشەکەی چەلەنگ
بوێژەکەی بە ناو و دەنگ
لەناو باڵدار و گوڵاڵە
تەنیا جێگەی تۆ بەتاڵە
گوڵ ئامێزی گرتۆتەوە
خونچە خۆی ڕازاندۆتەوە
جێت لەسەر چڵ چاکراوە
بەرەی گەڵا داخراوە
داران ئامادەی گوڵباران
لێت پیرۆز دیداری یاران
واتۆ گەییتە کامی دڵت
شاد بە بەدیداری گوڵت
بچریکێنە تا دەتوانی
بخوێنە بە کامەرانی
سروودی جێژنی ئازادی
ڕزگاری لە نامرادی

جوێ بوونەوە

ماڵیاوا کۆنە هاو دەردم
با دوور بێ لە ئاهی سەردم

تۆخـــــــۆش مـن هـەر ژیـان تـاڵـم
نـاتـوانـی ببـــــــیـــــــە هەواڵـم
وا باشـــە بەجـــێم بهـــێـــڵی
هەرخـۆم وێڵ بم لە شـوێن خـێـڵی
دەردی مـن یـەکـــجـــار گـــرانە
هـەڵـوەدایـیـم بـۆ دەرمـــــــانـە
مـــەمکولـێنەوە مـــەمـــدوێـنە
ســـووتـاوم پـێم مـــەدرکـــێـنە
گـــوڵـی مـن لـە یـارت جـــوانتـــر
یـارم لە گـــوڵ خـــان و مـــانتـــر
چەند جوانە!
مـــانـگ و ڕۆژ، گــەلاوێژی گــەش
گــــڕی ئـاگـــر بـەشـــەوی ڕەش
بۆنی خـۆش، گـوڵی ڕەنگا و ڕەنگ
باریکیی شـیـعـر و خـۆشـیـی دەنگ
زەنگی سـەرشـەوێن، فـیـکەی شـوان
خـشـــپـەی وردە مــاچ لە جێ ژوان
تیـــشـکی مـــانـگ لە ئـاوی کـــانی
ســــــــروەی شـنـەبـای بـەیـانـی
لە دوور قــاسـپـەی خـاسـە کـەوێ
نـازی بـووکـی هـەوەڵ شــــــەوێ
ســپـــیــاییی ســینە شــینی خــاڵ
ســووراییی کـــوڵم و لێـــوی ئاڵ

زەردیی گـــەردن و ڕەشـــیی مـــوو
تەنگیی دەم و گـــوشـــادیی ڕوو
ســافــیی هەنیــە ڕاســتــیی کــەپۆ
چاڵـی چەن کـــــەوانـەی ئـەبـرۆ
مـەســتــیی چاو قــولاپەی برژانگ
ســایەی پەرچەم لەســەر لاجــانـگ
خـــــڕیی مــــەم، بـڵـندیی بـاڵا
گـــاڵەی تـاقـــانـە لە مـــاڵا
زەردەی زەردەپەڕ لـەســــــەر ئـاو
پـرووشـــــەی باران لـە بەر تـاو
خـــــوڕە و چاوئـەنـدازی هەڵـدێر
بـازی ئـاسـک، ئـاوازی بـلـوێـر
کـــەروێشکەی گـــەنم بەهاران
بەفـــــری هاویـن لـە پەســـــاران
دیمەنی کـــێـــو و نەخـــشی دەشت
هەر لـێـــــــرەوە هەتا بەهەشت
هەرچی خـــۆشن هەرچی جـــوانن
کـۆیلەی جـوانیی کـوردســتــانن
جێی ئازایان
کـوردســتــان جـێی گـوردی کـوردان
بێـــشـــەی شـــێـــردڕ و نەبەردان
لانـکـی زەردەشـت و مــــــوهـاباد
پایتـــەخـــتی شـــاهانی مـــاد

جێگا تاجی کەیخوسرەوی
کە بووی باجی هەموو زەوی
مەیدانی گۆدەرز و ڕۆستەم
کۆشکی دڵداری زین و مەم
ڕێبازی بارامی چۆبین
جێڕازی فەرهاد و شیرین
هەزار فەرەیدوون و کاوە
سەری هەڵداوە لەو ناوە
لە ڕۆژهەڵاتی کۆن و نوێ
لە مێژوو بنۆڕە و بدوێ
لەلایەن کوردی ئازاوە
کێ ساغ ماوە و داغ نەکراوە!

### هێندێک لە پاڵەوانەکانی

قازی، مستەفا بارزانی
شێخ قادر و غەوسی سانی
ئیحسان، شێخ سەعیدی وەلی
شێخ مەحموودی داری کەلی
سمکۆ، خانی ئاردەڵانی
شۆڕە سوارانی بابانی
پاشای سۆران، میری بۆتان
خاوەن زۆران، کەلی کۆتان
بازو میر عەلی جان پۆلاد
غانم و دەیسم و قوباد

بو مـــوسلیـــمی خـــوراســـانی

زەندی و ئـەیوبی و ســـاســـانی

ئـەردەشـــێـــری شـــوانکارە

چەند شـــێـــرێکن لەو نـزارە

هێندێک لە بوێژەکانی

مـــەولەوی و بێکەس و خـــانی

نالی و مـــەحـــوی و بەردەشـــانی

کـــوردی و گـــۆران و جـــزیری

حـــاجی و حـــەمـــدی یو حـــەریری

پیـــرەمـــێـــردی گـــردی یارە

چەند خـــونچـــێکن لەو گـــوڵزارە

وەک تۆ فـــرزەندی ئەو خـــاکـــەن

بولبـــولی ئەو خـــاکـــە پاکـــەن

گوڵی سەرچڵ

ئەو کـــوردســـتـــانەیە یارم

بـۆ ویـیـــــــە وێـڵ و هـەژارم

دلبـــەرم ئەو دەشت و کـــێـــوەن

ئـــەو پـــڕ نـــەوت و زێـــڕ و زێـــوەن

کـــە عـــەنبـــاری ڕۆژهەڵاتـە

ســـەرچاوەی دەجلە و فـــوراتـە

بۆ کـــێـــوانی ســـەربەرزی وی

عـــاســـمـــان ســـەردەکـــا نەوی

فـــریشـــتـــە و هۆریی بەهەشـــتی

دێنه ســـــەیرانی پێ دەشـــــتی
داری کـــــەونارای دنیـــــایه
کـــوێی دڵگر و خـــۆش نومـــایه
گـــــــشت تێکوڵ و لق و پۆپه
کـــوردســـتـــان گـــوڵی ســـەرتۆپه
ئاخ له بەختی ڕەش
ئاخ چ بکەم گـــەردوون تەرەســـــه
کـــوردســـتـــان ئەمـــڕۆ بێ کـەســه
یەخـــســـیـــری دەســـتی تورکـــانه
داگـــــیـــــرکـــــراوی ئێـــــرانه
یان پاپەتیی مـــارمـــێلکه خـــۆر
تێی ڕۆهاتوون دەیبـــــەن بەزۆر
گـــــۆڵ و دەڵ و ڕێوی و چەقـــــەڵ
دەگـــەوزن له جـــێی فـــیل و کـــەڵ
فـــســـۆس و کـــەروێشک و دەڵەک
لانیـــــان کـــــرد له بورجی بەڵەک
شـــەم شـــەمـــه و مـــشکه تۆپیـــون
له قـــــەڵای ســـــەردار خـــــزیون
لەجـــێی خـــانزادی شـــەقـــڵاوه
وشـــــتـــــری گـــــەڕ ئیخ دراوه
دەک فـــەلەک تەخـــتت وەرگـــەڕێ
ئاگـــــر له بەخـــــتت هەڵگەڕێ
تورکی حـــیـــز، تریاکـــیی ئێـــران

خونکارن لەسەر دلێران
پڵنگی ڕازی کوردستان
نەتەوەی ڕۆستەمی دەستان
پاش ماوەی خانی لەپ زێڕین
دیلی چەنگی دێڵی خوێڕین
کێ دی تەنانەت بە خەون
ئازا وەبن حیزان کەون!

### فریو درام

کوردی مەردم بەزەند و بەند
هاسان نەدەکەوتمە کەمەند
دووبەرەکی هێزی بردم
شێخ چەک و نینۆکی کردم
مەلای پیس دەستی گرێ دام
بۆ ناو زەلکاوی فڕێ دام
ئەنجا هێزی ئیستیعماری
پای پێدادام بە یەکجاری
نوقمی قوڕی دیلیی کردم
دزی گەلان ڕۆزیی بردم
لەناو بەرگی شارستانی
بەناو ئینسانی، نەمزانی
تا ڕووبەندی دیموقراتی
لاچوو ڕوم دی بوو بە قاتی*

* وشەی دیموقراتی حروفی (ڕوم دی)ی لێ لاچێ قاتی دەمێنێتەوە.

کـــــوللۆکــــــەوتە دەغـڵ و دانم
هـەر بـەخـــــــــــۆم بـردی تـاڵانم
چەند زۆڵـە کـــــوردێکـی زل کــــرد
گــرێی نامـــووسـیـــان بۆ شل کــرد
بەچەند قــۆشــێک ســازی کــردن
هـەرچەنـدی ویـســـــتـی لـێـی بـردن
گـــــەنم و جــــۆ و تـووتـن و دراوم
زێـڕ و نـەوتـی بـە لـێـــــشـــــاوم
نەوتی کـرمـاشـان و کـەرکـووک
«ســـــتی» لەنـدەنی کـــــردە بووک
هی «رمـــان» و بەخــــتــــیــــاری
بۆ «وال ســـتـــریت» چوو بە دیـاری
دەڵـەســــــــــــە و دەویـت زەنـاوێـر
گــوێلکن بە پەمــۆی ئێــمــە فــێــر
چەرچیی مل چرچی مـــام چەرچیل
بـەنـان و ڕۆنم بـوونـە فـــــــــیـل
* * *
زمــــــانم لێ داگـــــیــــــر کـــــرا
مـــــێـــــشک و دڵم خـــــورا، برا
خـوێنیـان مـژیم، گۆشـتـیـان خواردم
ئێـسـکیـان بە سـەیان ئەسـپـاردم
لای تورکــــە نـیـــــوەی کـــــەلاکم
عـــــــەجــــــەم بەربـوونە لـوولاکم

عـــــارەبیش بـەشی خـــــۆی دەوێ
قـــاپێک لێـــــرە قـــەپێک لەوێ
هەر لەیەک ســـەعـــات و یەک دەم
عـــەرەبم و تـورکـــیـــشم و عـــەجـــەم
پێم دەڵێـن تورکی کـــــێـــــوانی
یان لە قـــەحـــتـــان و شـــەیتـــانی
یەک دەڵێ مـــێـــژوومـــان یەکـــە
ئەگـــەر بشت خـــۆم دەنگ مـــەکـــە
***

### خەیاڵ ئەکەن

بـــەڵام بـــە هـــەزار هـــێـــنـــدە دەرد
نـامــــرم، ســـــەریان داوە لـە بەرد
مـن بە بـانیـــــــپـــــاڵ نـەمــــــردم
چەنگیـــزخـــان قـــڕی نـەکـــردم
ســـەلیـــبی چوون، مـرد گـــەزەنفـــۆن
کــــورد بە زیادەوە هەر وەک خــــۆن
شــــا عـــــەباس لە بنەی نەهێنام
تـۆزی بـەبا بـوو مـن هـەرمـــــــــام
بەشـــێـــر نەخـــورام، دێڵـــە ڕێوی
دەم خـــوا؟ های بە کلکی خـــێـــوی
گـــەل خــــواردن گـــەلێ گـــرانە
نایبـــا ڕیخـــۆڵـەی ئەمـــــانە
ســـەد ســـاڵ جـــوورابم، خـــورابم

قـــورسم هەرگـــيـــز هەزم نابم
پـارووێـكم چـيـــــڕ و دڕكــــــاوی
كـێ بم خــــــــوا دەبـڕم هەنـاوی
لـە چـاويـانـڕا ســـــــەر دەردێـنـم
هـەتـا ســــــەر هەروا نـامـــــێـنـم
بـەرخ هـەر بـن ســـــــــەوە نـابـێ
ڕۆژێـک دێ شــــــاخـی پـەيـدا بـێ
زەوی دەگـــــــۆڕێ و دەگــــــەڕێ
هـەردەم دێـنـێـــــتـــــە ڕووپـەڕێ
لەو چەرخ و خـــــول و گـــــەڕانـە
ســــــوڕێـكيـش بـەشی كــــوردانـە
بەرەو مـنـيـش دەخــــولـێـــتــــەوە
نـۆرە گـــــورزی مـــــەش دێـتـــــەوە
نەخـــوازە لەم چەرخی بيــســــتــــە
گـــاڵـەی دنيـــای كـمـــۆنيـســـتـــە
ڕێ و شــــــــوێـنـی لـيـنـين هەيـە
ســوڤـــێـــتـــســـتـــان و چين هەيە
ئـــاڵای بـەرزی كـــــــــــرێـكـاری
هێـناويـە مـــــــوژدەی ڕزگـــــــاری
بە ملـيـــــار خـــــەڵكی ڕۆژهەڵات
ئازا لە ئيـــســـتـيـعـمـــار هەڵات
چين داری بۆ ئـامـــــريكـا كـــــرد
كـــەللەی ســەری پڕ لە كـــا كـــرد

چەند چەرخە ئینگلیزی گلاو
هێندی تالان کرد و چلپاو
ڕفاندی، کڕاندی، ساندی
دیتت چۆن کۆمەڵی گاندی
بە ڕۆژو، بە تەشی ڕستن
تەنەکەی دەکلکی خستن!
سۆکارنۆ هۆڵەندی چڕاند
هیند و چین فەرانسەی دڕاند
لەو کونەوە بێ ئەو بایە
چۆن هەلێکی منیش نایە؟
***

### شۆڕش ئەکەم

هاکا دیت منیش ڕاپەڕیم
خوڕیم، گوڕیم، چڕیم، دڕیم
سەپان و پاڵەی دڵ پۆڵا
لە شار و لادێ، لەچۆڵا
کوتک لە سەر شان، داس بەدەس
دەبێتە شۆڕشگێڕ هەرکەس
خۆ وەشێرن خوێڕی و قزە
بمرێ هەرچی حیز و دزە
چەک لە چنگ زۆردار دەردێنم
نق بکا سەری دەشکێنم
ڕیشی ڕیخنی شێخ دەبڕم

مەلای لابەلا زگ دەدڕم
زۆڵە کوردی بێ ئابڕوو
دەنێرمە سەر هۆرەی بەڕوو
ڕووی گوندی خۆران ڕەش دەکەم
ئاو و زەویان دابەش دەکەم
لە کێژ و لاوی جووتێران
پاڵەوانی نەوەی شێران
هێزی کوردستان پێک دێنم
تۆڵە لە دوژمن دەستێنم
بگا و مەکوش، گێلدم، ئوێلدم
یایومە تێ ناگەم کوردم
کێ خواردوومی دەڕشێتەوە
کێ لێی دام لێی دەدرێتەوە
لە گورگیان کڕیاری پۆستم
بۆ بێ زۆریان یار و دۆستم
ئەویش بێ بەش بوون وەکو من
ئەویش خوێنی مژتوون دوژمن
دوژمنی گەورە ئیستیعمار
ڕۆژهەڵات کوژەی شینە مار
مەردم خۆرەی چەرموو چەرم
بێ بەش لە شوورەیی و شەرم
لەگەڵ تورک و عارەبی چاک
گەلی ئێرانی باش و پاک

دەست لە قەدی یەک وەردێنین
ڕیشەی ئیستیعمار دەردێنین
حەزبای خوێنمژی هەژاران
بەگەل دەکەین بەردە باران
سەر و گوێی بە داس بە چەکوچ
دەبڕن دەجنن چ کوڕ چ کچ
ڕێ نادەین خەونیش ببینێ
کە زل بوو لەسەر زەمینێ
لێی حەرام دەکەین ئەو خەوە
مەرگی سەگی هار چل شەوە
پشت بەکام هێزی دەسپێرێ
کوێ ماوە خۆی لێ وەشێرێ!
کوودەڵەی دەلەسە و چەرچیل
ئێمە دەیان گرین بە دیل
وەک گیسکی مس لە بەهارا
بن کلکیان دەکەین بە دارا
نیشتمانمان دەکەین بژار
خوێنمژ دەبڕین لەسەر هەژار

جا نۆرەی بەزمە

ئاڵای سێ ڕەنگی ڕەنگینم
لە پۆپەی بەرزان دەبینم
دەلەرێ و دەشەکێتەوە
دەردم سارێژ دەبێتەوە

برین لە گیانم نامێنێ
دەم و دەست گوشتەزوون دێنێ
ئەودەم بە کوێریی نەیاران
گشت خاکەلێوەی بەهاران
بۆ جێژنی ڕزگاری و سەرساڵ
کیژۆڵەی کورد و کوڕ و کاڵ
بالابەرزان و چاومەستان
دێن لە هەموو لای کوردستان
لە کوێ و لە کوێ؟*
لە عەزیز، بتلیس و ماردین
زارا و مەکس و کلس و عیفرین
دەرسیم، ئەرزەڕۆم، ئەرزنجان
بایەزید و سعرد و وان
مەلاتیە و دارندە و بۆستان
دیاربەکر و جزیرا بۆتان
باش قەلا و خۆزات و پالۆ
مووش و چۆلەمێرگ و ماکۆ
کنج و کەیفی و ساریقامیش
سوێرەک و عەنتاب و مەرعیش
عامودە و دەرباسی و ژەنگار
تا قامیشلی و عەرەب پینار

* هەرچیی لەو بەندەدایە ناوی مەڵبەندەکانی کوردستانە.

ئەسکەندەروون، ئۆرفە، خەرپووت
عەقرە، مووسل، عمارە، کووت
میدیاد، ئامێد، دهۆک، زاخۆ
کفری، کەرکووک، هەولێر و کۆ
ڕەواندز، هەڵەبجە، پێنجوین
مەندەلی و تووز و خانەقین
کرند و قەسر و خوسرەوی
شوشتەر و بەندەر پەهلەوی
بەندەر دەیلەم و بەهبەهان
خوڕەماباد و ئیسفەهان
مەلایر، مەسجید سولەیمان
سوڵتان ئاباد و تویسەرگان
شەهری کورد، سنە، هەمەدان
کرماشان، سەقز، هەورەمان
سەردەشت و بانە تا شنۆ
تا ورمێ و دیلەمان و خۆ
نەغەدە و شاپوور و سەڵماس
لە هەردوو بەر ئاوی ئاراس
میاندواو ، شاهین دژ، بۆکانی
مەهابادی و سولەیمانی
چییان لە بەرایە!
بەبەرگی ئاڵ و والاوە
هەرچۆنێ لە ناویان باوە

شاڵ و شاپک، کەوا و پاتۆڵ
جل تەنگ و نێفەک فشوفۆڵ
کوومی سوور، شەدە و جامانی
تەپلەی لە بان خوڵامانی
کەوای شۆڕ، فەرەجی و پەستەک
مرادخانی و عەبا و کورتەک
کنجی دێوجامەی بۆتانی
ئەنگوچکی شۆڕی سۆرانی
دەرپێی سپی و چۆغەی گرژاڵ
کەوش و کەڵاش دەبنە هەواڵ
کوڕگەل هەمووی شۆخ و لاوە
بۆ کچانیان چاوە چاوە

## جل و خشڵی کیژان

هەزار ڕندێ و شەمێ و زارا
سەرتاپا خامەک و خارا
سایە و کراسی کەمبەرچین
لە هەزار ڕەوشێ و نازەنین
پەلک و قەتارە و گێل گێلە
کەمبەرە زێو، پشتێند شێلە
لاسەرە و بازن و خڕخاڵ
کلۆجەی مەخمەر سوخمە ئاڵ
تۆق و تەلیسم و لاگیرە
گۆبەرۆک، ملوانکە لیرە

گـــواره و کـــرمـــەک و دەرزیلە
مـێـخـەکـبـەند و ئەنگوسـتـیلە
حــەمـــایەل، بازوبەندی قـــۆڵ
لوولە و قـاش، خـرینگە و مـەنگۆڵ
بەرمـــوور، گـــەردانە، پاوانە
سـڵـسـڵـە و پڵـپـڵـە و لەرزانە
خــەزێم شــۆڕ، دەســمــاڵ بە ئۆیە
کـــــڵاوزێـڕ بە دابی کـــــۆیـە
چەند جۆر هەڵپەڕکێ
لەســەر چناری گــوڵعــەنبــەر
یان لەسـەر کـانیی مـام قـەنبـەر*
دیـتـت لەســـــەد لا هەڵ خـــــلا
ڕاست و چەپی و هۆرزێ و مــــلا
ڕۆینە و سێ پێـیی و شـێـخـانی
دووپێی چۆمی مــەجـیـد خـانی
بەزم گێڕەکان
دەنگ خــۆش دەیگێـــڕن بە بەندان
حـەمـە جـەیران، عـەلی خـەندان
تایەر تەوفـیـق، گــەردی و ڕەمــۆ
کـــاوەیس و ڕەشــــۆڵ و کـــوڕۆ
ئەحـمـەد گـوزەڵ، مـەجـە گـڕوێ
هەلامــە و حـــاجـیلە و مـــاملێ

* سەرچنار: سەیرانگایە لە سولەیمانی. * کانیی مام قەنبەر: سەیرانگایە لە مهاباد.

فەوزیە و ئەڵماس، مریەم خان
نەسرین شێروان، مەنیج حەیران
سێلاق، سەرشین، کەریمە کوێر
مامی سێوانیش بە بلوێر
سەرمابردوو بە دەفەوە
هەڵ دەخولێ بەبەر سەفەوە
مەلا کەریم، قادری ئەولا
هەرکەس لە سووچێ لە هەولا
بە تار و دنبەگ بە گەواڵ
چووزەلە و کەمان و شمشاڵ
لاوی یەزیدی بە تەنبوور
دیلان جۆش دا ساز و سەمتوور
لێدەن شێخۆنادۆ و خەمە
دەهۆڵ و زورنا دەم دەمە

هەی لەو گۆوەندە

دەبێتە بەزمی ڕەش بەڵەک
شیر و شەکر دەگەن بە یەک
هەڵ تەکانە دەست کوشینە
ڕان بەڕانە ڕێک خشینە
ڕەشماڵی زوڵفی تاتایی
دەدرێن لە سمێڵی خورمایی
ئارەقی سپی و ئەسمەران
دەتکێنە سەرگۆی خەنجەران

خوێی سەرکوڵم و تەنکە لێوان
دەڕژێنە نێو شەکرە سێوان
خۆبادانی کەمەرشلان
چاوبڕکێنەی چاو بەکلان
لەرزەی مەمکی باڵابەرزان
خێرو خۆشی دەکەن هەرزان
بەگەل خرمەی پانی بەرز
دەلەرزێنن دڵی عەرز
لەسەر شینی سپی بەلەک
شێت دەکەن مەلەک لە فەلەک
کەفەڵی خڕ و مەچکی پڕ
هەڵخڕێن کەسەر دەکەن قڕ
کێ بە کێیە لەوان دەمان!
کوڕ هەلە دەس بەرنە مەمان
هەرچەند خۆش ڕابوێرن کەمە
چ ڕۆژی لۆمە و لەقەمە
دوای ئەو هەموو ژینە تاڵە
دەرد چێژتنی ئەم چەند ساڵە
چێژەی ئازادی دەچێژن
کوڵ و کۆ بە خەم دەڕێژن
دڵ بۆ یەکتر دەکەنەوە
سرتە دەکەن بە کەنەوە
دڵ تەڕن و لاون و نازەنین

ســـــرتـه و پـێـکـەنـین هـەر چ نـین
لەو دەم لەو ڕۆژە لەو جـــێـــیـــە
مـاچ و مـووچیش عـافـووی لێـیـە
زیـقـــە و تـریـقـــەی مـنـداڵان
حـــیلکە و کــۆکــەی کــۆنە ســاڵان
دایـک و بابـی کـــیـــژ و لاوان
یـەکـــتـــر دەدوێـن بـە چـاوان
دەبینەوە هاواڵ
بولبـــول منیـش ئەودەم ســـازم
وەک تۆ دەگـــەم بە دڵـخـــوازم
دەڕەوێ تـــەمـــی هـــەژاریم
بـەس دەکــــەم لـەناڵـە و زاریم
بەســـتـــەی دڵداری دەبێـــژم
دوڕ دەڕێـژم، گـــــوڵ دەنـێـــژم
دەدەم پــــەســــنــدی ئــازادی
دنـیـــایـە داخـنـم لـە شـــادی
دەگـــــەڵ تـۆدا دەچـریـکـێـنـم
بەســتــەی خــۆمت پێ دەخــوێنم:
ئەمەش بەستەکەیە
کــوردســتــان ئەی نیــشــتــمــانم
هێـــزی دڵ، ئارامـی گـــیـــانم
جــێی ســـەربڵندی و شـــانازی
تـا دڵ دەخـــوازێ دڵـخـــوازی

گـــوڵـی پشـكوتـووی بێ پـاییـــــز
ســـیس نـابێ و نـاوەڕێ هەرگـــیـــز
مــێــشكم، هەســتم، بیـــرم، ژینم
بۆ تۆن ئەی گـــیـــانی شــیـــرینم
تا زینـدووم هەر تۆی مــــەبەســــتم
خـــــۆشم دەوێـی دەت پـەرســــــتم
بـشــــــمـــــــرم لەشی بـەگـڵ بـوو
دەڕوێـنـێ چـەنـد گــــــــوڵ و دڕوو
گـــــولـم بۆ دەســـــــتی دلـدارت
چقـــــلـم بۆ چاوی بەدكــــــارت
گــیـانیش دەفــڕێتـە عــاســمــانت
ئەوســـا تێـــر دەكـــا ســـەیرانت

***

ساڵی ٥٧ لە سووریاش وەک جێگەکانی تر لاوان خۆیان ساز دەکرد بۆ بەشداربوون لە فستیوالی لاوان لە مۆسکۆ. لەسەر داخوازی چەند برادەرێکی کورد، سروودی لاوانی جیهانیم بە کوردی نووسی:

## سروودی ئاشتی

ئاشتی خوازان جەوانی مەردوگورد، مەردوگورد، مەردوگورد، مەردوگورد
باوی چەکداری شـەڕانی کـەوت و مـرد، کـەوت و مـرد، کـەوت و مـرد
ئێـــــســـــتـــــە هەمـــــووی مـــــە بەعـــــالەم ئەدەین گش دڵ خـــــوا
بەد فـــەڕی پیس نەعـــرەتەی مـــە هێـــزی برد هێـــزی برد هێـــزی برد

***

* بەندەکەی سەرەوە لەو سرووده لە پێشدا و لە پاش هەرسێک بەندەکانی تر دوپاتە دەکرێتەوە.

١

لاوی هەردی گش بران ڕۆژ و شەو هەر خەریکی خەبات
ئاشتی خوازان وەک چران تیشکی وان بەختی ڕەش ون دەکات
وێکڕا گەلانی جیهانی دەیلێ بەگیان و زمانی:
چینی جەوانین، هیمی جیهانین خۆشی دەکەین دنیا

٢

چەک فرۆشی پارەدار، هەوڵ ئەدەن هەڵ ئەکەن توونی شەڕ
خەڵکی دنیا بوون شیار، ناچنە شەڕ بۆ خودای فێڵ و گەڕ
لاوین بناغەی جیهانین، جێگەی نیازی گەلانین
خۆشیی زەمانین، مایەی ژیانین، پڕ ئارەزوو و هەویا

٣

لاوی ئازای کورد زمان وەک پڵنگ ڕۆژی جەنگی وڵات
ناوی دەرکرد بێگومان زاگرۆس پێو دەڵێ و ئارەرات
ئێمە دەنێژین نەیاران خۆشی دەدەینە هەژاران
گش پاڵەوانین، شێری ژیانین لە دوژمنان وریا

***

قبور البیض، سووریا، ٢٠/ ٧/ ١٩٥٧- ساڵی ١٩٥٧ منیش بەنیازبووم کە بۆ بەشداربوون لە فێستیواڵی لاوانا بچمە مۆسکۆ، بەڵام تەگەرەی تێ خرا. ناچار چەند مەقالێکی هاوارنامە و ئەم شیعرانەم بە برادەرێکا نارد کە لەجیاتی خۆم بچن، بەڵام برادەرەکەش گوایە لە بیری چووبوو کە نیشانی کەسیان بدا، لەم شیعرانەدا بۆرەگلەییەکم لە مۆسکۆ کردووە کە نەدەبوو بەرانبەر بە کوردی هەژار ئەوەندە بێ پەروابن:

## شەوێک زیندان

شەوە نیوەشەو، دنیا خامۆشە
وەک ئازیەتباران زەوی ڕەشپۆشە

هەناسەی سارده با دەناڵێنێ
هەور دڵ پڕە، ئەسرین دەڕژێنێ
تاک تاک ئەستێره لە ئاسۆی مەلووڵ
دەڕواننە شینگە وەک پیاوی فزووڵ
ڕمبەی پێلاقە و هەڕەشەی زۆردار
شەقەی قامچی و دار تێکەڵ بە هاوار
پڕیشکە و فیشقەی خوێنێکی ئازاد
لەدار و دیوار دەنووسێ «هەی داد»
گزیر دڵ ڕەقە، مووچە، خوێن تاڵە
کوتەکی دەستی زاڵمی زاڵە
لە جوابی ناڵە دەحیلکێتەوە:
کوردی چۆن بە زەم پێتدا دێتەوە!
ئازادی خوازی! بەشت مردنە
هەقی کوردستان پامال کردنە
تۆی چقڵی چاوی هێزی ئیستیعمار
دەبێ بت نێژم لە ڕێگەی دۆلار
نووسیوتە «مۆسکۆ کۆشکی کرملین،
قەڵای ئازادیخوازانی زەمین،
باڵداری هیوای وەتەنپەرستان،
جارێک بابێتە سەیری کوردستان»
بە کام دەست ئەمەت نووسی بیبڕم
کام دڵ ئەمەی خواست تا هەڵیدڕم!
زمانم بەستووی نەمهێشت بخوێنی!
بەچی پەڕندەی هومێد دەدوێنی!

چی بۆ دادەنێی! کـــــوا دان و ئـاوت!
فـرمێسکی چاوت! جـەرگی سـووتاوت!
ئا! هیــوات وایە تێ بگا مــەبەســتت
لە زرەی زنجـــیری پێــوەند و دەســتت!
ملیـــــۆنەهای کـــورد دەتەوێ بژین!
ڕزگــاربن لە ژێر زۆری و خــوێن مــژین!
نەتزانی ڕێگەی هیــوات گـــیــــراوە!
دەرفـــــەت بڕاوە چارەت نەمــــاوە!
دەورەم تـەنیـــــــوی بە پـۆلا و ئـاسن
هەیـهـــاتە بێــــلم گـــەلان بتناسن
کـــوندی پەیمانی بەغـــدات لە ســـەرە
دان و ئـاودەری ئـایـزەنـهـــــــــاوەرە
عـــەدلی لاوازی شـــەل و نوقـــوســـتـــان
ناگـــاتە چیـــای ڕژدی کـــوردســـتـــان

* * *

لەناو هەنیـسک و غـــەلّدەی خــوێنی دەم
جـواب ئەداتەوە نووزێک بە حـاســتـەم:
لـێم بـدە، بـدڕە، بـکـوژە، ببـــــــــڕە
نامــــووس بفـــرۆشــــە، نانی پێ بکڕە
خـــوێن بمژە، پێـــســـتم لە دار هالێنە
لە ســـەرمن ئێـــســـتـــا هێـــزت بنوێنە
جـەمی دوارۆژی تۆشـە و ئیـسـتیـعـمـار
چل شـــەوە مـــەودای ژینی ســـەگی هار
هێـــــزی هەژاران دنیــــا داگـــــرە

بۆ پووشی گیانی خوێنمژ ئاگره
هاکا گوڕاندم له چیا و نوالان
گیانی تۆ و ئاغات دەڕوا بە تالان
نامێنن نه تۆ نه زەناوەرت
بەداری بێستان دادەکرێ سەرت
دەبێ پەیمانتان مردار بێتەوە
لەسەر گۆڕینگۆ سەربنێتەوە
بە کوێری چاوی دالاس و بەیار
کورد دەبن ڕزگار ورد دەبن نەیار
لەناو گەلاندا خۆمان دەنوێنین
بەسەربلندی سەرمان هەڵدێنین
یاری ئازادی دەگرینە باوەش
ڕۆژی ڕوون هەڵدێ لە پاش شەوی ڕەش

***

دمشق، سووریا ٢٥/ ٧/ ١٩٥٧- تەڵقینی بەعەرەبی کە لەسەر مردوانی دەخوێنن ئاوا دەست پێ دەکا «ئەی بەندەی خودا کوڕی کارەکەر(کەنیز)ی خودا» . منیش ئەم تەڵقینەم هەر لەو بارە هەڵخستۆتەوە. هێندێک لایان وابوو کە گوتوومە «گەر دین ئەمەیە تا دوایی... گوناحە...» بەڵام ئەگەر تێگەیشتوانە سرنج بدەن ئەزانن چم وتووە و نیازم کفر و گوناح نییە... مەولەوی لە مەسنەویدا ئەڵێ«گەر پیاو چاک وابێ نەحلەت لە پیاو چاک» :

## تەڵقین بە کوردی

ئەی بەندەی خودا کوڕی کارەکەر*
گوێ بگرە لەناو گۆڕی تەنگەبەر

* بەندە بۆ پیاوە بەڵام بۆ مردووی ژن دەبێ بڵێین: کارەکەری خوا کچی کارەکەر.

لە دنیای بێفەڕ کۆچت کردووە
لە ئەولای بێگەڕ خانووت گرتووە
تۆش وەک مردووی تر وەک هام فەردانت
دووپەری خودا دێنە سەردانت
دووی ددان زەردی سووری چاوشین
بە گورز و مەتاڵ، بە تەوەرزین
تۆزێ مڕومۆچ، ڕووتاڵ و تفتن
بەڵام وەک دەڵێن «بەگفت و لفتن»
هەزار جار بڵێن «کوا مەڕنەمووکە»
بێدەنگ، قڕوقپ، لێت نەیە جووکە
گەر تێشت هەڵدەن پێشت دادەن تف
بڵێ من کوردم، زمان مایەعرف
لە دار مەترسێ گوێ مەدەرە جوێن
ناچاریان بکە بە کوردی بدوێن
ئەمجار بە زمانی شیرینی کوردی
خۆت هەڵە مەکە، هێدی، بەوردی
بێژە: لالۆ، خوا و پێغەمبەر هەقە
کوردی هاسانە و عارەبی ڕەقە
باسی مردن و هەستانی دوایی
خۆ ماندوو نەکەن با بەخۆڕایی
بڵێ: کورد لەسەر دنیا مردووە
دەمێکە قیامەت لەوان ڕابووە
بێ بەرگ و پێڵاو، بێ نان و بێ دۆن
تورک و عەجەم و عارەب دەیانخۆن

کورد ژێر چەپۆکە و ئەو خاوەن زۆرن
برای موسوڵمان، موسوڵمان خۆرن!
با لە خوا پرسن: گەر دین ئەمەیە!
گەپ و گەمەیە و زیانی مەیە
دینێ بەشی کورد بخاتە بن لیچ
سەد بار گەورە بێ نامەوێ وە هیچ
وەرامی بەهەشت زۆرباش دەزانی
خۆت خەڵکی چیا و دەشتی کوردانی
باس بکەی ئاو و هەوای کوردستان
کوڕ و کچی جوان، پێ دەشت و کوێستان
شینایی و کانی و باغات و میوە
پێت باوەڕ دەکەن بەهەشتت دیوە
دۆزەخیش وێنەی لە دنیا پڕە
چۆڵی عارەبی گەرم و قاقڕە

***

بادگودەزبیرگ، ئەڵمانیا، ١٥/ ٨/ ١٩٥٧-ساڵی ١٩٥٧ وەک لە پێشەکیدا گوتم بەرەو مۆسکۆ چووم، هێندێک لە برادەرانی عێراقی و سووری نەیانهێشت و لەچیکوسلۆفاکیاوە دەریان کردم. مانگێک لە ئەڵمانیادا سەرگەردان خولامەوە. ڕۆژێک لە سەر چۆمی (ڕاین) غوربەتیم هەستابوو، ئەم شیعرانەم هۆندەوە:

## فرمێسکی هەژارێک

لەسەر چۆمی «ڕاین» لە ڕۆژگارێ جارێ
تکا ئەشکی ئاوارە کوردێ، هەژارێ
بەسەریا خوڕی: کوێندەریی ئەی تکەی سوێر
ئەتۆ و ئێرە چی دەنکە فرمێسکی بێ خێر؟

وتی: ئاوی چاوی کـــوڕی کـــوردســـتـــانم
له دەجله و فـــوراتڕایه ناو و نیـــشـــانم
لـه زێـڕیـنـه ڕوود و تـەتـاهـۆ ســـــــەلامـێ
له بەژنت له چل چەشـــمـــە پێـــمـــە پەیامێ
لەســـەرخـــۆبه ئەی ڕاینی شـــۆخ و شـــیـــرین
شتێک بوین ئەمەش گەرچی ئێستا ئەسیرین
هەچەند دیل و بێـــچـارەشـه نیـــشـــتـــمـانم
ببـــەخـــشـــه لەجێی تۆی به خـــۆشـتـــر دەزانم
چ کـــەڵـوە و چ ســـیـــروان و ئاوێزەڕۆیه*
به دیمەن هەمـــووی شـــۆخ و شـــەنگتـــر له تۆیه
ئەگـــەر لادەچێ ئەم تەمـــەی نەگـــبـــەتیـــمـــان
بەخـــاوەن دەبێ کـــێـــو و چۆم و زەویمان
لـه دڕکـی نـەیـاران بـژارێـکـی دەکـــــــــرێ
هـەزارانی وەک تـۆ لـه شـــــابـاشی دەدرێ
بـــەڵـــێ ئـــاوی چـــاوم لـــە دڵ هـــەڵـــکـــزاوم
لەڕێی ســـــەربەخــــۆبوونی کـــوردان ڕژاوم
وتی ڕاین: ئەی تیـــشـک و هێـــزی دڵی من
وەره باوەشم بت بەمـــــه بەحــــری بێ بن
به هاوار و دادت مـــوحـــیت بشـــڵـــەژێنه
له چەپگەردی گـەردوون بەشی کـورد بسـێنه

***

---

* دجله، فـورات، زێڕینەڕود، تەتاهو، چل چەشــمـه، کـەڵو، سیـروان، ئاوێزەڕۆ: ناوی هێندێک لەو چۆمانەن که له کوردستاندان.

چەند ساڵێک لەمەوبەر هێندێک لە کمۆنیستەکانی ناوخۆ ڕازی نەدەبوون باسی کورد و کوردستان بکرێ کە گوایە گەلپەرستی وەبەر مارکسیەت ناکەوێ! کەچی کوردەکانیش هاواریان بۆ ئازادی عەرەب و عەرەبستان ئەکرد و هیچ زیانیشی نەبوو. لەو سەردەمانەدا ئەم دەمەتەقەم نووسیوە کە لام وایە وێنەیەکی ڕاستەقانییە بۆ ئەو تەرزە کەسانە لەو سەردەمەدا. بەڵام نابێ لە بیریشمان بچێ کە ئێستا کمۆنیستەکانی ناوخۆ دان بەمافی گەلی کوردا دەنێن و لایان وایە ئەبێ کوردستانیش وەک هەموو وڵاتانی تر ئازادی خۆی وەرگرێ. لاشیان وایە ئەو کەسانەی ئەودەمە خۆیان لە باسی کوردستان ئەبوارد بەهەڵەدا چووبوون.

## دەمەتەقەی پیرۆت و بایز

پ ـ بایز لەمەڕ تۆ خەبەرێکم بیست
ب ـ خۆمن لەمێژە بوومە کمۆنیست
پ ـ پێم ناڵێی مانای کمۆنیست چییە؟
ب ـ بەبێ جیاوازی خێر و خۆشییە
گش ڕزگار دەبن گەلانی زەوی
فەرقی نامێنێ بلند و نەوی
دەبنە برای یەک سپی و زەرد و ڕەش
هیچ گەلێ ناکرێ لە ژیان بێ بەش
ڕەشی ئەفریقا و سپیی لەندەنێ
هەرتک وەکو یەک بەشیان ئەدەنێ
ون دەبێ ناوی دیل و کۆلەدار
لەقامووس دەڕوا وشەی ئیستیعمار
پ ـ ئۆخەی مام بایز بۆ موژدەت ئۆخەی
ئەو دەورە خۆشەی کەی دەبینم کەی؟
ئەوسا لەسایەی ئێوە کۆمنیستان
سەربەخۆ دەبێ خاکی کوردستان
ب ـ چت وت کوردستان؟ تۆ گەلپەرستی؟

ڕێگەی پێشکەوتن لە خۆت دەبەستی؟
نیزاڵ و کفاح نازانی چییە؟
دەیالەکتیکت ئاگا لێ نییە؟
کێ کەلیمەی کورد بێنێتە سەر زار
دیارە قەومییە و پیاوی ئیستیعمار
ئەگەرچی مارکس، ئینگلز، لینین
دەڵێن: بێ فەرقن گەلانی زەمین
بەڵام پێشکەوتووی عارەبی زانا
ئەم قانوونەیان بۆ کورد وەلا نا
چونکە کورد لە ژێر چنگی عەرەبن
کورد سەربەخۆبن، عارەب گەڕ ئەبن
بخوازە گانا و سودان ڕزگار بن
کورد بۆ عارەبان با هەر ژێربار بن
کۆمەڵی سووری جەنوبی چرووک
چۆن بەڕێ دەچن بێ نەوتی کەرکووک!
داهاتی شیمال لە خۆیان ببڕن!
قەراجیان نەبێ، گەنم وجۆ بکڕن!
هەواڵی عارەب هەواریان ناوێ!
هاوین چۆن بژین دوور لە شەقڵاوێ!
بێ ڕۆنی کۆیی و ماستی هەولێری
برای عەرەبمان دەگرێ شەوکوێری
برنجی ماڵوان، تووتنی ڕەواندز
نابەخشن بۆ سەد مارکس و ئینگلز

زاخۆ و خانەقین تا جەبەلحەمرین
لە دەست خۆنادەین بۆ گفتی لینین
پـ ـ باشە مام بایز. ئەوە نەوت و ڕۆن
با بۆ عارەب بێ جەهەننەم بیخۆن
ئەی بۆ ئازادی بەرگ و زمانم
دەڵێی چی بایز، تاعوونی گیانم؟
بـ ـ چی ئیستیعماری رەجعی کردوویە
نابێ بمێنێ هەواڵ فەرموویە
بە کوردی خوێندن تەفرەقە دێنێ
هەر کوردی گوتن نابێ بمێنێ
چۆغەی فش و فۆڵ شەدە و جامانە
مایەی نەگبەتیی شەعبەکەمانە
یەکیەتی مانای پاتۆڵ فڕێ دەین
پێ خاوس بڕۆین عەگال گرێ دەین
دەبێ لە مەرحووم فێر ببین ئەدەب
خۆی عەرەب نەبوو ببوو بە عەرەب
با شیوعی کورد قەومیی عەرەب بن
هەر بژی عەرەب لە سەر و لە بن
بـ ـ بەخوا مام بایز هێشتا هەر کەری
کەی دەبیە ئینسان قوڕت بەسەری؟
ئاخر تۆم کوردی بۆیە فەوتاوم
هۆرەم لەخۆمە بۆیە قەڵشاوم
یاری نەیاران دەکەی خۆت بخۆن

کێ بیستی لەناو چەرخی تازە و کۆن
مەڕ لە بەرخۆڵەی خۆیان نەبان بن
بچن شیردەری بێچوە گورگان بن
بۆ کورد بیری تۆ و بەیار هەریەکە
بەڵام تۆ بێ چەک ئەو خاوەن چەکە
لەناو عارەبا ئەمتاوێنیەوە!
سەڵا لە عەقڵت بە چاوێنیەوە!

***

قبور البیض، سووریا ٥/ ١١/ ١٩٥٧- هەوەڵ مانگی دەسکردی سۆڤیات هەڵدرا، زۆر کەس لە نووسەران پێیان هەڵ گوت، منیش ئەم سکاڵایەم لەگەڵ کردووە:

## سپۆتنیک

مانگە چکۆڵەی سۆڤیاتی مەزن
جێ بێڵە هەرچی تیژ و خۆش بەزن
وەک ناوی سۆڤێت بگەرە بەرزی
وەک کۆمۆنیزم دەورە دە عەرزی
بگەڕێ بفڕە سەیری جیهان کە
فرمێسکان بسڕە دەردان دەرمان کە
با لێ قەوماوان ناوت بپرسن
خوێنمژی گەلان با لێت بترسن
ڕۆژێک ڕا ببرە بە «لیتڵ ڕۆکا»*
با زەنگی خۆران بێن بەسەر چۆکا

* لیتڵ ڕۆک: شارێکە لە ئامریکا ڕەشەکانیان زۆر لێ کوشت.

بادەوە بۆ سەر جەزایر، عومان
با بۆسەرکەوتن نەمێنێ گومان
هێندێ دڵداریی ئافریقا دەوە
بابزانن ڕۆژ دێ و کورتە ئەو شەوە
پێک پێکێ لەسەر خوارووی جزیرە
چیدی نەترسن لە شێرە پیرە
دەستم دامێنت ئەی مانگی ڕووناک
وا سوێندت ئەدەم بە باوەڕی پاک
لەپێش ئەوەدا بچییەوە مەسکەو
ئەگەر هیچ نەبێ شەوێک نیوەشەو
سەرێک هەڵێنە لە کوردستانم
تێ بگە چۆنە ماڵی وێرانم
کانگای نەوتانم جێی زێڕ و زێوم
بەهەشتی دنیا، پێدەشت و کێوم
وا داگیرکەران دەمیان تێ ناوە
هەر کوردە ماوە و بەشی خوراوە
ببینە چیام بوونە بنکەی شەڕ
مام سام لەوێوە پێتان دەکا گەڕ
ئەی مانگی سۆڤێت بۆ خۆت دەزانی
جیران هەقی هەس لەسەر جیرانی
شەرمە بۆ ئێوە هێندە گەلی کورد
چەکمەی ئیستیعمار دەیان هاڕێ ورد
ناتوانێ بدوێ کورد بەزمانی خۆی

هومــێــدی تەنیــا گــەلی تۆیە و تۆی
ئێــوە یاریدەی دووردەســتــان دەکــەن
چۆن دەبێ سەیری کوردستان نەکەن؟
پێشوو دەیان گوت: دوعای عومەری
کــوردی خــســتــۆتە ناو کــوێرەوەری
ئێــســتــا بۆ دوعــای دالاّس گــیــرایە
ئــەم زۆرە تــاکـــــــەی لاتـان ڕەوایە!
بڵێ بەسۆڤــیــات کورد هاوار دەکەن
یارییــەکــیــان بکەن خۆ ڕزگـار دەکەن

* * *

قبور البيض، سووریا ٥/ ٤/ ١٩٥٨- ئەم کورتە نومایشەشم کە هەر بە هومێدی یارمەتیدانی سۆڤیەت نووسیوە خەیاڵەکەم لە هەڵدانی مانگی دەسکردیانەوە بۆ هاتووە:

## جوچک و سپۆتنیک

تازە تاو هەڵاتووە، کــەڵەشــێرێکی ســووری پۆپە لار لەســەر لاقــێک خــۆی لەبەر خــۆرەتاو هەڵخســتــووە، مــریشــکێکی زەردی ســەر بە کــڵاوە بە قــرتەقــرت دان بۆ جــوچکان هەڵدەگــرێتــەوە، سێ منالی ڕووت و پێــخــواسی کــوردیش لە تەمــەنی چوارپێنج ســاڵیــدا لــە ترسی ســەرمــای بەیانی هاتوونە بەر بەرۆچکە و هەڵیش دەلەرزن و ســەیری جوچکانیش دەکــەن. جــووجــەڵەیەک مل قــوت ئەکــاتەوە و دندووکی لەدایکی نزیک ئەخاتەوە و جیوجیوێکی دەکا:

جوچک:

تــازە تــێــکــوڵــم شــکــانــدبــوو
خـــــــۆم بــن بــاڵــت خـــــــزانــدبــوو
لــە خـــــــەومـــــــا دیم بــاڵداری زەرد
بەجــێی هێــشت زەوی و دار و بــەرد
کـــــۆلارێکی بــەرهات کـــــوشـــــتی

هەڵۆ خۆیان وەشارت گشتی
مانگیشی دایە پشتەوە
مریشک:
قی قی ئەوە زیندە خەوە
جوچک:
دەیسا چبوو ئەو جیک جیکە؟
کەڵەشێر:
قوقو، ئەوە سپۆتنیکە
جوچک:
کردوویە کام تیرەی مرۆڤ؟
کەڵەشێر:
سەویت زەمانی خرۆشۆف
مریشک:
لەو ڕۆژەوە ئەمە دیارە
بێ ترس بووین لە کۆلارە
جوچک تێکڕا:
لەسایەی سۆڤێت دڵشادین
لە چنگ کۆلارە ئازادین
مناڵەکان:
بێژن وەدەم چینەی هەرزن
کوردیش دەرچن لەدەست دوژمن
جوچک:
یاخوا دەرچن، یاخوا دەرچن
***

بەغدا ١٠/ ١٠/ ١٩٥٨: بەڕاستی زۆر دڵتەنگ و ناهومێد ببووم، پەیمانی بەغدا لە هەڕەمەدا بوو. هەروا هێچک ئەکێشرا و ئاڵقە لەگەلی کورد تەنگ ئەکرایەوە و هیچ دەرەتانی پشوودانی نەمابوو. کەچی لەپڕ سەرلەبەیانییەک بەدەنگی کوودەتای عەبدولکەریمەوە ڕاپەڕیم، بە دیاری کردنی مافی کورد پارشەوم کرد و بە مۆژدەی هاتنەوەی بارزانی بەربانگم کردەوە. لەیەکەم ئاهەنگێکا کە بۆ بەخێراتنی بارزانی لە «سالۆنی گەل» لە بەغدا گیرا. من ئەم شیعرەم خوێندەوە:

## پەڵەهەورێک

کورگەل کوڕی کوردی نەبەز
مەوەستن کۆوەبن بەلەز
دەس بگرن گۆوەندی گەلە
هەڵخەنە هەڵپەڕکێ هەلە
بابیلێن «دیلان» و «ڕەشۆڵ»
«خەمە» لێدا زوڕنا و دەهۆڵ
جێژنە و جێژنی ئازادییە
جێژنی مەرگی بێ دادییە
جێژنی چوونی ئیستیعمارە
ڕۆژی ترسی شا و بەیارە
دڵەکوتەی کوردخۆرانە
لەرزینی خاوەن زۆرانە
ئەفیوون کێش چورتیان پارەیە
ملیان خزمی سێدارەیە
بیلمەزی پیسی گوێ نەبیس
لێی ئاڵۆزا ڕیس و گوریس

***

بـــا ئـــارەقـــی ڕووی ئـــازادان
فـــرمـــێـــسکی شـــادیی دڵ شـــادان
نـەخـــــــوازە هی کـــــــۆنـە دیـلان
بـڕژێـتـــــــە نـاو کـــــــۆڕی دیـلان
بە گـــەرمـــیی دڵ و گـــرمـــەی پێ
بـۆخ بـکـا و هـەڵـمـی بـڵـنـد بـێ
لەعـــاســـمـــان ببـــێـــتـــە هەورێک
لە کـــــوردســــتـــــان بدا دەورێک
بـای ئـازادی بـیـــــــبـــــــزوێـنێ
لە چـیـــاکـــــانم خـــۆی بنوێنێ
لەســـــەر شــــاخی هەورامــــــانێ
داوەســـــــــتێ و بـدات وچـانـێ
بیـــبـــینن هۆزی جـــافـــرســـــان
بـابـزانـن بـاوی چـوو تـرســــــــان
پشـــوێک بدا لە بێـــســــتـــوون
تـا بـزانـێ ڕابـردوو چـۆن بـوون!
ئـاو هەڵ گـــرێ لە تـاقـــبـــوســـتـــان
ســـەرچاوەی ژین لە کـــوردســـتـــان
تـــەم لـــە ئـــەڵـــوەنـد بـــڕەوێـــنـێ
بـا بـۆ کـــــەس ســـــەر نەنـەوێنێ
بڕوانێـــتـــــە کـــانی ســـانان
جـــــێـگـە خـــــوێـنی پـاڵـەوانـان
بچـتـــە ســـەر گـــۆڕی قـــەدەم خـــێـــر

ئەو کیژە کوردەی نێرە شێر
باگیانی شادبێ لە گۆڕا
بێ خوێن ناچێ دەور گۆڕا
لەگەڵباخی، لە ڕەنگ ڕێژان
دەم شیرن کا تاڵی چێژان
بۆ تیلەکۆ، بەرەو هەوشار
موژدەبێ باویانە ئەو جار
لەسەقز لە جێی سێ داران
بڕژێنێ چەند تنۆک باران
تێ بگەن بەگزادەی شێرزاد
نێزیکە بستێندرێ داد
سەرێک هەڵبێنێ لە بانە
زۆر ئازان ڕۆژ ڕۆژی وانە
ببینێ سوێسنی و گەورکان
مەلکەمووتی فارس و تورکان
باپچتە مەڵبەندی مەنگوڕ
کوڕی بەگوڕی عەجەم دڕ
ڕۆڵەی بایز پاشا و باپیر
هەرچی بگری هەم شێر هەم شیر
لەدەشتی شنۆ و لاجانێ
ببێتە هۆی دنە دانێ
چی مامەش و هەرکی و زەرزان
گیان بۆ وڵات دەدەن هەرزان

***

سەر هەڵێنێ لە مەهاباد
پاتەختی کۆماری ئازاد
لەجێ دارەکەی چوارچرا
ئەو جێیی قازیی پێدا کرا
چەند دڵۆپێک هەڵوەرێنێ
خەو لە چاوان بپەڕێنێ
مژدە بۆ لاوان بنێرێ
نەمامی شۆڕش بدێرێ
بچێتە مەڵبەندی شکاکان
جێ ڕاوگەی ئازا و سوارچاکان
کێوی ئاگری داگرێ
ئاگری شۆڕشە و نامرێ
لە ساسۆن و لە چیای مازێ
تۆڵە ئەستاندن بخوازێ
بۆ سەر دەرسیم باداتەوە
خوێنی کوردان بشواتەوە
با گۆلی وان و دەریای ڕەش
بوکڵن وەکو خوێنی سیاوەش
لەسەر زاگرۆس بگرمێنێ
تورک و عەجەمان بدوێنێ:

***

خۆبگرن، نۆرەمە نۆرە
لە کوێتانە کارم زۆرە!

ئیقبال بمرە بە شاتەوە
وا ڕۆژی تۆڵە هاتەوە
هەتیوەکەی ڕەزا کەچەڵ
دەتنێرمە کن نووری و فەیسەڵ
نەقڵت نەقڵی شای مشکانە
عەقڵت عەقڵی سەر وشکانە
بۆژۆیە لام چاوڕاوت
دەتۆپی و ناکەومە داوت
ناسیۆنالیسمی موسبەتت*
دەیکەم بە سێدارە و پەتت
دنبەگی درۆت دڕاوە
سمایل ئاغام لە بیر ماوە
تۆڵەی هەمزاغای مەنگوڕم
دەستێنم، ورگت دەدڕم
خوێنی قازیت لێ دەستێنم
نیاگانت دەسوتێنم

***

ئێوەش ئەی گجوکی گەماڵ*
هاکا هەڵم نان بە تەماڵ
بۆ تۆڵە ساندن هەڕەتە
خوێنی کوردان یەک بە سەتە

---

* ساڵی ١٩٥٨ شای ئێران وشەی ناسیونالیزمی موسبەتی کردبووە دروشمی خۆی. نیاگان: باپیران.
* گەماڵ: مەبەست مستەفا کەمالە.

تۆڵەی شـێخ سـەعـیـدی پیـران
بەهەزاران شـێخ و مـیـران
شـێخ قـادر و غـەوسی سـانی
عـەبدولسـەلامی بارزانی
خـوێنی خـالیـد بەگم دەوێ
ڕۆژی بەخـتت کـەوتە شـەوێ
***
ئەو کـوردی بێ هێـز نەمـاوم
پشت ئەسـتـوورم ڕوونە چاوم
ڕێوشـوێنی خـۆم باش دەناسم
بۆتە برام کـەریم قـاسم!
قـاسـمێ کـە لێـو ڕاپەڕی
جـەرگی تۆ و ئامـریکای بڕی
تۆڵەی گـەلی ئەسـتـاندەوە
کـورد و عـارەبی ژیاندەوە
بوونە دۆسـتم مـۆسکۆ و پەکین
لەگـەڵ هێـزی گـەلان یەکین
***
گـەر بارزانی دێتـە بیـرتان
زۆر ئاو هەڵ دەگـرێ هەویرتان
بارزانیی تورک و عـەجـەم کـوژ
بارزانی مـەرگـە بۆ خـوێن مـژ
بارزانیی شـێـری کـوردسـتـان
گیان بەری، گیان لەسەر دەستان

بـــارزانـــيـــی داڵــدەی ئـــازادی
داسـی هـەژگـــــەڵی بێـــــــدادی
کـوتکە لەسـەر خـوێنمـژی کـورد
بـژی بـارزانـی، بـژی کــــــــورد
***

قاهیره ١٤/ ١١/ ١٩٥٨- له بەغداوه به قاهیرەدا بۆ مۆسکۆ دەچووم، کوردەکانی بەشی کوردی ڕادیۆ قاهیره هەلیان بۆ هەڵخستم کە وتار و شیعر لەسەر ڕادیۆ بخوێنمەوە، منیش ئەم شیعرەم کە هەر بە هۆی هاتنەوەی بارزانی نووسیوە لە ڕادیۆ قاهیرەوە خوێندمەوە:

## چەپکە گوڵێک

پەری هومـــێـــدی گـــەلی کـــورد
ئـەم ڕۆژانـە بـە دەســـــتـــــوبـرد
لێــــــو بەکـــــەن، بزە لـە چـاوا
لـەپـێـش گـــــــزنـگی هـەتـاوا
لەگــــــەڵ کـــــزەبای بەیـانـا
دەگـــــەڕا بە کــــوردســــتــــانا
لە هەرلا گـــــوڵ چنیی دەکــــــرد
دیـــاری بـــوو، بـــۆ دیـــاری دەبـــرد
***
لە بۆتـان گـــــولێکی هەڵکەند
دوو لــە ئــاوبــاریــک و دەربـەنـد
چلــێک لە دەرســیـــمی ســـەرشین
یەک لە مـــــهــــابادی خـــوێنین
لە قـەرقـامـیش، لە چیـای سـاسۆن

چنی گوڵی سووری بە بۆن
سووری بە ڕەنگی خوێنی دڵ
بەستی بە ئاوات چەپکە گوڵ
هێنای پێشوازی بارزانی
دەس بەتاڵی بە عار زانی
هەر گوڵ بەدەم هاوار دەکا
باسی دار و زۆردار دەکا
کزن لە ژیانی ژێر دەستی
داخ لە دڵن لە پێ پەستی
پێمان دەڵێن بە زمانی حاڵ:
کوردە بابەس بێ ژیانی تاڵ
زۆر شەرمە ئەو ژینە حیزە
کوڵی و سەرڕێژی کورد دیزە
گانا و گینیا ڕزگارن
کوردی مە هێشتا ژێربارن
ژێر چەپۆکەی شا و بەیارن
هێشتا بۆ یەکتر نەیارن
ئازا نین، باشە بیزانن
بەردەستی حیزی حیزانن
ئەگەر ئێوە ئازا و کوڕن
بزگورێک لەمە دادڕن
خوێنمان ڕژا لە ڕێی گەلا
میر و ئاغا و شێخ و مەلا

لاشمان هەر بۆیە کەوتە گۆڕ
نەمان دەویست بژین سەرشۆڕ
لە گیانی بەزۆر بردوومان
لەڕەگی دڵی زیندوومان
گوڵی سووری لە ڕەنگی خوێن
ڕووا. تا لەگەڵتان بدوێن
لێی هەڵمژن بۆنی خوێنێ
دنەو دا و بتان بزوێنێ
ئەوەی ئێمە لەڕێی مردووین
لە مێژوو نەمری کردووین
دەیسپێرین بەدەست ئێوە
ناشێ پاڵ کەون لە جێوە
مەژین بە تەنبەڵی و خەون
یان سەردانێن یان سەرکەون
ئێوەش شوێنی مە ڕەچاوکەن
نیشتمان بەخوێن پاراو کەن
کێ لە ڕێی گەل بچێتە خاکا
بەختەوەرە و زیان ناکا
بۆخۆ هەقی خۆ نەستێنێ
هەتا هەتا دادەمێنێ
ببیسن پەندێکی پیران
«بێ شێون بە هیوای جیران»
کورد ژێر چەپۆکە و هەژارن

بریندارن، لەبن بارن
دەربەدەرن، چۆن دەربەرن!
ئازا دەفریان وەرن
دەردی ئێمەو بێتەوە بیر
بیخەنە کار قەڵەم و شیر
ئەگەر لە دەستو دەرچێ هەل
دەکەونە بەر جنێوی گەل
جنێوی گەل زۆر چەتوونە
ناچنە ژێریەوە لێن ڕوونە
ببزوون کوردستان ئازاد کەن
هێزی داگیرکەر بەرباد کەن
شین بکەن داری ڕزگاری
بیگۆڕن باری هەژاری

***

مۆسکۆ ١٠/ ١٢/ ١٩٥٨- نوسەرێکی کوردزمان لەگەڵ چەند هەواڵێکی عەرەب بەر لە من چووبووە یەکیەتیی سۆڤێت. لە مۆسکۆ بیستم کە ئەو نووسەرە لە هیچ جێیەک باسی کوردستانی نەکردبوو. لای وابوو ئەمە پێچەوانەی باوەڕەکەی ئەبێ! تەنانەت وەختێ کوردەکانی یەریوان بەخۆشیی ئەوەوە هەڵپەڕکێیان کردبوو. گوتبووی «ئێمەش لە شیمالی عێراق ئاوا هەڵدەپەڕین». منیش ئەم دەمەتەقەیەم لەو بارەوە نووسیوە:

## دەمەتەقەی بایز و پیرۆت

مەرحەوا باپیر
پـ ـ بایز چت پێیە؟
باس و خواس چییە؟ باپیر لە کوێیە؟
بـ ـ چۆتە جێگەیەک: گەلێ پیرۆزە

جێگە هومێدی گش تیرە و هۆزە
هەر لێ قەوماوێک هەرچی دڵخوازە
لەوێ دەخوازێ جێگەی نیازە
پ ـ کەوابێ باسی کوردی کردووە
چی پێ داویستە ناوی بردووە؟
ب ـ کوردی چی! پیرۆت کوێنت دەبەر بێ
دەڵێی باپیریش هەر کوردپەروەر بێ؟
مام باپیر زلە هێندە ورد نییە
بۆتە عالەمی ئیتر کورد نییە!
بە زمانی کوردی فەرمووی: بێگانەم
لەچاوی کورد و کوردستان تانەم
پ ـ باشە خەڵکی دیش خۆ لە تەکیا بوون!
ب ـ باپیر تۆ لەکوێی؟ ئەوان جیابوون
ناو تیرەی خۆیان ئەبرد وەپانی
هروژمیان کردە داگیرکەرانی
باس عەدەنیان کرد باس عومانیان کرد
ئاورووی ئینگلیز و ئەمریکانیان برد
ئیتر لەو ناوە هەر گاڵە و قاوە
کورد نەبێ گش کەس ناوی لە ناوە!
یەکێ فەرمووبووی باباس عەجەم کەین
لەسەر کوردەکان ئەم زوڵمە کەم کەین
باپیرە چرچە وەک دار چەقی بوو
دەمی وەک تەڵە پێکدا تەقی بوو
وەسەر شێخ قەسەم مرقەی لێ نەهات

گوایە ئەمەیە نیزال و خەبات!
پ ـ خۆ ئێژن چووبووە گەڕی ڕەشبەڵەک
ب ـ وەگیان تۆ ئەویش هەر گەڕە و کەڵەک
کوردی ئەو ناوە کوردی تەواون
وەشیری شێران فرچک دراون
بۆ کوردەواری گەلێ بە تاسەن
بێ زڕە کوردن گش کوردە خاسەن
لە خۆشیی ئەمەی کورد چوونە لایان
جۆشی خواردبوو بەزم و هەرایان
زیڕەی زوڕنایان، ڕمبەی سەمایان
دەیهێنا جووڵە شێخ و مەلایان
باپیریش وتی: لەشیمال زەمین
هەڵپەڕکێمان هەس بەڵام زۆر کەمین!
پ ـ کەوابێ بایز مام باپیر زلە
زلە و زۆر زلە هۆبال بەو ملە!

* * *

گیرتسن، موسکۆ ١٩٥٩/٢/٢٨- لە سیناتۆری «گیرتسن» بووم لە نزیک مۆسکۆ. کچێکی کوردیزانی لینینگرادی نامەیەکی دۆستانەی بۆ نووسیبووم. بەڵام ئیمزا کەیم بۆ نەخوێندرایەوە، لە وەراما ئەمەم بۆ نووسیوە:

## وەرام بۆ کچێکی سۆڤیەتی

کـــیــــژە ڕووســـەکـــەی ناوت نازانم
نامـەکـەت گـەیشت قـەزات لە گـیـانم
ســــووریی دایەوە بە گـــۆنەی زەردم

گـــفـــتت هەتوانن بۆ چاری دەردم
منیش بە دیاری لە کـوردسـتـان ڕا
یانی لە وەڵگەی دیدە مـەسـتـان ڕا
لە چاوڕەشـــــان و لەبالا بەرزان
کولمە گەشان و نەشمیلە و تەرزان
پەیامم پێـــیـــە بۆ چاوی شـــینت
بۆ لێـــوی ســـووری بە پێکەنینت
مـــــاچم هێناوە بۆ دەمی تەنگت
ڕوانین لە بالای نەمـــامی شـــەنگت
تەمـاشـام پێـیـە بۆ کـولمی ئالت
دڵم دەترسێ لە دانەی خـــــاڵت
کـوردیش زۆر جـوانن بەڵام ئەسـیـرن
لە دەس داگـیـرکـەر بە جـوانی پیـرن
گـیـرۆدەی دەسـتی تورک و ئێـرانن
لەنگۆ داخـــــوازیی یاریدە دانن
ئەگــــەر وەکـــو تۆ ئەویش ئازاد بن
وەک هەموو گەلان دڵخۆش و شاد بن
لـە مـنـیـش دەتـارێ بـاری هـەژاری
دەکـــەومـــە کـــۆڕی یاری و دڵداری
***

سناتۆری گیرتسن، مۆسکۆ ١٩٥٩/٤/٢٣– ڕاسپاردەیەکی ڕادیۆی مۆسکۆ لە سناتۆری«گیرتسن» هاتە لام، داوای لێ کردم کە بەهۆی جێژنی یەکەمی مایۆ وەلامێک بۆ گەلی عێراق بنێرم، منیش لەگەڵ پێشەکییەکی کورتا ئەم شیعرانەم بە دەنگی خۆم تەسجیل کرد و شەوی ١٩٥٩/٥/١ سەعات ٩،٣٠ لە ڕادیۆ مۆسکۆڕا بلاو کرایەوە:

## پیرۆزبایی

لەمـــۆسکۆ مـــەکـــۆی ڕزگـــاران
لە ناو جـــەرگـــەی دۆست و یاران
لە پەنا کـــــۆشکی کـــــرملین
لە کن گـــــــۆڕی پاکی لینین
لە بەرانبـــەر ئەســتـــێـــرەی ســـوور
جێ هومـــــێــــدی نزیک و دوور
لەمـــــەیدانی ســـــووری شـــــارا
لە ڕۆژی جـــــــێـــــــژنی ئەیارا
گـــوڕەی ملیـــۆنهـــا کـــارگـــەر
کـــــە کـــــردەیان هاتۆتە بەر
بەرەو عـــێـــراقی ئازا و گـــورد
بۆ کـــۆمـــاری عـــەرەب و کـــورد
بەرێ دەکــــەین پیـــــرۆزبایی
پەیمان بەســـــــــتنی برایی
شـــاباشی چەمی ڤـــۆڵگا و دۆن
پێـــشکەش بە زەڵم و تانجـــەڕۆن
پیـــرۆزبایی نیـــڤـــا و ســـەیحـــوون
بۆ فــــورات و دەجلەی دڵ ڕوون*

---

* زەڵم و تانجەڕۆ: دوو ڕووبارن لە کوردستانی عێراق. ڤۆڵگا و دۆن و نیڤا و سەیحوون: ڕووبارن لە یەکیەتیی سۆڤیەت (ڕووسیای ئێستا).

کــــرێکاری عــــەرەب و کـــــورد
ئـازاد بـژیـن دوژمـنـو مـــــــــرد
بەرەو پـێش ببــــزوون بەرەو پـێش
لە کـــــەس نەوبێ ترس و ئـەندێش
کێ لەگــەڵتـــان بە گـــێــچـــەڵە
بە دەست و پــێ کـــــــەوتـە تـەڵـە
بـزانـن ئـێــــــوە نـە تـەنـیــــــــان
دۆســـــتـی ئازادیخــــوای دنـیــــان
دەســــتــمـــان لە دەســـتی یەکــدایە
مــــــەڵـێـن دوورە ئـەو مــــــەودایە
مـــحــــەببـــەت دووریی بۆ نـیـــــە
فــەرقی بەغــدا و مــۆسکۆ چیـیــە!

***

مۆسکۆ ۱۹۵۹/۷/۸- لەبەغدا جێژنی یادی یەکەم ساڵی شۆڕشی
١٤ تەمووز و دامەزرانی کۆماری کوردو عەرەب ئەکرا. لە مۆسکۆڕا ئەم پیرۆزباییەم نارد و لە ڕۆژنامەی خەباتدا چاپ و بڵاوکرایەوە:

## پاڵەوانێک

شـــــــــەوێ ڕەش وەک دڵـی زۆردار
مات، بێ هەست، وەک بەختی هەژار
ســەرخـۆش و بێــهــوشن پیــاوکــوژ
لە خـــەودان زگـــزل و خـــوێنمـــژ
لە نـێـــــوان خــــانـەقین و فــــــاو
ســـــوور و تەڕن ملیـــۆنـهـــا چاو

بێ خــەو، خــوێنیـــان تێ چڕژاوە
چـــاوی دایـــکـــی دڵ بـــــڕژاوە
دیدەی ســـــاوای نیـــــوە مـــــردوو
بێ دایک و باب پێـــوەند کـــردوو
گـــــەلێـک چاوی لاوی گــــــەلمان
لە باقـــووبە و نوگـــرە ســـەلمان*
پڕخـــــــوێـن غـــــــەزەب دەبـارن
خـوێنەخـۆری ئیـسـتـیـعـمـارن
کـــزەی شـــەمـــاڵ، ســـۆزەی زریان
دڵ گـــــــەرمـن بە ئاه و گـــــــریـان
ئەو بۆ شـیـمـــال، بۆ جـەنووب ئەم
دەم بـە ناڵـە، دڵ پڕ لـە خـــــــــەم
دەجلە و فــــورات بـەیەک دەگـــــەن
دەردەدڵ لای یەکـــــتــــــر دەکـــــەن
ئەو لە ســــوێی کـــورد وێڵ و شلوێ
ئـەم لـە دەردی عـــــــــــەرەب دەدوێ
یەکـــتــــــری دەگـــــرنە هامـــــێـــــز
بە یەک بوون دەبنە خــــاوەن هێـــــز
* * *
لە جـــەرگـــەی ئەو شـــەوی ڕەشـــا
ڕەشی چی! لەو ڕۆژەی گـــــەشــــا

* زیندانی باقووبە و نوگرە سەلمان: دوو زیندانی زۆر سەختن لە عێراق.

پێ بە عەرزا کوتانێک دێ
نەعرەتەی پاڵەوانێک دێ
عەبدولکریم دەگوڕڕێنێ
قەڵای بەدکار دەلەرزێنێ
سەرخۆشان ئەغیار دەبنەوە
بێهۆشان هوشیار دەبنەوە
ئەوانە خوێنمژی گەلن
چی زگ زل و تەوەزەلن
ئەوانەی ئێمەیان دەخوارد
خۆیان لە مافی گەل دەبوارد
وا کونە مشکیان پێ تەنگە
لاقی هەڵاتنیان لەنگە
گشتی دزەو گای خۆی دەوێ
چارشێوی ژن بەر ناکەوێ
یەک لەسەر هێلکان کەوت کڕ
یەک کەوتە سەر پرزەی ئاخوڕ
تەزین هەموو دز و قزە
ڕێگەی بڕا فێڵ و گزە
بابڕووخێ کۆشکی پاشا
هەنگاو بنێن بەسەر لاشا
لاشەی سەگەلی ئیستیعمار
زۆر لەبارن بۆ پەت و دار
پاڵەوان عەبدولکەریمە
دوژمن پڕ لەترس و بیمە
* * *

ڕۆژی چاردەی تەمووز، شۆڕش
لەسێ چوار وشەدایە گش
بەڵام مانای گەلێک زۆرە
پادشا خۆرە، زۆری شۆرە
بۆ داگیرکەر ژەقنەمووتە
نانی برسی و بەرگی ڕووتە
بۆ خوێنمژان ژەهری مارە
یاری گەلانی ڕزگارە
بۆنان پێزە، بۆ کز هێزە
شەڕ کوژە و ئاشتی پارێزە
لە نەدار پیشە و هونەرە
لە نەیار شیر و خەنجەرە
بۆ بێکاران پارە و کارە
بۆ جوتیاران زەوی و زارە
لەش ساغیە بۆ نەخۆشان
مەرگە بۆ گێچەڵ فرۆشان
ئازادیی پێنووس و دەمە
تابێژی و بنووسی کەمە
پاڵەوان عەبدولکەریمە
قایم دادەڕژێ ئەو هیمە

***

شۆڕشی گەل لە گەلاوێژ
وشەی کورت و مانای درێژ

یەک بوونی عەرەب و کوردە
ڕێک بوونی درشت و وردە
نەمانی کۆنەپەرستان
بەرگیری لە بەرهەڵستان
گەڕانەوەی بارزانییە
خێرە و خۆشی و هەرزانییە
مرداربوونی شەووافانە
بەشداربوونی بێ مافانە
ئامریکا ڕووگرژ و مۆنە
بامرێ ئەمریکای کۆنە
نەخۆش کەوتنی ئینگلیسە
لە ترسی دوارۆژمان سیسە
فڕێمان دا لەمپەر و کۆست
مۆسکۆ و پەکینمان بوونە دۆست
عێراق کە ئازادە و شادە
جێی دادە قیبلەی مرادە
بۆ کوردی دیکەش لە لاوە
موژدەی ئازادیی هێناوە
بەرەو خۆشبەختی چوون هەڵە
شۆڕشە و شۆڕشی گەلە
پاڵەوان عەبدولکەریمە
چینی هەژار نەڵێ: نیمە
***

مۆسکۆ، سناتۆری گیرتسن ٣٤/ ٧/ ١٩٥٩- ئایزەنهاوەر بۆ گەلی ئەمریکای پێشنیار کرد کە لە ڕۆژی ١٧/ ٧/ ١٩٥٩ڕا تا ٧ ڕۆژ نوێژ بکەن بەڵکو خوا گەلە ئەسیرەکان ڕزگار بکا. منیش بەو هۆیەوە لە زمان سەرەک تەشریفاتی نوێژەوە ئەمەم نووسیوە:

## شەیتان دەڵێ ئامین

سواربن لە گەڕۆک و فڕۆک
بۆ دەوروبەری «لیتڵ ڕۆک»
با «کۆکس کلان» نەسرەوێ
چەرمی چەند ڕەشێکمان دەوێ
بدرووین کەوایەک ئاوداوێن
تەقەڵ ڕەگ، پەراوێز لە خوێن
پیاوی گەورە بۆتە کەشە
پێویستی بەبەرگی ڕەشە
بنکەی شەڕێک ئاوپڕژێن کەن
ئاوپڕژێنەکەی بەخوێن کەن
لە پرچی ژنی کۆریا
لێی ڕاخەن بەرەو بۆریا
بگەن بە ماوەی کەلاکی
«هیرۆشیمی» و «ناگازاکی»
لە چەند هەزار کەللە سەرێک
بەرز کەینەوە مینبەرێک
لە ئەشکی چاوی هەژاران
کە ماڵمان کردن بۆمباران
پڕکەن شووشێکی شووش و قۆز
ناوی بنێن ئاوی پیرۆز

وڵامێک بنێرن بۆ جوو

شەڕیان بە چەکی ئێمە بوو

بەیاری ڕاستیان دەناسین

بابچنە قەبیە و دێریاسین

لوولاکە موسوڵمان باشن

لەو خاچێکمان بۆ بتاشن

هەڵکۆڵن چاوی هیندیی سوور

بیکەن بە تەزبیح و بەرموور

بۆمبای هیدرۆژینی خاوێن

لەوانەی زۆر پێمان ناوێن

پڵیتەکەی لێ دەرێنن

بخوری پێ بسووتێنن

پیاوە گەورەکە نوێژ دەکا

نوێژێکی زۆر درێژ دەکا

***

لە «مارس» دەپارێتەوە

هەرگیز شەو نەکوژێتەوە

چەکفرۆش گیرفانی پڕ کا

فەرانسە جەزاییر قڕ کا

کایشک بچێتەوە چینێ

خەونی تریاکیان ببینێ

کۆریا بۆ «سینگمان ری» بێ

زۆر خەریکی زۆرکەری بێ

هەروابن عوممان و عەدەن
ئینگلیز دەستیان لێ بەرنەدەن
دەرنەچن کوردی ماڵ وێران
لەبن چەنگی تورک و ئێران
با کوردستان ڕزگار نەبێ
له مافی ژین بەشدار نەبێ
پیاوە گەورەکە نوێژ دەکا
بە نوێژان دنیا گێژ دەکا

***

تارماییی ماکارسی و دالاس
هەڵ دەوەستن لە چەپ و ڕاس
مەرگ خواز و دوژمنی ژین
دەگەڵ شەیتان دەڵێن ئامین

***

مۆسکۆ، گیرتسن ١٤/ ٨/ ١٩٥٩- دەمێک بوو پێوەبووم دەربارەی شەهیدکرانی پێشەوا قازی محەممەد و هەوالآنیەوە شینێک بگێڕم. بەڵام هەلێکی وام بۆ نەدەرەخسا. لە سناتۆری گیرتسن لە مۆسکۆ. هەلم بە دەرفەت زانی و ئەم شەپۆڕنامەم لەژێر ناوی «ڕۆژێکم هەیە»دا بە دووتابلۆ نووسیوە:

## ڕۆژێکم هەیە

### تابلۆی یەکەم

### شەوی ڕەش

لە ناو دڵی ڕەشی شەوا
مەردم لە غورابی خەوا
دنیایەکی مات و کشە
نە هەستە نە چرپە و خشە

هێندێک هەوری ڕەش و بڵاو
چەند ئەستێرەی زەردهەڵگەڕاو
بووبووی کوندێک لە کەلاوێک
زیزەی سیسریکە تاوتاوێک
سێ چوار دارتاش لە بێکاران
چاو پڕ لە خەو لە بێگاران
دەبیسرێ لەوان جارجارێک
خرتەی تەشوێیەک، مشارێک
چەند سەربازێک ڕاوەستاون
بەزۆر بەسەرباز گیراون
زۆر لەوانە زۆر لەڕێی دوور
قامچی پێچی کردوون مەعموور
دایکێکی پیر، وردە منداڵ
ماون لە ماڵ پەرێشان حاڵ
کاتی دروێنە و دەسکەنە
زەوی و زاریان بێ خاوەنە
نازانن بۆ ڕیزکراون
لە دیار چ کارێک وێستاون!

ڕێ و شوێنی جەنگەڵ

لە مەیدانەکەی «چوارچرا»
داری سێدارە هەڵخرا
دووی ئینگلیز و ئامریکایی
دێن، دەچن لە تاریکایی

چەند عەجەم لە شوێن ئەو جووتەن
وەک تولّەن، بە کلکەسووتەن
بۆ ئێسکێ بۆ پاروێک بەرماو
چیان پێ بڵێن دەس لە بان چاو
دێتە پێش یەکێ ترسەنۆک
دەنگ نزم، بە دەستی لەرزۆک
چاوێک لە میستر، بە چاوێک
دەخوێنێتەوە نووسراوێک
لە ئینگلیسی تەرجەمەیە
کوردی و کورتیەکەی ئەمەیە
«ئێمەی سپی پێستی پیاوخۆر
ئێمەی خوێنمژی خاوەن زۆر
بە ڕێوشوێنی ورچ و مەیموون
ئەوی لە جەنگەڵ ژیان و چوون
بڕیارمان لەسەر ئەمەیە
ئەم سەرزەوییە موڵکی مەیە
کێ زەرد و ڕەش و ئەسمەر بن
دەبێ بۆ ئێمە نۆکەر بن
بێ هێز مافی ژینی نییە
ماف داواکەر دینی نییە
کێ ئازادی لە دڵدا بێ
گەرەک لاشی لە گڵدا بێ
کەسێ نیشتمان پەروەر بێ

یـــان بمـــرێ یـــان دەربـــەدەر بـــێ
لـەم ســـــــەرزەمـــــــینـە ئاو و بـەژ
کـانگە و گـژ و گـیـا و دەشت و کـەژ
کـــوێ زۆر بەبەهرە و بە پیــــتــــە
بەش و بەهرەی والّســــــتــــریتــــە
جـۆنبـــۆڵیش لە هەشــتێ مــشــتێ
لە کــەرســتــەی کــۆشکێ خــشــتێ
چۆن کــــــورد و ئـازربـایـجــــــانـی
خـــــۆیان بە خـــــاوەن مـــــاڵ زانی
پەندی ئامــــــریکایان نەبیــــست
ئازادی و ســەربەســتـیــیـان دەویست
دەبێ بچنە پای ســــــێــــــــدارە
مــــەرگــــیــــان بۆ ئێــمــــە ناچارە»

پاڵەوان ناترسن

دەرگـــــای شــــێـــــران کـــــرایەوە
دار و بـــــەرد دەنـــــگـــــی دایـــــەوە
گـــــوێ لە زرەی زنجـــــیـــــــر بگرن
پـــــاڵـــــەوان نـــــاتـــــرســـــن بمـــــرن
بـۆ مـــــــــــــەرگ دێـن بـە ئـازایـی
دەڵـێـی دەڕۆنـە ســـــــەرشـــــــایـی
مـــــــــــەردانە هـەنـگـاو هـەڵـدێـنن
بـەدکـــــــــــار بـە تـونـدی دەدوێـنن
ڕووگـــــــــرژن بـەرانـبـــــــەر دوژمـن

دەم بــە بـزەن بــەرەو مــــــــــــردن
وا پـێـــشـــەوای کــــوردان، قــــازی
پێـــشـــەوایە بۆ گـــیـــانبــــازی
گــورەی مـــاتیی شـــەو دەشکێنێ
دڵـــــی زۆردار دەلـــــەرزێـــــنـــــێ
ژینی نەمر
بەخــــــتـــــەوەرم هەڵکەوت هەل
خــــۆم دەکـــەم بە قـــوربانی گـــەل
دەڕۆم بـەرەو ژیـنـی نـەمــــــــــــر
لـە ژیـنـتـــــــان دەبم بـە ئـاگـــــــر
تا کـــــوردێک مــــاوە لەشــــوێنێ
دەکـــــۆشێ تـۆڵـەم بســــتــــێنێ
مـن زیـنـدووم و دوژمـن مــــــــردوون
ئێـــوە من ئیـــعـــدامم کـــردوون
کـــەی لە پاش من بێ خـــەم دەبن
هەر کــوردێک یەکـــێکە وەک من
مــــردن لەڕێگەی نیـــشـــتـــمــــان
ســـەر بەرزییـــە بۆ گــشــتــمــــان
بیر ناکوژرێ
لـــــەدوای ئـــــەو بـــــرا و بـــــرازا
دەچنە پێش ســــــــەربەرز و ئازا
ســـەیفـــە بانگ دەکـــا: کـــوڕینە
بەرخی نێـــــــر بۆ ســــــــەربڕینە

مەرگێک لەڕێی نیشتمان بێ
سەد ژیانی بەقوربان بێ
ئاواش نەبا هەر دەمردم
کەسیش یادی نەدەکردم
بەومەرگە زیندوو دەبمەوە
تازە کەی لەبیر دەچمەوە!
لاشمان کە سەر دەنێتەوە
بیرمان هەر دەتەنێتەوە
هەموو تنۆکە خوێنێکمان
ڕزگاربوونە بۆ شوێنێکمان
جۆشی خوێنی مە ناسرەوێ
تا سەربەستی دەست دەکەوێ

## دەسمایەی دوارۆژ

لەو مانگی سەرە بەهارە
چەند لاو چوونە پای سێدارە
نێژران بۆ دوارۆژ داخ لە دڵ
تۆوی دوارۆژ کەوتە بن گڵ
گۆڕی لەوان بەجێ ماون
هێزی دڵن، سۆمای چاون
بەڵگەی مافی کوردەوارین
مۆری قەباڵەی ڕزگارین
کێلیان بۆمە داری ئاڵان
گەنجێکن ناچن بە تاڵان

بۆ کـــوردی هەژار ســـەرمـــایەن
بـۆ دیـواری خـــــــەبـات پـایـەن
***
تابلۆی دووهەم
گوڵی وەریو
پـــایــــزە، وڵات ڕەنــــگ زەردە
شنـەبـا هەنـاســــە ســـــەردە
پـەلـکـی گـــــــوڵـی ئـاڵ وەریـوە
لە پاش گـــوڵ بولبـــول هەتیـــوە
دەگـــری بۆ ڕۆژانی پـێــشـــووی
بۆ بەخـــتـــەوەریی لە دەس چووی
بۆ خـونچـە و گـوڵی گـوڵسـتـان
بۆ مــێــرگ و باخی کــوردســتــان
نـاڵـەی گـــــــەڵا بـە دەم بـاوە
وەک ژنـە بـیـــــوبـاو کــــــوژراوە
لەم کــــوردســـتـــانە ڕەنگینە
کــە لە ســوێی لاوان خــەمگینە
بەرچـاو دەکـــــەوێ بەرچـاوێـک
لەبەر پـاڵێـکە کـــانـیـــــاوێک
ڕوون، وەک چاوی پیـــاوی خـەبات
خـــــوڕەی خــــەندەی دڵ پڕ ئاوات
کـــەف ســـپی، ســـاردە وەک تەرزە
پشـــتـی کــێــوێکی ســـەربەرزە

پێشی دیمەنی دەشتێکە
دەشتی کوردە و بەهەشتێکە
بۆ پشوو، سانەوە تاوێک
لێی دانیشتوون پیر و لاوێک

### لاو خوێن گەرمە

لاو شوانە بە شان و باهۆ
زۆر خوێن گەرم و شایی بەخۆ
فەرەنجی لەبەر، پێ خواسە
دەرپێ پڕ پینە، بێ کراسە
چەکی خەنجەرە و گۆچانە
بلوێری لەسەر لێوانە
هەوای بلوێر بە خەمباری
شیوەنیە بۆ کوردەواری

### پیر دڵ نەرمە

پیر وەرزێرێکی هەژارە
کەوای جاوە کڵاش خوارە
پێچی لە چڵکا خنکاوە
تەپە کڵاوەکەی دڕاوە
ڕانک و چۆغەکەی شڕۆڵە
پشتێندەکەی دوو تیتۆڵە
ڕەنگ زەردە لەبەر بێ نانی
پڕ دەردە لە بێ خودانی

چاو پڕووش، هەناسە سوارە
دیارە زۆر دڵ بریندارە
فرمێسکی دەوەرن لە چاو
تێ هەڵ دەکاتە بەند و باو

رەنجەڕۆیی

لێ لێ، لێ لێ، لۆلۆ، لۆلۆ
دەک لاڵ بم کوردستان بۆ تۆ
ساڵ درەنگە و خەزەڵوەرە
گەیشتنی میوە و بەرە
خەرمانی گەنم کۆکۆیە
ڕەنجبەرەکەی ڕەنجەڕۆیە
باسکی کوردە چاندی و چنی
بەتاڵان دەیبا دوژمنی!
ترێی ڕەزی من گوشراوە
خوێنم لە کووپان کراوە
من دەکۆشم، ئەو دەنۆشن
من پەرۆشم، ئەو سەرخۆشن
ئارەقەم بۆ تووتن دەڕژێ
زۆردار بەفیز هەڵی دەمژێ
خوری و لۆکەم چوون بە فیڕۆ
دەسووتێم لێم نایە بۆسۆ
نەوتم دنیای کۆکردەوە
جێی خۆم هەر تاریکە شەوە

زۆری لێکراو بم هەتا کەی!
چاو لەو ڕۆژەم بڵێیم ئۆخەی
بلوێر بۆی دەلۆرێتەوە
پیرە بۆی دەگێڕێتەوە:

ناهومێد نیم

لۆلۆ، لۆلۆ، لێ لێ، لێ لێ
من دەیڵێیم بەدکار گوێی لێ بێ
ئەگەر سەد هێندەش هەژار بین
بێ پەنا و پشت و داژداربین
بێ هومێد بۆی دانامێنین
هەردەبێ هەقمان بستێنین
بیستوومە لە کۆنە پیاوان
پەندی پیران لەسەر چاوان
گەنمت کە دانیدا دیاری
تا نەیخۆن چورە و پاساری
داوەڵێکیان بۆ بچەقێنە
بیان ترسێنە، بیان تارێنە
کوللەت کەوتە ناو شینایی
بۆی بێنە ئاوی خەزایی
لەناو زەوی بی پرژێنێ
قڕ دەکا و دوایی پێ دێنێ
داگیرکەرانی وڵاتم
کوللە و چورەن بۆ داهاتم

دەمیان نایە کوردستانم
بێگانەن بەربوونە گیانم
بلوێر وەرام دەداتەوە
پیرە تێ هەڵ دەکاتەوە

### داوەڵ کێلە

لۆلۆ، لێ لێ، لۆلۆ، لێ لێ
با داگیرکەر دەرکەوێ لێ
بۆ پیاوخۆر و گەنم و جۆ خۆر
بۆ خوێنمژانی خاوەن زۆر
داوەڵ کێلی پیر و لاون
لە ڕێی ئازادی کوژراون
کێلی سەرگۆڕی شەهیدان
گیانبەخشان، ئازا و ڕەشیدان
داگیرکەران دەتارێنێ
شوێنەواریان لەبنە دێنێ

### خوێن ڕژاوە

کوللەی ئەوبەری دەریایە
لەناو نیشتمانمدایە
ئاوە خەزاییەکەی خوێنە
پەڵەی خوێن لە هەموو شوێنە
لە دەرسیم، مازێ، ئاگری داغ
بارزان، سولەیمانی، سابلاغ
لە سەقز، بۆکان، لەهەرکوێ

نەک لە کوردستان، لە هەرجێ
لە دەوری مەراغە و تەورێز
گڵ زۆری گرتوونە هامێز
پێدا بچۆ هەتا تاران
بست بست کێلن لەسەر یاران
شوان دە بلوێر دەتووڕێنێ
پیرە دیسان دەنگ هەڵدێنێ

هاودەردە زۆرن

لێ لێ، لۆلۆ، لێ لێ، لۆلۆ
نەک هەر لێرە، زۆر دوور بڕۆ
لە ئەفریقا، لە ئاسیا
هەرگۆڕن لە گۆڕ و چیا
لە عێراق، لە تونسی شین
لە هیند، لە چین، لە هیندوچین
لە مەلایا، لە کۆریا
لە جەزاییر، لە کینیا
لە ئەندۆنیزی، لە یەمەن
لە میسر و عومان و عەدەن
بە هەزاران، سەد هەزاران
لە چۆڵگان لە لادێ و شاران
کوشتەی دەستی ئیستیعمارن
گشت کەس وەک ئێمە داغدارن
جێ نەماوە لە گشت لاوە

خوێن ڕژاوە، کێل چەقاوە
پاش ماوەی ئەو کوژراوانە
ئەو هەموو پیر و لاوانە
گشتی توورە و تۆڵ ئەستێنە
چاویان داگیرکەر ترسێنە
بۆ کوێ هەڵدێن خۆڵیان وەسەر
وا داری هومێد هاتە بەر
ئەودڵ بریندارانە گشت
لەیەکتر دەبنە پەنا و پشت
من داس، تۆ گۆچان و خەنجەر
مام خاڵە و کوتکی ئاسنگەر
ئێمەش ڕەگەڵیان دەکەوین
خوێنەخوێی خاوەن نەتەوین
خوێنمان نەڕژا بەخۆڕایی
ئێمەی کردۆتە خەزایی
خەزایە داگیرکەر کوشتن
قڕیان دەکەین بە خوێن ڕشتن
تۆڵەی شەهیدان دەستێنین
کوردستانمان دەڕەنگێنین
پڕی دەکەین لە بەر و بۆ
وەک یەک بێ، بەشی من و تۆ
ئاسنگەر و شوان و جووتیار
خۆش دەژین لە دنیای ڕزگار

هەی لۆلۆیە هەی لێ لێـــــیـــــە
لە کـوردسـتـان خـۆشـتـر کـوێیـە!

***

مۆسکۆ، گیرتسن ١٩٥٩/٨/٢٠- ئەم نامەیەم لە مۆسکۆ ڕا بۆ سەید کەریمی ئەیوبی مەهابادی و، مامۆستا قەناتی کوردوییڤ و وئیرا ناو، کە کچێکی ڕووسی ڕۆژهەلات ناسە، ناردووە:

## پەیکێک

لـــە ئـــاواتـــی هـــەژارێـــک
بـا دروس کـــــەیـن بـاڵدارێـک
بـاڵـنـدێـکـی ڕەنـگـین تـووک
دەنووک چووک و ئێـسک سـووک
لـە بیـــــری ورد، لـە خـــــەیاڵ
لـێی بنـێین جــــووتێ شـــــاباڵ
بێ تـرسـی چـەتـە و گـــــــۆران
گـــــــــوێ نـەداتـە بـاو بـۆران
بفـــــــڕێ بـۆ دنـیـــــــای ئـازاد
بـۆ شـــــــــــاری لـیـنـیـنـگـراد
لـــیـــنـــیـــنـــگـــرادی ئـــازا
شـــــــــــەپۆڵ دەدا لــە نــازا
ئـەو شـــــــــــارە پـاڵـەوانـە
بەناوبانـگی جــــیـــــهـــــانە
لە جـــەنـگا ببـــووە لەمـــپـــەر
شکاندی ســـــەری هیــــتلەر

ڕۆڵەی ئازا و سەربازی
شێواندی نازی نازی
پیرۆزتر جێی زەمینە
جێ خەباتی لینینە

* * *

جا ئەی مەلی بیری ورد
پەیتی هەژارێکی کورد
باش بگەڕێ بە شارا
بڕوان بە چوار کەنارا
بفڕە بەو دیو بەم دیوا
دەندووک تەڕکە لە «نیوا»
قەسری قەیسەر ببینە
خۆت مڕ بکە لە چینە
ئێستا جێی هەژارانە
نەخانی زۆردارانە
نە جێگەی خوێنمژانە
جێگەی خوێنمژ کوژانە
گەر لە جێ خەو دەپرسی
مەهێنە دڵ مەترسی
سێ ئاواڵم لەوێ هەن
بابۆت باس بکەم کێهەن
یەکێ بۆری ڕەش تاڵە
ناقۆڵا و بێ فەساڵە

سەیدێکی گوناهبارە
بە پیادەیی سوارە
سەری پڕە لە پەڵە
بە گێچەڵە کەچەڵە
خوێن شیرن و ڕووح سووکە
زلە و بە باڵا چووکە
ئەیوبیە و کەریمە
بن چینەی دڵخۆشیمە
دووهەمیان مامۆستایە
چقاس بێژێ هێژایە
زانایاکە هۆزانە
جێ هێڤیا کوردانە
ولۆ بیر نەبەی پیرە
دڵێ ڤی خۆرتە، ژیرە
لجەم مە پڕ مەزنە
ڕۆهنیا چاڤێن منە
ئەو کوردێفە قەناتە
پەلهەوانێ خەباتە
ئەویتر کیژە ڕووسە
خاوەن بیر و بنووسە
زۆر جوان و شۆخ و شەنگە
دڵ ڕفێنە چەلەنگە
ئیرای لینینگرادی

وێرای هێزی ئازادی
بۆ کوردستان دەکۆشێ
بۆ کورد دڵی دەجۆشێ
بۆ وچانی شەوانە
جێ خەوت لای ئەوانە

***

بێژە بەهەر سێ یاران
با کۆڵ نەدەن چ جاران
خەڵکی سۆڤێت بدوێن
با کۆمەڵێک پێک بێن
بۆ یاریدەدانی کورد
گشتی لە ناو بەندا مرد
کۆمەڵە هەن لە هەر دەر
بۆ بەزەیی جانەوەر
ئەگەر ئێمە بەشەرین
یان تیرەی جانەوەرین
بۆ کەس نامان پارێزێ!
بۆچی نایەینە ڕێزێ!
ئەو کوردی ئازا و بەکار
ژێر چەپۆکەی شا و بەیار
دڵخۆشێکیان دەنەوە
دەروێکیان لێ پکەنەوە
تۆزێک چەکمان بدەنێ
کەسمان ناوێ، بە تەنێ

نەیاران دەتۆقێنین
بەیاران دەتۆپێنین
هارتەر و ئایزەنهاوەر
ناتوانن ببنە لەمپەر
بنکەی شەڕیان شڕ دەکەین
ماری گەڕیان سڕ دەکەین
کێ هوروژمو بۆ بێنێ
دەیڕەنگێنین بە خوێنێ
پەیمانی جەنگی گلاو
بە کوردان دەکرێ بلاو

***

مەلی بیری هەژاران
کاتی دیدەنی یاران
لە شەقام و لە کۆڵان
دڵ نەدەی بە کچۆڵان
کارت هاتە کۆتایی
بخوازە ماڵئاوایی
هەڵبفڕەوە بێ درەنگ
بۆ لای هەژاری دڵتەنگ
لە دڵمایە هێلانەت
وەرەوە هەژار خانەت
تا پێکەوە بخوێنین
هەر ئێمە پێک دەمێنین

***

مۆسکۆ، گیرتسن ٨/١٠/١٩٥٩- خرۆشۆف سەرەکی ڕووسیا چوو بۆ ئەمریکا و لە جێگەیەک بەناوی «کەمپ دێڤید» چاوی بەسەرەک کۆماری ئەمریکا کەوت. زۆر کەس هومێدی زۆری بە ئاشتییەکی هەموانی پەیدا کردبوو، بەو هۆیەوە منیش ئەمەم نووسیووە:

## لکە زەیتوون

لە هەزاران و هەزاران سالا
ڕەنجبەر مابوو لە ژینی تالا
خستبوویانینە کۆت و زنجیر
کاهن و خان و قەڕاڵ و بەگ و پیر
یەک کوڕی خوا بوو، یەکێ فەرخەی مانگ
یەک بەهەشتی لە دەسا بوو شەشدانگ
بە درۆ خێوی جنۆکە و ئەستێر
دەمی وان ببووە تەرازووی شەڕ و خێر
پاری وان گۆشت و بەشی مەش کوشتن
ئەو مڕی مەی، لەمە خوێناو ڕشتن
لەمە چەوسان و لەوان خۆبواردن
بۆمە برسیایەتی، بۆ وان خواردن
لە کەم و زۆری جیهان بێ بەش بووین
بە تەنێ خاوەنی چارەی ڕەش بووین

***

تا لە پڕ نەمری بلیمەت لینین
دەستی دا شۆڕشی گەورەی خوێنین
مێژوو وەرچەرخێ بەلای کارگەدا
دەم لە پووش بوون تەوەزەل، دەم بە هەرا
وەرگەڕا باوی کرووسینی هەژار
کەوتە بەر لینگی نەدار تانجی تەزار

دەستی دا کۆشش و کار ئەم چینە
کاری بە کوێ گەییوە بی بینە!
کەم لە نێو چەرخە ئەمە ڕووی داوە
سەری دنیا لەسەری سوڕ ماوە
خاکی خۆی کردە بەهەشتی ڕەنگین
ون بووە ناوی پەشێو و خەمگین
پەیتی ئەو باجی لە ڕۆژێ ئەستاند
مشتی ئاسنینی سەری مانگی شکاند
بەینی ئەستێرە دەپێون بست بست
هەرچی بەرزاییە دەکرێن پێ خوست
مانگ چییە! ئێستگەیە و جێی دێڵن
مارسی خوای شەڕ زەوییە و دەیکێڵن

***

ئەمەیە هێزی کۆمۆنیزمی مەزن
کۆلەدار لێی وەڕەزن، پێی دەتەزن
هێز ئەوەندە زۆر و بە هێز نانازن
بەسە شانازی کە ئاشتیخوازن
نایەڵن جەنگ لە جیهان بەرپا بێ
چەک فرۆش چی لە دڵا بێ نابێ
لکە زەیتوونی کرێکاری ڕەشید
فێنکیی خستۆتە هەوای کەمپ دێڤید

***

مژدە بێ بۆ گەلی هێشتا بێ بەش
تیشکی لینین دەڕەوێنێ شەوی ڕەش

ڕۆژی مـــەش دەردێ لە ناو هەور و تەمـــا
باوی فـاشـیـسـتـیی و گـەل خـۆری نەمـا
کـــورد دەگـــەڵ فـــارس و تورک و عـــەرەبا
ســـــەربەخـــــۆ دەبن و برا و پشت و تەبا
یادی ئۆکـــتـــۆبەر و بە زۆردار وەســـتـــان
جـێـــژنە دەگـــرین لە چیـــای کـــوردســـتـــان

***

مۆسکۆ ١٩٥٩/٨/٢٧- وێنەیەکی خۆم بە یادگار داوە بە مستەفا سەلماسی لە مۆسکۆ ئەمەم لە پشتەکەی نووسیوە:

## پێشکەش

بـۆ بـیـــــــــــرەوەری ڕۆژێـک لـە ڕۆژان
کــــــاکـــــــە ئـەم وێـنـەم بـا لات بمێـنـێ
مــــنـــــی هـــەژار و دەربـــەدەر و وێــــڵ
هەر ڕۆژ لە جـێـیـەک، هەردەم لە شـوێنـێ
کێ زانی لە کـــوێ شـــرت و گـــوم دەبم
چوزانم گـــــەردوون چم بەســـــەر دێنـێ
مـن ئـاوادەبم لـە پـەردەی خـــــــاکـــــــا
نـەدۆست نـە ئاواڵ نـە خـــــەمـــــرەوێنـێ
وێـــنـــەی هـــەژاریم بـــبـــێ بـــۆ دوارۆژ
ئەو لە جـــیـــاتیی من کـــوردان بدوێنێ
زۆڵـە ئەو کــــــەســــــەی لـە ڕێی ئـازادی
ئەگـــەر پێـویست بوو خـۆی بۆ نەمـرێنێ

***

مۆسکۆ ١٩٥٩/٨/٢٧- وێنەیەکی خۆم بە یادگار داوە بە شاعرەیەکی ڕووس ئەمەم لە پشتەکەی نووسیوە:

## ئاواتەخوازی

«نینا» دەپرسن کـــێـــیـــە لە گـــەڵتـــا
بـــڵـــێ هـــەژاری کـــــــــــــوردی هـــەژارە
لەســـەر نیـــشـــتـــمـــان بێ نیـــشـــتـــمـــانە
لـــە ڕێـــی ولاتـــا وێـــڵـــــــــــــە و ئـــاوارە
ژیانی جـــــوانیی چـــوو، نـەگـــــەیی بە دڵ
بـــە دووی دەرمـــــــــــــانـــا دڵ بـــریـــندارە
ســـرەوتی نیـــیـــە لە ســـوێی کـــوردســـتـــان
جـــــــــەرگ ســــــــووتـــاوە و دەم بـــە هـــاوارە
چاوی لە یاریی ســــۆڤـــێـــتـــســـتـــانە
هەر ئـەو بۆ کـــــوردی بێـــــچـــــارە چارە
زۆر بـــە ئـــاواتـــە ڕۆژێـــک بـــبـــــــــــــینـــێ
کـــــورد و کـــــوردســــتـــــان ئازا و ڕزگـــــارە

***

بەغدا ١٩٦٠/٣/١٤ لەسەر نەزمی گۆرانیی «مزگێنی بێ هات بەهار» بۆ گۆرانی بێژێکم نووسیوە:

## وەڵامێک بە شەماڵدا

شـــــەمـــــاڵ دەســـــتم داوێنت وەرە ڕۆژ ڕۆژی تۆیە
سەرمای زستانت ڕاونا، بەستەڵەک ڕەنجەڕۆیە
ئەو زســـتـانی نالەبار لێـمـان ببـووە ئیـســتـیـعـمـار
بە شـــــۆڕشی نەورۆزی، ون بوو، کـــــرا تار و مـــــار
کـــوردســـــتـــــانی ڕەنگینم، مـــــایەی ژیان و ژینم

له چنگ سـەرما ڕزگـاربوو ڕزگـارتریش دەیبـینم
لە کـوردسـتـان بگەڕێ، هەڵمـژە بۆنی گـوڵان
ڕابسـپـێـرە بولبـولان با بیـڵـێن لەسـەر چڵان
شکا پشتی ئیستیعمار، ڕۆژیان نەما شا و بەیار
هەرچی کوردستان خۆرە زوو دەکرێن بە بەفری پار
ئەو شـۆڕشـەی عـێـراقی هەر وەک شـۆڕشی کـاوە
بۆ هەمـوو کـوردی جـیـهـان مـوژدەی ئازادیی داوە

***

بەغدا ٢١/٣/١٩٦٠

## بۆ کارتێکی جێژنە پیرۆزەی نەورۆزم نووسیوە:

ئەو کـوتکی کـاوەی نەمـر دای وەشـاند
نەبەردیی کـوردی لە دنیـا گـەیاند
گـڕی شـۆڕشـمـان با دوژمن سـۆز بێ
هەردەم نەورۆز بێ و جـەژن و پیـرۆز بێ

***

بەغدا ١٩٦٠ – سەردەمێک لە عێراقا هەمیشە لە ناو شاگرد مەدرەسەی کوردی سوور و زەرد شەڕ و تێک هەڵدان بوو، ئیتر ئیستیعمار و دوژمنانی نیشتمان لە بیر چووبوونەوە. منیش ئەمەم نووسیوە لە کۆواری «هیوا»دا چاپ کراوە:

## دەمەتەقەی بایز و پیرۆت

پـ: مام بایز ڕۆژباش
بـ: علیک السلام
پـ: ئەمە یانی چی؟
بـ: جیرانی مەلام

پـ: نەم دی دوێن و پێر!
بـ: بەخوا چوومە شار
پـ: چت فرۆشت بە خێر؟
بـ: یەک دوو بارە دار
پـ: نرخەکەی چۆن بوو؟
بـ: بۆتە چوار قیمەت
پـ: وەک شەکرت کرۆشت بوویتە بلیمەت؟
ئەگینا چی بێ نرخی داری تەڕ؟
بـ: چۆن نرخی نییە؟ هەتیو شەڕە و شەڕ
پـ: شەڕی کێ؟
بـ: شەڕی منالّی مەکتەو
پـ: گوایە منالّی جوولەکە و عەرەو؟
بـ: سەلاّ لە عەقلّت، خەیالّت وردن!
ئەوی لێک دەدەن هەموو هەر کوردن!
پـ: بایز وامەلّێ!
بـ: دەشلّێم و واتر
پـ: توخوا وەرە پێش تێت بگەم چاتر
بـ: چ بێژم! بە خوا بوونە دوو دەستە
هەر داوێنە یەک بە جوێن و پەستە
یەک دەلّێ سوورم، یەک ئەلّێ بۆرم
یەک ئەلّێ شینم، یەک دەلّێ زۆرم
یەکێ دەلّێ قیر، یەکێ دەلّێ ماست
یەکێ ئەلّێ لار، یەکێ دەلّێ ڕاست
تاچەنە شل بوون چەقە و جنێوە

ئەم جار شەڕە شەق ئەچێ بە ڕێوە
هەر دار بەشانە و هەر سەر شکانە
هەر خوێن ڕژانە و ئابڕوو تکانە
پیرۆت بەو خوایە لە بان سەرمانە
جوێن وەبارانە، شەق وەخەرمانە
پـ: بایز چیمان دی و چیم چاو پێ کەوت
هەرچی ئەی ئەبینی گشت لارە و چەوت
وتمان ئەم زوڵمە لە سەرمان لاچێ
کورد ئیتر ناچێ یەکتر داپاچێ
گشت ئەبن بە یەک خێڵی جاف و لەک
ڕزگارمان ئەبێ وە بنووس و چەک
نایەڵن ئاغا وەل یەک بجەنگن
ئەیان کەن وەداس هەرچی تفەنگن
کەچی وائێژی میرزا و مەتکەوی
واتێک هەڵ ئەدەن ئەو لەم، ئەم لەوی
ئێژن هەر شتێ بۆگەنیو ئەوێ
خوێی پێوە بکەی فریای ئەکەوێ
بەڵام ئەگەر خوێ بۆ گەنیو ببێ
ئیتر ئەم دەبێ دەرمانی چبێ!
خەلیفەی خۆمان فەرمووی کورد کورتە
ڕۆژمان بەسەربرد بەو ورتە ورتە
منیش وا ئەچم بارێک دار ئەبڕم
چش سەر دەشکێنێ، خۆ کەلاش دەکڕم
***

بەغدا ٢٥/٩/١٩٦٠- عەبدولکەریم بیروڕای بەرانبەر بە کورد خەراپ بوو، دنەی هێندێک نووسەری عەرەبی ئەدا کە باسی توانەوەی کورد بکەن. بەو شیعرانە، کە لە ڕۆژنامەی دەنگی کورد چاپ کراون، بیری ئەوم ڕوون کردۆتەوە:

## پیاوی چی؟

کــوردە تۆ عــەبدی لەلای مـن بەشی نەخـوراوی چی!
هەرزنـی تالّـە بـخـــۆ ســـاوەر و شـــۆرباوی چی!
ڕەنجبەری بێبەش و مووچەی بەژی چی و ئاوی چی!
ڕووت لـەســـەرمـــایە بلەرزە جل و پێـــلاوی چی!
لەسـەرت دەرکـە خـەیالآت گـەزی چی و جـاوی چی!

خـوێندنت بـۆ چیـیــە! زانین چیـیــە! هەر مـەیزانە
مـەدرەسـە بـۆ کـوڕی من، جـێی کـوڕی تۆ زیندانە
خــووی هەزار ســالّەتە بـارکـێــشی لەلای بێگانـە
نـاوی ئـازادی لـەبیــــــر خـــــۆت بەرەوە ئـازانـە
کێ بەتۆی گوت ببەشت! خوێندنی چی و ناوی چی!

نەم دەنـاســیی بەرێ، پێم وابوو بەهێـزی و پڕ ســام
بەینی خـۆمـان بێ کـەتۆم هاتەوە بیـر لێت ترســام
هەر لـە ترســا بوو هەرام کـرد و گــوتم کــوردی برام
هونەر و کـردەوەکـەت ئێـســتــە کـە ڕوون بۆوە لەلام
پەتی ئەم ترسـە پسـاوە! بەنی نەپسـاوی چی!

سـەد هەزار قـاقـەزی خـۆت هات و وتت کـورد نابم
نۆکـەری پیــشـەیی پێــشــوومـە، منیش وەک بابم
لـە زەمـــــانی بەرێ چۆن بـوومــــە، دەبێ هەر وابم
شـەرتە هەر کـەس وتی کـوردم لـە ڕێگەی وەسـتـابم
پیـاوەتیی تۆ ئەمـەبوو ئێـســتـە بلّێ پیـاوی چی؟

* * *

بەغدا ١٩٦٠- بەهۆی بیرەوەری لە بێکەس، لە کۆبوونەوەیەکدا لە بارەگای خەبات لە بەغدا خوێندومەتەوە:

## باوەڕی بێکەس

ئـاواتــی ڕۆژی ڕزگــــــــــــاری
ژیـانـەوەی کـــــــــــــوردەواری
کــۆرپەیەک بوو ســاوا و بێ هێــز
کـــەس پێی وانەبـوو دێتــــە ڕێز
ئەحــمــــەدی خـــانی بۆ گـــەیشت
فـــــرچکی کــــرد و چاوی ڕشت
بە هاوبێــشکەییی ئەســتی و زین
لەگـــەڵ مــــەم و قــــەرەتاژدین
پەروەردەی کــرد بەشــیــر و قــەند
تا کــــردیە خـــاوەن زەند و بەند
هەڵبــــەســـتــــەی تەڕ و پاراوی
خــوێنی دڵ، فــرمــێــسکی چاوی
بـەژیـری تـێـکـەڵـی کــــــــــردن
هەتـوانی هەرگـــیـــز نەمـــــردن
لـەشی هـومــــێــــدی پێ هەنـوو
زرێــی هـەرمــــــــــانــی تـێ دروو
دەنگـی کــــوردســـتــــانـی بۆدا
هەر کــــوردە و دەهات بەخــــۆدا
کــــــەوتە پـێش و ئاڵای هەڵـکرد
تـا تـوانـی بـەرەو پـێـــــــشــی برد

***

حـــاجی کـــۆیـه لـه پاش خـــانی
ئالاکـــەی خـــســـتـــە ســـەر شـــانی
بـه هـەنـگـاوی بـەرز و بـەهـێـــــــز
بـــە دڵـــی نـــەتـــرس و بـــێ پـــارێـــز
بـەشــــــەوگــــــاری ڕەش و تـاریـک
لـه شـــیـــــو و ڕێـی تـەنـگ و باریـک
گـــــوێـی نـەدایـه نـەعـــــرەتـەی دێو
ســـڵـی نـەکــــرد لـه جنـد و خـــێـــو
زۆر بـەســـــــــەر بـەرزی ڕای پـەڕانـد
لەســـــەر زۆر بـەرزانـی چـەقــــانـد
ئەو پێـــشـــمـــەرگـــەی توانا و زانا
قـــاوی کـــرد بـه کـــوردســـتـــانـا
بـه دەنـگـی زل و بـیــــــــــری ورد
ئـابـڕووی زۆڵـه کـــــــــوردانـی بـرد
تـــەمـــی پـــڕوپـــووچـــی ڕەوانـــد
گـــەلـی لـه دەردی خــــۆی گـــەیاند
دەرمــــانـی ژیـنـی نـیــــشـــــان دان
مـــــــانـدوو نـه دەبـوو لـه هـانـدان
* * *
دوای حــــاجی بـێکەسی نەمـــــر
هـــات و بـــوو بـــه ئـــالا هـــەڵـــگـــر
بێـکەس کـــەسی کـــوردســـتـــان بـوو
بێـکەس بـەڵـگەی نەوەســـتـــان بـوو

لە ناو لەشێکی ناقۆڵا
گیانی قایم تر لە پۆڵا
نەوەستا بە ئاوات خوازی
خۆی خستە کۆڕی گیان بازی
بەند و پێوەند پێی گەمە بوو
باوەڕی بێکەس ئەمە بوو
«تا داری هیوا وەبەر بێ
دەبێ جۆی خوێنی لەسەر بێ»*
بێکەس دڵ و دەروون پاک
گەرچی چۆتە باوەشی خاک
ئاڵاکەی نەکەوتە زەوی
هیچ هێزێکیش نایکا نەوی
هەوای ئازادیی نیشتمان
کەوتۆتە دڵی گشتمان
سەرانسەری کوردەواری
گیانفیدان لە ڕێی ڕزگاری
لاوی کورد ئێستە زۆر زانان
فریو ناخۆن بۆ بێگانان
زێڕ و زێو کاریان تێ ناکەن
لە کوردان نەبێ تێ ناگەن
مردن بۆ ئازادی ژینە
کوردایەتی ڕووگە و دینە

* بێکەس وتوویە: «داری ئازادی بە خوێن ئاو نەدرێ قەت بەرناگرێ».

مستەخۆڵێکی چیا و دەشت
نادەین بە شەشدانگی بەهەشت
زیندووین و تازە نامرین
گوێ لە پڕوپووچ ناگرین
شات و شووتی بێ سەروبەر
لە مەیدان نامانکاتە دەر
داگیرکەری کوردەواری
دەبێ دەرچن بە یەکجاری
نەنگی دیلی چەند ساڵەمان
جێ پەڵەی ئاە و ناڵەمان
دەشۆینەوە بە خوێنی گەش
ئێمەش دەبینە خاوەن بەش
بە هەژاریمان دەڵێین بەس
ناز دەکەین بە بڕوای بێ کەس

***

بەغدا، ئازاری ١٩٦١- کۆنە ئاشنایەکی زۆر وازوازی و ڕەگەڵ ڕەگەڵ، لە نامەیەکیا بۆی نووسیبووم: فلانی من چەند ساڵە کە ئەتناسم وا تازە بۆم ڕوون ئەبێتەوە کە تۆ بەڕاستی کوردی و کوردایەتی ئەکەی! منیش لە وەراما کە ئەمزانی گاڵتەی پێ کردووم، ئەمەم نووسی، لە کۆواری «ڕوناهی» ژمارەی ئازاری ١٩٦١ چاپ کراوە:

## کوردم

برا زۆر سەیرە زوو نەمناسی، من هەر زۆر لە زوو کوردم
کە تۆ پێنج شەش کەڕەت گۆڕاوی من بێ سێ و دوو کوردم
لە تەکییە بوویە جێگر، ڕێگر و مێگر لە بن بەرماڵ
ئەمن لەو ساوە جێ و بانم لە بانی بێشکەبوو کوردم

عەجەم بووی بوویە تورک و بویە عارەب ئێستە سەر شێواو
ئەمن بێ گێڵمەگێڵم وکەشمەکەش بێ «چاشنو» کوردم
سپی بووی، بوویە شین و بوویە سوور و ئێستە ڕوو زەردی
ئەمن یەک ڕەنگ و ڕوو، وەک پیاوی خاوەن ئابڕوو کوردم
کە تۆ بۆ مز لە ناو مزگەوتی، کوردستانە ڕووگەی من
کە تۆ دەروێشی زەرگ و مەرگی من بێ هایوهو کوردم
کە تۆ پەل بۆ هەموو جێیەک ئەکێشی و بێ ڕەگ و پنجی
ئەمن گەر پەل پەلیشم کەن، لە سەریەک ڕێگەم و کوردم
دڵت بۆ پارە پارە، بیر لە لیرە گیرە، دەم بۆ دەم
سەراپا، ڕەگ بەڕەگ، ئێسقان بە ئێسقان، مووبەموو کوردم
کە تۆ دەرپێت فڕێ دا و چاکەتی چاکت دەبەر خۆ کرد
ئەمن شەرمم بە خۆو شاییم بە خۆمە، جل شڕ و کوردم
کە تۆ گیرفان پڕی گیرفان بڕی، من هەر هەژار ماوم
کە تۆ خۆت دا بە خواردن، من لەگەڵ گاڵ و بەڕوو کوردم

***

بەغدا ،نەورۆزی ١٩٦١- کورد خەریک بوون جێژنی نەورۆز بکەن، حکوومەتی عەبدولکەریم چەتی تێ ئەخست و بڕ و بیانووی بۆ دەتاشی، ئەم دەمەتەقەیەم بەو هۆیەوە نووسیوە و لە ژمارە (١)ی ڕۆژنامەی کوردستانا چاپ کراوە:

## دەمەتەقەی بایز و پیرۆت

بـ: چۆنی؟

پـ: هەر خۆش بی.

بـ: جەژنیشت پیرۆز

پـ: پێکەوەمان بێ

بــ: له کوێ بووی نەورۆز؟
پــ: کوێخا ئەزانێ!
بــ: چی چی؟ باش بێژه؟
پــ: بێژم چی بایز؟ دوورو درێژه
چیمان بەسەر هات چیمان چاو پێ کەوت
چۆن کەفتینه ناو ئەم دنیای وا چەوت!
چەژنی چەژناسا له ناو ماڵی خۆم
بێ پرسی کوێخا ڕەوا نابێ بۆم!
وه بلوێری ئەو ئەشێ هەڵبەزم
وەقسەشی ئەکەم هێشتا ناحەزم
ئێژێ پات خواره، ڕانکەکەت شڕه
لەم هەرا و قڕه زۆر دڵم پڕه
پــ: خوا خەراو نەدا
پــ: خەراو تریش هەس؟
بــ: بەڵێ دەرد فرەس بۆ پیاوی بێ کەس
مزگەفتێ بکه و پەن شەش مناره
کڵۆڵ بی، ئێژن میعراوی خواره
پــ: ئا وەخوا بایز هێجگار کڵۆڵم
وەک پەلکه گوڵی بەر سەرما و سۆڵم
چاوم له خوایه ئێژم هەر جارێ
بگەیبامەوه دەمەو بەهارێ
بێ پرتەی کوێخا و بێ بۆڵەی سەرکار
هەوا هەڵمژم ئازاد و ڕزگار
ئەو چاخه ئەمرم چش وەجەحەندەم

سەر و ماڵی خۆم بەو ڕۆژە ئەدەم
بـ: پیرۆت عافەرم تۆ پیاوی ژیری
وەتەمەن گەنجی لە ئەقڵا پیری
تووشی بەهار بی واتا ڕزگار بی
بێ بۆڵەی کوێخا و پرتەی سەرکار بی
جەژنی خۆت بگری بە ئارەزووی خۆت
دەس لە دەست یەکا بایز و پیرۆت
هەڵپەڕکێ بگرن، کوردێک وەبلوێر
دۆستان شاد بکا و دوژمن بکا کوێر

***

## بۆ کارتی جێژنە پیرۆزە

کـــــوردە پیـــــرۆز بێ جـــــەژنی نەورۆزت
نـەبـەزی لـە ڕێـی ســــــــەربـەرزیـی هـۆزت
دەســـتی داگـــیـــرکـــەر لە خـــاکت ببـــڕە
ئـــازایـــی بـــێـــنـــە و ئـــازادی بـــکـــڕە

***

بەغدا، خاکەلێوە ١٩٦١- سدیق میران ئاغایەکی شەقلاوە لە نزیک گوندی خۆی کوژرا بوو، حکوومەتی عەبدولکەریم دەیویست حزبی پارتی تێوەدا و بەهانەی بۆ بەرپێ دانی مافی کورد دەس کەوێ. لەو بارەوە نووسیومەو لە ژمارە (٢)ی کوردستان بڵاوکرایەوە:

## دەمەتەقەی بایز و پیرۆت

بـ: پیرۆت ئەخەنی؟
پـ: ئەی چۆن نەخەنم، قاوتی بەربا و

کای لەبەر شەنم
بــ: گوایە چی بووە؟
پــ: لەمە زیاتر چی؟
دنیامان بووگە وەهەرچی و پەرچی!
بــ: ها، زانیم، ئێژی مانگ دروس ئەکەن
عەمیلکە گرە و دەگەڵ ڕووس ئەکەن
پــ: بایز خوا ئەقڵ با بە مناڵت
بۆ مێشکی کۆن و بۆ بیری کاڵت
گیانە، کاورایەک مرد لە شەقڵاوە
ئێژن لە بەغا تیرت لێ داوە
وەک ئێژن غەوس لە بەغدا بووە
وە کەلاش یەکی لە هیند کوشتووە
بــ: گاڵتەم پێ ئەکەی؟
پــ: بێژم چی گیانە
چۆن ڕێی ئەگیرێ بڕ و بەهانە؟
بــ: ئێژی بەهانەس؟
پــ: بەهانە و نیوە
میاو میاو بۆ پیوە، هێشتا چت دیوە؟
چەند چەوسامەوە لە ڕێگەی کاکم
دنیا شایەتە چەند پاک و چاکم
پێشمەرگە وەڕۆژ پاسەوان وەشەو
هەزار برینم لە لەش لەسەر ئەو
ئێستە بەهانەم بۆ ئەدۆزنەوە

گفتی دوژمنم بۆ ئەقۆزنەوە
ئێژن پف ئەکەی لە هەمەدانا
ئارد وەبا ئەدەی لە خۆراسانا
دیارە ئەخوازن بێ زاد و تێشوو
بم گەڕێننەوە سەر دەقی پێشوو
بــ: پیرۆت چۆن ئەوێ چ خوا بەردارە؟
کورد بۆ چ ئەمەندە کلۆڵ و ژارە!
پــ: بایز کەس ئەمرۆ ناشێ بخەنێ
منالٚ تا نەگری شیری نادەنێ

***

بەغدا، خاکەلێوەی ١٩٦١- ئەم دەمەتەقەیەشم کە هەر هێرش بۆ سەر کردەوەی عەبدولکەریمە لە ژمارە (٣)ی ڕۆژنامەی کوردستان چاپ کراوە:

## دەمەتەقەی بایز و پیرۆت

بــ: خوا قەوەتت با
پــ: خۆت مانوو نەوی
بــ: وەچی خەریکی؟
پــ: کێلانی زەوی
بــ: چی لێ ئەچێنی؟
پــ: گەنم و هەرزن
بــ: هەرزن بۆ مامر؟
پــ: نە بەخوا بۆ من
بــ: چۆن هەرزن ئەخۆی؟

پـ: گەر دەستم کەوێ!
بـ: لەبەر چی؟
پـ: کوێخا ئەویشی ئەوێ
بـ: کوا هەرزن ئەخوا؟
پـ: بۆ مامری خۆم
پەتی ملیشم هەر لە خوری خۆم
ڕۆنە هی منە، گۆشتە هی منە
بۆ من ماندوبوون، بۆ ئەو خواردنە
بـ: کوێخا زویرە لێت
پـ: کەمم هانیوە
بـ: نەخێر پێت ئێژێ خۆت نەناسیوە
پـ: من مام پیرۆت نیم!
ب: مەیژە پیرۆتم
بێژە کوێخا گیان هەتیوی خۆتم
کوێخا ناخوازێ کەس خاوەن ناوبێ
هەرچییەک بۆی ئەکەی ناشێ بەرچاو بێ
چەرمی پشتی تۆ بکاتە سفرە
مەڵحەم داواکەی لەلای ئەو کفرە
کار بکە و داوای نان و ئاو مەکە
گشتی خزمەت بەو بیری خاو مەکە
پـ: بەڵێ بایز گیان من خۆم ناناسم
هەر بۆیە هێندە ڕووت و کەساسم
ئەگەر وەک مەردم خۆم بناسیبا

ناشێ ئەو ڕۆژەم بەچاو بدیبا
بـ: پیرۆت خەم مەخۆ دنیا وە دەورە
ڕۆژمان دەرئەچێ لەبن ئەم هەورە
پـ: ئا: وەخوا ئەگەر یەک بێن من و تۆ
کوێخا ئەبێتە ڕاهێڵی بێ پۆ

***

ئەم دەمەتەقەیەشم کە لەسەر عەبدولکەریم گوتووە لە ژمارە (٤)ی کوردستان لە بەغدا چاپ کراوە:

## دەمەتەقەی بایز و باپیر

بـ: مام پیرۆت سڵاو
پـ: ئای وەحەلێکم
بـ: چۆنی؟ لە چیدای؟
پـ: بە خوا نارێکم
بـ: نارێکیت لە چی؟
پـ: ئەپرسی لە من؟
بووم وە پەند لەناو گشت دۆست و دوژمن
بـ: ئێژن تۆ و گورزە تێکەڵ بوونە سەو!
پـ: بەڵێ جا ئێستا ئەو بازە و من کەو
وەگیان تۆ هەست و نیستی خۆم دایە
بـ: جا گوایە هێشتا بەرچاوی نایە!
پـ: چاو و ماوی چی! من خەتا بارم
وای بەسەر هێنام لە ژین بێزارم
لە ڕەمەزانام ساڵێ دوازدە مانگ

نەمزانیوە چین پارشێو و بەربانگ
ئەو نانم ئەخوا، من سوێند بەسەری
ئەو زێڕ ئەکێشێ من کوێرەوەری
بۆ خۆی تێر گۆشتە لە ئاژاڵی من
گز و فت ئەدا وە منالّی من
کاسە دراوسێ ئەدا بەم و بەو
ئێمەش چەورایی ناوینین بە خەو
بـ: جا بۆ خەوتان هەس وەشەو لە برسان؟
پـ: نە بەخوا، وەرۆژ ئەتووین لە ترسان
بـ: دەک پیرۆز نەوێ، ئەشتان ترسێنێ؟
پـ: ترساندن و بەس؟ گیانمان دەردێنێ
هیوام کەچەڵ بوو، وەملی وردم
سەری هەڵماڵی و زراوی بردم؟
خۆم کۆڵەوار کرد بۆ دەنگی دەهۆڵ
کێ بەزەی دادێ وەپیاوی کلۆڵ
وە قورحانەکەی سەید سادق سوێنم
دەردم سەرباره و بەرباری جوێنم
بـ: پیرۆت نەتبیستووە بۆ دەستەوستان
بەهرەیەک نادا گەرمێن و کوێستان
کێ ددانی بێ خواردنی ئەوێ
پـ: ئا، وەخوا، بایز دەردت لێم کەوێ
گەر ڕەمەزانە و گەر شەشەکانە
بەشم هەرژەم و دوو تیکە نانە
***

بەغـدا، خـاكـەلێـوەی ١٩٦١- خـاوەنی ڕۆژنامـەیەكی بەغـدایی بە ناوی (الثـورة) بە ئاشكرا داوای توانەوەی گەلی كوردی كرد لە ناو گەلی عەرەبا، ئەم دەمەتەقەیەم لەسەر ئەو كابرایە نووسیوە، لە ژمارە (٥)ی ڕۆژنامەی كوردستانا چاپ كراوە:

## دەمەتەقەی بایز و پیرۆت

بـ: مام پیرۆت چۆنی؟
پـ: بایز چە بێژم؟
بەخوا ئەم بەینە سەرسام و گێژم
بـ: چیتە؟ سەرماتە، بارانە، هەورە؟
پـ: كوڕە نا، لە داخ ڕۆژنامەی سەورە
ئێژێ گەلی كورد ئەتاوێنمەوە
ناوی لە دەفتەر ئەكوژێنمەوە
ئەبێ قوبتیان دەم كورد و چیاكانی
خۆمیان لێ بكەمە گەماڵی سانی
بـ: چی، چی؟ ئا، پیرۆت بۆمی بڵێوە
پێم ناڵێی كێیە ئەم سەگباب خێوە!
هەی باوكی لە گۆڕ نەحاوێتەوە
كورد مۆمی نوشتەس بتاوێتەوە؟
بۆ من دۆلارم بخرێمە باخەڵ
شێر چۆن ئەچێتە ناو ورگی چەقەڵ؟
ئەمە كەی كوردگەل بوونە پەقلاوە
كەر لە كوێ و كوندە لە كوێ دڕاوە؟
پـ: بایز ئەی چییە ئەم قویلەقویلە
بـ: پیرۆت وەگیان تۆ گشتی بۆ پویلە
ئینگلیزمان دەركرد وەچەپڵە و فیتە
لە دەستی دەرچوو ئەم حەمكە پیتە

هەر خەون ئەبینێ بێتەوە ناومان
ببێ وەلەکە لە بانی چاومان
لات بە کرێ ئەگرێ شەڕ بنێتەوە
خۆی هەلێک دەس خا و بگەڕێتەوە
پـ: ئێستا نەترسم؟
بـ: ترسی چی پیرۆت؟
گەل قوتدانی چی؟ هەر بەبیری خۆت
هێتلەری باوکی ئەم ڕۆژنامەیە
کوا! کێ ئەزانێ گۆڕی کامەیە؟
هەزار پالەوی و سەد گەمالّ مردن
بەکەس قویت نەچوین کوردت هەر کوردن
پـ: بەلّێ ڕاست ئێژی، خوا نەت باتەوە
گا، لە جێیە تر ئاو ئەخواتەوە
باوکم لێم مەگرە سەیرە ئەم دەورە
ترسام وەک خورما قویتم دا سەورە

***

بەغدا، بانەمەڕی ١٩٦١- بۆ بیرەوەریی شەهید کرانی شێخ سەعیدی پیران ئاهەنگێک لە بارەگای خەبات لە بەغدا گێڕدرا ئەم شیعرەم بەو هۆیەوە خوێندەوە:

## ئافەرین بۆ گیانبازان

پێ و چەک زرمەیانە و خرمە
کۆ بوون کۆمەلّێ جەندرمە
ڕق لە دلّ و نێزە بەدەست
لە ناو گۆڕاییەک ڕیزیان بەست

دیاربەکر خەمگین و ماتە
چاوەنۆڕی کارەساتە
لە شەوێکدا لە ئاقارێک
هەڵخرا چەند پەت و دارێک
شێخ سەعیدی پیرانی پیر
لەگەڵ چەند لاوی مەرد و ژیر
بوونە قوربانی کوردستان
بوونە ڕووگەی کوردپەرستان
ئەنقەرە ئەمرێکی دەرکرد
شێخ کوژرا، کوردستانیش مرد
بەڵام مێژووی ژیری بیر ورد
گەمەی بەو قسانە دەکرد
بە خەتێکی سووری وەک خوێن
نووسی لە دیاری ترین شوێن
ئەوانە نامرن و زیندوون
هەزار قات دێنەوە کە چوون
مەرگ هەر بۆ گەل خۆرانە
نەفرین بۆ خاوەن زۆرانە
سەد ئافەرین بۆ گیانبازان
بۆ گیانی ئازادیخوازان
شێخ سەعید هەرگیز نامرێ
ناوی با دنیا داگرێ
خوێنی کوردان کە ڕژاوە
ناوی تورکی پێ کوژاوە

هەر دڵۆپێکی ئەو خوێنە
بۆ تۆڵەساندن هەوێنە
تا لە کوردستانە ترکێ
خوێنی کوردان دانامرکێ
تۆڵەی شەهیدان دەستێنین
پەڕی مێژوو دەڕەنگێنین

* * *

بەغدا، پایزی ١٩٦١: ساڵی ١٩٦١ شۆڕشی پیرۆزی کوردستان دەستی پێ کرد، بەپێی توانا منیش بەپەخشان و شیعر بەشێکم تێ خستووە. هەرچەندە هێندێک لەو شیعرانەم نەشخوێندراونەوە! ئەم سروودەم لە سەرەتای شۆڕشدا بۆ شاگردانی مەدرەسە نووسی:

## سروود بۆ قوتابیان

من ڕۆڵەی کوردم، بۆ نیشتمانم
سەرم دائەنێم، ئەبەخشم گیانم
لە ڕێی شۆڕشا خوێنم ئەڕژێنم
ئاڵای ئازادیی پێ دەڕەنگێنم
زۆر شەرمە بۆ من کورد ئازاد نەبێ
گەلم وەک گەلان دڵی شاد نەبێ

* * *

خوێنی مامم بوو لە ئاگری ڕژا
خوشکەکەم مێشکی لە دەرسیم پژا
باپیرم لە چیای شیرین نێژراوە
لە کن مەهاباد باوکم کوژراوە
برام لە بەغدا بە داردا کرا

زۆر مــاڵە خــزمم بەر بۆمــبـا درا
***
گـەلێک پێـویستـە زانست و خـوێندن
بۆ ســەربەخــۆیی، بۆ تۆڵەســەندن
گەل خـوێندەوار بێ قـەت ژێر ناکەوێ
لە ڕاست بێـگانە ســـەری نانەوێ
چینی تازەی کــورد بە خــوێندەواری
بەرز ئـەکـــاتەوە ئـاڵای ڕزگـــاری
ئێـــمـــە چینـی خـــوێـندەوارین
پێـــشـــڕەوی ڕێگەی ڕزگـــارین
ڕەمـــزی کـــار و نەوەســـتـــانین
فـــیــداکــاری کـــوردســـتـــانین*
***

بەغدا، بەهاری ١٩٦٢- ئەم سروودەشم هەر لەسەرەتای شۆڕشا بۆ پێشمەرگە گوتووە، بەڵام نەخوێندرایەوە:

## سروودێک بۆ پێشمەرگە

## کوردستان

کوردستان......
نیـشـتـمـانی کـورد، گـەلێک پیـرۆزی، سـوێندت پێ ئەخـۆم
بۆ ســەربەخــۆییت، بە گــیــان و بە مــاڵ، بەقــوربانـی تۆم
*لەڕێگەی ڕزگارکـردنت بەرەو خۆشی پێش بردنت ڕووبەڕووم لەگـەڵ دوژمنت
کوردستان......

---

* ئەم دوو بەیتەی دووایی سەربەندی هەرسێک بەندەکانە.

* سەربەندی هەرسێک بەندەکانە.

هەرتۆی مەبەستم، تۆی خۆشەویستم، تۆی بیر و هەستم
چی دێ لە دەستم، هەرگیز ناوەستم، وڵات پەرستم
کوردستان......
زۆر لاوی ئازات، لە کۆڕی خەبات، خوێنی خۆیان ڕشت
زۆر شێخ و پیران، لە زانا و ژیران، خۆیان دا بەکوشت
کوردستان......
بۆتان، شەمزینان، چیای شیرن، پیران، ئاگری داغ، ساسۆن
دەربەند، شارەزوور، مهابادی سوور، ڕووگەی نەوی تۆن
کوردستان......
دڵ چاک و پاکین، ئازا و بێ باکین، ڕۆڵەی ئەوانین
بە دڵ داخوازی، سەربەخۆیی تۆ، و تۆڵەی ئەوانین
کوردستان......
بڕیارمان وایە، یان ئازاد ژیان، یان ئازا مردن
بەسەرچوو ئەم دەم، لە ڕووی بێگانا ،ن سەرنەوی کردن

***

کۆیە، نەورۆزی ۱۹٦۳- نەورۆزی ساڵی ۱۹٦۳ کۆبوونەوەی سەرانی شۆڕش لە شاری کۆیە بوو، لە ئاهەنگی جێژنی نەورۆزدا ئەم شیعرەم خوێندەوە:

## کاوەی مەزن

جێژنی سەرساڵ کە نەورۆزە
زۆر لە ناو کوردا پیرۆزە
جێژنی کۆنە و بۆمان ماوە
بۆی دارژتین کوتکی کاوە

مێشک خۆری کوردی مراند
ئاڵای لەسەر گۆڕی چەقاند
ئاڵای کاوەی کورد هەڵ کرا
ئەو ڕۆژە بە نوێ نێو نرا

***

هەزاران ساڵ تێ پەڕیوە
کوردیش نەورۆزی زۆر دیوە
هەر کاتێ خاکی کوردستان
ڕزگار دەبوو لە چنگ زستان
پۆلوو دەکەوتن یەک و دوو
موژدەی شەماڵی پێوە بوو
بای وادە لە دەشت و کاوان
بەفر و سەهۆڵی دەتاوان
دەیگرماند هەوری بەهاری
بە لێزمە باران دەباری
پووش و لیتەی ڕادەماڵی
کۆنە بەرگی دادەماڵی
دەشت و دەر دەبوو سەوزە پۆش
پڕ گوڵی خۆش ڕەنگ و بۆن خۆش
کیژ و کوڕ دەردەچوونە چۆڵ
بۆ سەمای بە زوڕنا و دەهۆڵ

***

بەڵام ئەوا یەک دوو ساڵە

بێ جـــــــــەژن و ژیـانمـان تـاڵـە
نەورۆزمـــان وای خـــۆ گـــۆڕیبـــوو
قـــەت کـــەس شـــتی وای نەدیبـــوو
عـــەرەب حـــەزیای خـــواردنمان بوو
داواکـــــــاری مـــــــــردنمـان بـوو
لەســــەر خـــــاکی کـــــوردەواری
ڕەش و پـــــاپـــــەتـــــی دابـــــاری
دەس کـــــرا بە خـــــوێن ڕژتنمـــــان
بە منداڵ و ژن کـــــوشـــــتنمـــــان
خـــەڵات بوون شـــەق و دار و مـــست
ســـــاوایان دەئـاگـــــر دەخـــــست
قـــــیـــــژە و هاواری کـــــیـــــژە کـــورد
بێ نامـــووس، نامـــووســـیـــان دەبرد
ئاغـــا و ڕیش ســـپی و مـــەلامـــان
کـــــــێی زۆر بـەنرخن لە لامـــــــان
دەست بەند لە دەست و دەم بەخـــوێن
دەدرانـە بـەر پـلار و جـــــــــوێـن
فـــــڕۆکـــەی مـــێگ و ئەلیـــوشن
هەژدیهـــــان خـــــوێن هەڵ دەلووشن
گـــــــرمـــــــەیان لـە هەوران زۆرتـر
لە هەمـــوو وەحـــشـــان پیـــاوخـــۆرتر
بۆمـــبـــای ناپاڵـمـــیـــان دەباراند
گـــیـــانیـــان لە لەشـــمـــان دەتاراند

دیارییەک بوون لە کرێکاران
بۆ ماڵ و مەزرای هەژاران
چەک، چەکی ئاشتی خوازی بوو
لە کوشتن بێ جیاوازی بوو
بەرتۆپی پێنج پێنج و شەستیر
دەدرا ساوا و جوان و پیر
هەوری چڵکنی زۆرداری
بەتاو مەرگی لێ دەباری
زۆر ئیقلیم گیربوو لەو ناوە
خوا کردی و ڕاپەڕی کاوە
***
کاوەی مەزنمان بارزانی
کاوەی پێشوو بە قوربانی
بزووت بای وادەی ئاواتمان
گەرم بوو کۆڕی خەباتمان
پێشمەرگە خاوەن سەردارە
ژین لە دوژمن ژەهری مارە
سەتیان هەڵدێن لەبەر کوردێ
وەک دەڵێن «سەد قەل و بەردێ»
جاش کلکی لێ بوو بە ئاڵا
سم و یاڵی لێک دەهاڵا
عارەب کەوتە یومە و ڕۆڕۆ*

* یومە بە عارەبی یانی هەی دایە.

کـــاکـــە مـــەمکوژە و چەک بۆ تۆ
با هەر بێن مـــێگ و ئەلیـــوشن
بـــۆ لاوی بـــارزانـــی پـــووشـــن
بە گـــۆپاڵ ڕەشـــاش دەســـتـــێنن
بە بـەرد زرێپـــــــۆش دەشکێنن
کـــورگـــەل چەک وەگـــوێزن بەکـــۆ
کـــەلاشـــینکۆ و خـــرۆشـــینکۆ
تا ســـەردارمـــان بارزانیـــیـــە
ترســـێک لە ئارادا نیـــیـــە

***

لە هەژارت کـــەوێ کـــاکـــە
باپێت بنازێ ئەم خـــاکـــە
ئابڕووی کـــوردت کـــڕییـــەوە
دەســـــــــتـی زۆردارت بڕیەوە
ناوی مـــەش بەهۆی خـــۆتەوە
لە دنیـــــــــا بەرز بۆتەوە
هێـــزی دەست و تفـــەنگی تۆ
هەیبـــــەت و زەبروزەنگی تۆ
پاپەتی لە ترســـان مـــردن
جـــەهەندەمی لێ پڕ کـــردن
جـــێفـــرکی لە جـــاشـــان بڕی
نامـــووس فرۆش مـەرگیان کڕی

***

لەو جـــێی بە بۆمـــبـــا ســـوتاون

کـــــەلاکـــــە دوژمـن نێـــــژراون
لاشی دوژمـنی کـــــوردســــتـــــان
پەیـن بۆ ناو باغ و بێـــســـتـــان
شـــینکە باشـــتـــر ســـەر دەردێنێ
زەوی باشـــــتــــر گـــــوڵ دەڕوێنێ
وا بۆت نیــــزیک کــــردین بەهار
دەســـــتم دامـــێنت هەزار جـــار
هـەورازێکـمــــان لـەبـەر مــــاوە
لەو دیو خـــۆشی و تاو و ســـاوە
پێـــشـــمـــان کـــەوە لەو ڕێبـــازەش
وەســـەرمـــان خــــە لەم هەورازەش
تا کـــــورد ژێر چەپۆکــــە مــــابێ
ئـاســــــــــودەیی بـۆ تـۆ نـابێ
هەمــــــوو کــــورد چاوی لە تۆیە
هەر تۆی هەبێ ســــەربەخــــۆیە
دەرمــــــــــان بێـنـە لـە هـەژاری
بمان خــــە ســـەر ڕێی ڕزگـــاری

***

کۆیە، ١٩٦٣/٣/٢٧- سروودێکە بۆ شۆڕشم نووسیوە، بەڵام داخەکەم لە دەمی خۆم و قەڵەمەکەم دوورتر نەڕۆیشت:

## بۆ پێشەوە بارزانی

ئـەگـــــەر دنـیـــــا مــــــژ و تـەم و تـاریـکـە
ئەگـــەر ڕێگا کـــەند و کـــڵــــۆ و باریکە

ئەگـــــەر شــــەوە و گــــرمــــەی هەور و بـارانـە
ئەگـــەر بەفـــرە و شــلّــیّـــوەیە و تۆفـــانـە
ئـەگـــــەر گـــــێــــژە و کـــــڕێـوەیـە و بـۆرانـە
ئەگـــــەر لە هـەرجـــــێـــــدا چـەتـە و گـــــۆرانـە
تۆ شـــــارەزا و ڕێ نیــــشــــانـدەری لاوانی
بۆ پێـــشـــەوە پێـــشـــمـــان کـــەوە بارزانی
ئـەگـــــــەر هـەوار نـشـــــــێـــــــوە یـان هەورازە
ئـەگــــــــەر لـەهـی و لافـــــــاوی بێ پـێ بـازە
ئەگـــــەر چەق و لـوور و مــــــڕەی دەعــــبــــایە
هـەمــــــــوو دەر و دۆڵـێـک پـڕی حـــــــەزیـایـە
ئـەگــــــەر لـە هـەر بـن بـەردێ نـەعـــــــرەی دێـوە
هەر پـنـچـکـێـک پـڕی لـە جـنـد و خــــــێـــــــوە
بـاکـــمـــان نـیـــیـــە هێـــز و گـــوڕی دڵـمـــانی
بۆ پێـــشـــەوە پێـــشـــمـــان کـــەوە بارزانی
ئـەگــــــــەر دوژمـن پـڕا و پـڕی دنـیـــــــــا بـێ
شــــــــەپـۆڵ بـداتـەوە، وەکــــــــــو دەریـا بـێ
چـەکـی دەسـی لـە ئـێــــــمــــــــە زۆر زۆرتـر بێ
لـە گش دڕنـدە، وەحـش و پـیـــــاو خـــــۆرتر بێ
خـــــۆیـان لـە نـاو زرێـپـــــۆشـــــان وەشـــــارن
بـۆمــــــبـــــــا لـەبـن فــــــڕۆکـــــەیـان دابـارن
لە کـــوردســـتـــان تۆمـــان هەبی بەســـمـــانی
بۆ پێـــشـــەوە پێـــشـــمـــان کـــەوە بارزانی
بـا کـــۆخ و لادێ و شـــارەکـــان خـــاپـوورکـــەن

با گـــولله تۆپ لاشـــان لە خـــوێنا ســـوورکـــەن
خـــوێنمـــان لەڕێی ئەم نیـــشـــتـــمـــانە بڕژێ
مـــێـــشکی ژن و کـــوڕ و کـــیـــژانمان بپـــژێ
لانـک و منـاڵ بـە ئـاگـــــــرێ بســـــــووژن
بـا وێران کـــــەن، ببـــــڕن، ببـــــەن، بکـوژن
لە دواتەوەین باب و برا و کـــەســـمـــانی
بۆ پێـــشـــەوە پێـــشـــمـــان کـــەوە بارزانی
کـــوردین کـــوڕی چیـــا نەبەرد و شـــێـــرین
بە کـــوشـــتنی داگـــیـــرکـــەرانمان فـــێـــرین
لە دوژمنان تۆڵـە و هەقـــمـــان دەســـتـــێنین
ســـەدقـــات ســـەران دەبڕین، زگـــان دەدڕێنین
ئـەو ڕۆژی کـــــورد دەکـــــرا بە دیـل ئـەو ڕۆیی
یـان مـــــردن و یان ژیـن بـە ســـــەربەخـــــۆیی
دوژمـن کـــــوژی کـــــورد پـەروەری ڕێزانـی
بۆ پێـــشـــەوە پێـــشـــمـــان کـــەوە بارزانی

***

چیای براندۆست، سوورچی، ١٩٦٣/٥/١٥- حزبی پارتی بڕیاری وابوو کە هەرگیز لە داوای حوکمی زاتی (ئۆتۆنۆمی) نەیەتە خـوار، جـەلال تاڵەبانی دەیگوت من پارێزەرم قـانون ئەزانم، لامـەرکـەزیش هەرمانـای ئۆتۆنۆمییـە، من لام وابو فـێڵێکە لە کورد ئەکرێ، دەستیشم نەدەڕۆیی قبوڵی نەکەم. بەو شیعرانەم گاڵتەم بە لامەرکەزی کردووە:

## لامەرکەزی

یار وەکـو مـانگی لەســەر کـەل هاتە دەر لامـەرکـەزی
زوڵف و کـاکـۆڵی وەکـو مـیـشکی تەتەر لامـەرکـەزی

چاوی مەستی هۆش و هەستی زۆر بە تەڕدەستی ڕفاند
کولّمی ئاڵی خوێنمی کردە هەدەر لامەرکەزی
من گوتم دەمرم لە دووریت کەی بە وەسڵت شاد ئەبم؟
پێکەنی و فەرمووی هەژار خاکت بەسەر لامەرکەزی
من گوتم کوردم شتێکی وا بفەرموو تێت بگەم
ئەو گوتی: نایزانێ غەیری پارێزەر لامەرکەزی
من گوتم: وا دیارە ماچ و دەس لە گەردن کردنە
نا، گوتی: دەردی گرانە بۆ جگەر لامەرکەزی
من گوتم: جوێنیش بدەی پێم وایە هەر خۆشت ئەوێم
تووڕە بوو فەرمووی: دەڵێی هاتویە سەر لامەرکەزی
من گوتم: جارێک تەماشام کە بە گۆشەی چاوەکەت
پێی گوتم: بۆ دەربەدەر سەرفی نەزەر لامەرکەزی

***

چیای برادۆست، سوورچی، ١٦/٥/١٩٦٣- وەفدێکی شۆڕش بە سەرۆکایەتیی جەلال تالەبانی لە زەمانی بەعسییاندا چووبوونە بەغدا و لەوێشەوە، جەلال لەگەڵ چەند کەسێکا چووبووە قاهیرە، من کە باوەڕم وابوو، ئەو سەفەرە زۆر بێهودەیە ئەم شیعرەم لەسەر نەزمەکەی پیرەمێرد (وەفدی کوردستان وەتەن فرۆشان) نووسی، بەڵام نەمتوانی بڵاوی کەمەوە:

## وەفدی کوردستان

وەفدی کوردستان مەست و بێهۆشان
دەم و پل هەڵەی بە دڵ نەخۆشان
لە دووی چ وێڵن! بۆ وا چەوێڵن!
تاکەی سەربەرد و ڕەقەن دەکێڵن!
قاهیرە و بەغدا چ دادێک دەدەن

له دەرگــای دوژمن دەرۆزەی دەکــەن!
مــاف دەسـێندرێ هەرگــیــز نەدراوە
ملتــان دەشکێنێ ئەم خــاوە خــاوە
خــوێنی هەزاران کــوردی پیــر و لاو
ژنی شـــو نەمـــاو، منالّی بێ باو
لێــرە بێ تۆلّە و بێ بەش مــانەوە
ئێــوەش گــەڕ ئەخــۆن بە شــارانەوە!
ئارەق و خـــوێنی ڕووت و هەژاران
دەدەن بە بادە بۆ کـــــۆڕی یاران!
ڕێوی پێـشـەنگی جەلەی وشـتـربێ
ســەیرە و ســەمــەرە بار بگاتە جێ
دەک ڕەنجــەڕۆ بن، ڕەنجـــو بەبا دا
ڕووزەردن لەبەر قــــاپی خـــودادا
بۆ پارە و کـورسی ئێــمــە دەفــرۆشن
شـــیـــرتان بۆ نادا نێـــران دەدۆشن
خوێنی میرخان و مەحموود کاوانی
نەفـــــرین دەنێـــــرن بۆ تالّەبانی
خـــوایە چارەیەک زۆر چارەڕەشین
زلمان زالّــمن بـۆیــە بێ بــەشین
***
بارزانی هاوار جــێی هومــێــدانی
لەو دەردی گــران هەر تۆ دەرمــانی
فـێلّبـازی خۆمان لێمان بوونە کەو

دەمان هاوێنە داوی ئەم و ئەو
بازی سەرچیا فڕەی شابالێک
گوڕێک، هەڵمەتێک خاین ڕامالێک
بابی هەتیوان مەوەستە هەستە
بۆ ڕزگار کردن ودمت بەدەستە
وەپێشمان کەوە با سەربەخۆ بین
وێرانەمالین ئەگەر بێ تۆ بین

***

چیای براندۆست، سوورچی، ١٩٦٣/٥/١٧- لەسەر زمانی جاشە کوردەکانەوە ئەم سروودەم نووسیوە:

## سروودی جاش

جاشین کوڕی کەرانین
جاشەکەری گوێ پانین
عاش عاش عاش
جاش جاش جاش*
ئێمە وەتەن فرۆشین
مردووی پارە و قرۆشین
داردەستی داگیرکەرین
کەیف ساز و سەرخۆشین
نۆکەرین بۆ بێگانە
بە دڵ بۆی تێ دەکۆشین

* * *

---

* سەربەندی بەندەکانە.

هەر کەس وەتەن پەرستە
زۆر لەلای ئێمە پەستە
نیشتمان و نامووس چین!
بەستەی دینار مەبەستە
برای خۆمان ئەکوژین
گەر تۆزێک خاوەن هەستە

* * *

بادابارن تف و جوێن
لە هاو ڕەگەز و هاوخوێن
گوێ نادەینە شتی وا
نامووس، خوا و شەرەف لەکوێن!
لە پیاوەتی تێ ناگەین
لە بابەت پارە بدوێن

* * *

نامەردی خاوەن پارە
لامان ئاغا و سەردارە
هەر کورتانمان تازە بێ
کۆڵمان ئامادەی بارە
جاشین با گەورە ببین
شەشدانگ ئەبین ئەمجارە

* * *

ئەشکەوتی چیای براندۆست، سوورچی، ١٩٦٣/٦/٣- حکوومەتی عێراق بە جاشە کوردەکانی خۆی ئەگوت چەتە یان مەوالی. بەعسییەکان ناویان لێ نان فورسان، فورسان یانی: سواران. منیش بەو هۆیەوە ئەمەم نووسیوە:

## جاش توورەن

لە بەغداوە هات خەبەر
بۆ جسناتی جاشەکەر
مزگێنی، نەما ترسان
ناومان لێ ناون فورسان
لە هەولێر و لە مووسڵ
جاش کۆوەبوون هەموو سڵ
تاجی زل و سم خڕن
نارەزایی دەربڕن
گوێ قوت لەسەر سم بۆ شەڕ
بەجیفڕک و زەڕەزەڕ
بۆ بەغدا دایان لە تێل
بۆ خزمەت خواجە میشێل
میشێل عەفلەقی دیان
پێغەمبەری بەعسیان
گوتیان ئەی فەلەی مەزن
فەرمایشتت ناحەزن
فورسان بەسوار دەبێژن
مەفەرموو جاشن، گێژن
کێ بیستی جاش و سواری!

بەسیەتی فێڵ و خواری
شیری کەرمان مشتووە
برای خۆمان کوشتووە
ئێمە جاشین کوڕی کەر
بۆ پارەدەر بارەبەر
جاشی کەریم قاسم بووین
بۆ ئەو لە ناڵ و سم بووین
تۆپی ئەو بابی چاکمان
تۆ خۆت بکە بە داکمان
جاشی خۆتین ئەم هەلە
جاش قاسم نا، جاش فەلە
گەر ناومان لێ بگۆڕی
بۆمە شەرمە و گوێ شۆڕی
جاش بەگزادە و شێخی پیر
بە فورسان دەبن دڵگیر
فەلە گیان، تۆ سڵێوە
بانگمان مەکەن بەو نێوە
فورسان مورسان نە باشە
ناوی پیرۆزمان جاشە
هەر بەربار و گوێ لەقین
جاشی میشێل عەفلەقین

* * *

له سەردەمی هێرشە نامەردانەکەی بەعسییان، ئێرانی و تورکیش زۆر بە دڵ یاریدەی عێراقیان ئەکرد بۆ نەهێشتنی شۆڕشەکەمان و قەڵاچۆ تێ خستنمان. منیش وەک لێم روونە و هەمیشەش باوەڕم وا بووە گەلی کورد بە کەس لەناو ناچێ و کوردستانیش هەتا سەر لە ورگی کەسدا نامێنێتەوە. بەم شیعرانە باسی هێندێک ڕابردووی خۆم و باوەڕی و داخوازی دڵم بۆ دوا ڕۆژ کردووە:

## بەرەو موکوریان

شـــــەوە تـاریـکە کش و مــــــاتـە زەوی
کــەوتە خــەو کــێــوی، کــەوی، دارودەوی
تـووتـەک و گـــۆیـن و کـــونـد وشـــیـــارن
ڕۆژ وچـانـیـــــانـە بـە شـــــەو پـڕکـــــارن
لـەو هـەمـــــوو جــــانـەوەرەی وەردەکـــــەوێ
نـازەنـــیـــنـــیـــش هــەیـە لای لایـــێـــی دەوێ
شـنـەبـای وردە گـــــــــــوڵاو ئـەپـژێـنـێ
پێــی ســـــپـــــێـــــراوە گـــــەڵا ڕاژێـنـێ
خـــوڕخـــوڕی ئاو لـە بـەفـــری ســــەرکـــەل
خـــۆش هەوای تێکەڵە زەنگی ســـەر کــەل
ســـــەگ بـەدەم پـرخــــەوە دەم دەم دەمــــڕێ
لـەخـــــــەوا دیـویـە گـــــــورگ بـەرخ ئـەدڕێ
بـۆق لەســــەر نوێنی قـــوڕین قـــیـــڕەی دێ
ســیــســـرە ژێ تـاری شـــڕە و ســـیـــڕەی دێ
جـــار و بـارەش کـــەڵەشـــێـــر ئەخـــوێنێ
بـانـگ لە ئـەســـتـــێـــرە ئەکـــا بـیـــدوێـنێ
ئـاگـــــری شـــــوان ئـەگــــڕێ لـەو دوورە
بووکی خـــێـــوی شـــەوە، تارای ســـــوورە
گـــەشن ئەســـتـــێـــرە چ بەرزن، چ نەوین

گـــشــــتی پێت وایە ئەویندارى زەوین
زۆر بەپارێزەوە هەست ڕادەگـــــــرن
بە هومـــێـــدێکەوە چاو دادەگــــرن
* * *
مــــانگ ئەوا تازە لە ئاســــۆ دەردێ
کـــۆمـــەڵێ هەورە ســـپـــیلکەی بەردێ
وەک منـاڵـی کـــــــــزی بـاب ئـاوارە
چاوەڕێ بوون وەگــــــــەڕێ دووبارە
وا ڕەوی مـــــژ لەبەر ئەو پێــــــوارە
گــــــــەش و ڕوون بوونەوە بەو دیدارە
بەلەز و هەڵپـــــە هەمــــوو زۆر بەدەون
هێندێ پێـــشـــڕەون و برێ دوا ئەکـــەون
گش بەرەو پیــــــری ئەچن زووی بگەنێ
مانگ لە خۆشییان دەگری و پێش دەکەنێ
دیمەنی ڕوون و جگەر ســـــــــــووتاوە
ئاگـــــــــــــری دووری بە تین و تاوە
یەک یەکی گــرتنە هامـــێـــز ڕووخــۆش
هەوریــــــــە هەور و لە ڕوویا ڕووپۆش
پاش گــــەلێ مــــاچ و لە باوەش کــــردن
تیـــشکی زیوینی لەســــەر بەش کــــردن
چاک و خـۆشـیی لەگەڵ ئەستێران کرد
کــەوتە خـۆ و بووکی زەمــینی جــوان کرد

ئاوی کانیاوێ کە وێنە نوێنە
دڵی خۆی داوەتێ دڵ بزوێنە

* * *

شەوەکی و بولبولە ئەچریکێنێ
تا بەلاوک دڵی گوڵ بستێنێ
دە ئەتۆش هەستە خەیاڵی خاوم
من ئەگەر تۆم نەبێ زۆر داماوم!
لەم هەژارخانەیە بمهێنە دەرێ
بمبە دەشت و دەرێ بمگێڕە سەرێ
دەست و بردێ شنەبام بۆ زین کە
جێم دەگەڵ خۆت لە هەیڤ دابین کە
سەیری خاکی موکوریم دێ بە دڵا
تا نەچووین خۆم و دڵ و تۆش بە گڵا
سەرێ هەڵبێنمەوە لەو مەڵبەندە
گەرچی لەش دوورە لەوێ دڵ بەندە

### لاجان

دەشتی لاجانە بەهەشتی پێشووم
هونەرم گەر هەبێ، لەو ڕا تێشووم
ئێرە بوو لانکی یەکەم دڵداریم
لێرە هەڵ بوو سەرەتای خەمباریم
چاوی کارمامزێ خستمیە کەمەند
نازی پێ دام و دڵ و هۆشمی سەند
هێندە فرمێسکە لەوێ ڕشتوومە

هێندێ لەو ڕازە لەوێ ناشـــتـــوومـــە
بێــتــە دەر، گــوڵە لە خــوێناو، پڕ خــوێ
بێـــتـــەبەر درک و گـــوڵی لێ دەڕوێ!
چاوی من بوو بە درێژیی شـــەوگـــار
ملەبارانی دەگـــــەڵ هەوری بەهار
ڕادەمـــان دیدەکـــەم و ئەســـتـــێـــرە
کـــامی زۆرتر بەخـــەوی کـــەم فـــێـــرە
من و پەروانە دەمـــان کـــردە گـــرەو
کێ لە ســـووتان بە گـــڕە؟ من یا ئەو
گـڕ و یار کـێـیـە لە کێ جـوان چاکـتـر
شـــۆقی یار دەردەکـــەوت ڕووناکـــتـــر
ژینی شـــادیم لە ژوانگەی نێـــژرا
بە بژانگم گـــڵـــەکـــەی دابێـــژرا
بۆ بزەی لێـــو تەمـــەنی لاوم کـــوشت
بۆ ڕوانین، زووخـــاوی چاوم ڕشت
نرخی مـــــاچێکی دڵ و دینم دا
ئەمـــە چەرخی بە هەمـــوو ژینم دا
گـــەر چی نازدار و هەژار ڕێک نەدەهات
مـەخـمـەر و کـۆنە دەوار لێک نەدەهات
ئەوی من پێم گـــەیی دیســـان زۆرە
بەخـشـشی دەسـتی ئەوین سـەد جـۆرە
تــووشـــی دەردی دڵـــی دڵـــداران بــووم
شـیـاوی ناو کـۆمـەڵی خـەمـباران بووم
چاوی هەرســـــوورم و ڕەنگی زەردم

دڵی وا گەرم و هەناسەی سەردم
بیری سەرشێت و سەری شێواوم
چم نەبوو، پاکی ئەوین پێی داوم
گەنج و سامانی هەژاریم کە هەیە
سوودی سەودای سەری ئەو سەردەمەیە
شەوەکەی کورتە دەبا واز بێنین
دڵی هار چی دی نەهارووژێنین

ماسوو*

ماسوو، ئەو کێوە هەوارگەی دڵ بوو
جوانێ لەو نێوە گوڵی سەرچڵ بوو
لێک دەهاڵاین دەسمل شەوگاران
ئەو بەناز، من بە نزای دڵداران

قازیاوێ*

چۆمی قازیاوێ لە خێڵی خاڵان
شڵەژاندوومی دەگەڵ منداڵان
خانووە ڕەمڵینە لەلام خۆش بوو بەڵام
لێم دەڕووخایەوە، ئێستەش هەروام

پردی سوور*

پردی سوور، ئاخۆ لە بیرت ماوم
بە نەمامی لە دەراوت ڕواوم!

---

* ماسوو: گوندێکە لەنێوان لاجان و سابڵاغ، هەژار منداڵیی خۆی زۆر لەوێ بەسەر بردووە.
* قازیاوێ: گوندێکە نزیک سابڵاغ هەژار زۆر منداڵ بووە لە هەواری ماڵە خاڵانی کە لەسەر چەمی ئەو گوندە هەڵیان داوە ماوەیەک ڕای بواردووە.
* پردی سوور: پردێکی مهابادە گۆیا ئێرانی سەددی لێ دروست دەکەن.

سەردەمێک ڕێڕەوی دڵداران بووی
سەر لە ئێوارە مەکۆی یاران بووی
هەینوان جەژنە بوو دەوروبەری تۆ
بەزم و خۆشی بوو لە سایەی سەری تۆ
بەند و بەستێ هەیە بتبزوێنێ*
بشکێ ئەو دەستە دڵت دەشکێنێ

ئەوبەری گرد

گرە بەردێ هەیە لەوبەر گردە
ڕوو بە کوردایەتی بۆ من پردە
دوور لە چاوی چەتە، کوردیم دێنا
لێرە دەم خوێندەوە خۆم ڕاهێنا

باغی مکایل*

پێم بڵێ باغی مکایل، چۆنی؟
هەر وەکو پێشوو بە ڕەنگ و بۆنی؟
دیمەنی سەوزەگیا و دارانت
چۆنە؟ چۆن ماوی دەگەڵ یارانت؟
ئێستەکەش بۆ گەپ و بەزم و ئاهەنگ
دێنە لات کیژ و کوڕی شۆخ و شەنگ؟
لاوی دڵبەند و بەدڵ دڵتەڕ و ساز
کیژی پشتێن شل و چاوباز و بەناز

* بەند و بەست: گزییە و سەددیشە.
* باغی مکایل: هاوینان جێگە بەزم و داوەتە.

دڵ و لێـــو چەســـپی یەک و دەس لەملن؟
دێـنـە بـاوەشـت و بـە ســـــــەرتـا ئـەتـلـن؟
دیارە لێت ڕەشــبــەڵەکی لەش ســپـــیـــان
دێتـە گـوێت مـاچ و چپـەی ئۆخەی و گـیـان؟
بـۆت دەڵـێ «مـــامـلـێ» ڕۆژان و شــــەوان*
هـەروەها زۆرە لـە گـــــۆمـت مــــــەلـەوان؟
یـان قـــــوڵـەی شـــــینـی تـوڵـەی تـارانـی
دای گـــــەمـــــارۆت و نـەوەک جــــارانـی
بـاغـی ئـەوبەر بـە بـەر و فـــــــێـنـکـی دڵـن
یـان لـە بـێـگـانـە دژ و دڵ بـە کـــــــوڵـن؟

داری خەزایی*

دارە تـووی بـەژنـی خـــــەزایی مـــــاوی؟
هەر گــــەش و دڵ تـەڕی، یـان ژاکــــاوی؟
بە بەر و ســێـبــەری؟ کێ دێتــە ســوێت؟
کــوردی خــۆمــاڵـیــیـــە مــیــوانی نوێت؟
چـاوەکـــــــەی تـۆی دەنـوانـد هـەرمـــــــاوە
هـەر وەکــــــو چـاوی هەتـیـــــــو پڕ ئـاوە؟

گڕاو*

مــــەڵـێ ســــوێراوە گـــــڕاو جـێ نزمـــــە
بـۆرە خـــــزمـــــێـکی دوچـاوی کـــــزمـــــە

---

* ماملێ: گۆرانیبێژی ناوداری مهاباد محەمەدی ماملێ.
* خەزایی: کێوێکە لە شیمالی مهاباد، دارەتووێکی لە ناوقەدی هەیە کە لەسەر کانیاوێکە و بۆ سەیران دەچنەسەری.
* گڕاو: سەرچاوەیەکی ئاوی گۆگردییە کە بۆ خرووی پێست خۆی تێدا دەشۆن. ئاوەکە هەر کە لە سەرچاوە جویێ دەبێتەوە دەبێتە بەرد. ئەگەر گوێ لە سەرچاوەکە بگری هاژە هاژی دێ.

بەرد لە خۆی کۆوە دەکا پێم وایە
شۆڕشێ گەرمی لە بن سەردایە

### تاقەدار*

تاقەدار هەر بژی داری چاکی
بە ڕەگ و دڵ پتەوی بێ باکی
زۆر بە میوان و لە کەس ناپرسی
وەکو بێکەس لە تەرەس ناترسی
جاروبار بێژە بە مەحموود کانێ*
گۆڕە سەرباز هەیە سمکۆ کوانێ؟

### شاری مهاباد

دڵە وا شاری مەهابادە وەرە
کابەتە، ڕووگەتە، کڕنووشێ بەرە
تۆزێ لەو خاکە بە سەر خۆتا کە
تۆزی پیرۆزە لە دنیا تاکە
تۆزی چاوی دڵی نابینایە
لێرە کل بۆ کلەکەی سینایە
لە چ جێ ناوی مەهاباد بێنی
بۆ هەمو چاوێ بەرز دەنوێنی

### شاری ئازایان

هەر هەبی، شاری نەبەردی و مەردی
جوانترین پارچە بەهەشتی هەردی

---

* باغی تاقەدار: دارێکە لەناو گۆڕستانێک لە ڕۆژئاوای مهاباد.
* مەحموود کان: گردێکە لە شیمالی مهاباد، سمایلاغای سمکۆ گەلێک عەسکەری ئێرانی لەو جێگەیە زیندە بەچاڵ کردووە.

ڕەوزە و لانی پڵنگ و شێران
جێی بە خوێن ڕشتنی خوێنمژ فێران
باوەشی گەرمی بداغ سوڵتانی*
لێرەوە تێپەڕی غەوسی سانی*
گیانی خۆی داوە بە تۆ شێخ بابا*
باوی شادی بوو ئەگەر ئەو مابا
لە پەنات ورگی مەلیک زادە دڕا*
ئاگری مەرگی عەجەم لێرە گڕا
گوللە سێ تیری تفەنگی سمکۆ
کەللە سەربازی لە تۆ کردن کۆ
کۆمەڵی ژینەوە، ڕۆڵەی تۆ بوو*
بوونی بۆ ساندنی تۆڵەی تۆ بوو
هەر لە زووڕا بە هەوای لای لایی
پێت نیشان داوە ڕچەی ئازایی
ڕەگ و خوێن، هێزی دڵ و ئەژنۆ بووی

---

* بداغ سوڵتان: ئەمیرێکی بەناوبانگە، سابڵاغ کە گوندێک بووە ئەو کردوویەتە شار. مزگەوتی جومعە دەستکردی ئەوە. سکەی پوولە وردەی لێ داوە کە لە مس بووە و لەسەری نووسراوە (ضرب فی ساوجبلاق).
* غەوسی سانی: شێخ عوبێدوڵاهی شەمزینانە کە لەگەڵ عەجەما شەڕی کردووە و تا نزیک مەراغەی گرتووە.
* شێخ بابا شێخی غەوسابات بووە، سەرەکی کۆمەڵێک بووە کە گفتیان لە ڕووسیای قەیسەری وەرگرتووە ئیستیقلال بدا بە کوردستان و ئەوانیش دژی تورکان شەڕ بکەن. تورکان بەو توهمەتە، دەگەڵ حەمە حوسێن خانی سەردار و سەیفەدین خانی سەقزی ئیعدامیان کردووە.
* مەلیک زادە سەرکردەیەکی عەجەم و خزمی شای ئێران بووە و بە لەشکرێکی زۆرەوە هاتووەتە شاری سابڵاغ. لە شەوێکدا سمایلاغا داویە بەسەریدا و قڕیان دە لەشکر خستووە و ورگی سەرکردەیان دڕیوە.
* کۆمەڵی ژک واتا ژیانەوەی کورد لەساڵی ١٩٤٢ لە سابڵاغ پێک هاتووە.

خەوپەڕێن و دنەدەر هەر تۆ بووی
کیژ و لاوانی بە خێوت کردن
کێ دەزانێ چییە ترسی مردن!
ئەو کچەی خشڵی سەری پەلکی گوڵن
گرژی ڕووی دوژمن و ئاگر لە دڵن
ڕۆژی خۆشی کە بزەی دەم چەمەنن
ڕۆژی مەیدان بە مەرگ پێ دەکەنن
کوڕەکان هەر وەکو دیمەن تەرزن
لای نەترسان یەکەمین سەر بەرزن

هەرای ژ.ک

ڕاپەڕێ کۆمەڵی «ژی، کاف» کوردی
چەپەڵی دیلیی لە داوێن شوردی
باغەکەت پڕ لە نەمامی بەر هات
کاتی خوێن ڕشتن و دانی سەر هات
تا لە سەرتا بلەرێ ئالاکەت
پاڵەوان بوونە فیدای بالاکەت

ورە بەرنادەن

دوژمن گەرچی بەزۆری و گزەبوو
دۆستە بێگانەکەش ئەو دەم قزەبوو
ناهومێدی کوڕی کورد ناناسێ
باش دەزانێ کە لە خوێنمژ ڕاسێ
خوێن ڕژا، ڕۆڵە کوژا، کەللە پژا
خوێن ڕژان خۆشە کە ئابڕوو نەڕژا

ناوی بەرزت لەسەرووی بەرزان بوو
بۆ گورگ لاشە عەجەم هەرزان بوو

**خۆبەخشین**

گەرچی کەوتیتەوە بەر چنگوڕی دەڵ
گەرچی هێندێک لە چەمت بوونە چەقەڵ*
زۆر کوڕی وات هەبوو خۆیان بەخشی
خوێنی گەشیان گوڵی تۆی پێ نەخشی
گۆڕی پیرۆزی حوسێن و قازی
باشترین بەڵگەیە بۆ شانازی*

**دڵدانەوە**

نەچی دڵمەند بی لەوەی هاتە سەرت
زۆر کەسی وات هەیە بمرن لەبەرت
دوژمنت پێی وە نەبێ بۆی دەلوێ
کوڕە کورد خەنجەرەکەی بۆ دەسوێ
ئاو نییە خوێنی شەهیدان نەوتە
هەڵ دەبێ و هەل لە ژیان هەڵکەوتە
لاشی لاوانی وەبن گڵ کەوتن
وان لەلای ئێمە لەناو دڵ خەوتن
هەر بینا شۆڕشەکەت هاتەوە گەڕ
سەرنەوی بوو عەجەمی پاشڵ تەڕ
خەنجەرم چەرمی لەبەر داماڵی

* مەسەلێک هەیە: چەم بێ چەقەڵ نابێ یانێ هەموو گەلێک خائینی خۆی هەر دەبێ.
* حەمە حوسێن خانی سەیفی قازی فەرماندەی لەشکری کوردستان و، پێشەوا قازی محەمەد سەرەک کۆماری کوردستان شەهید کراون و لە سابلاغ نێژراون.

خـــوێنی خـــۆی لاش و ســـەری ڕامـــاڵی
وا بەگـــیـــــر دێتـــــەوە ڕێی نـابێ هەڵێ
مـــەمکوژە و هەرچی دەکـــەی بیکە، دەڵی
وا تەمێ دەکـــرێ لە فـــێـــرگـــەی شـــۆڕش
تاوی داو بچـــــتـــــەوە گـــۆڕی کـــۆرش
کـــــــــــوردەواری لـە دەمـی بـێـگـانـە
شـــیـــــرە تریاک نـیــــیـــــە وەک سندانە
ئەوی لای وایـە کـــــە تۆی پێ دەخـــــورێ
ئـەبـێ تـاڵاوی بـە دەمـــــــــــدا بـکـرێ

خوشیی دواڕۆژ

با بەخـــوێـن لاچێ پەڵەی دەس پیـــســـــان
دەشـــــەکێ لەو ســـــەرە ئـاڵا دیســـــان
لاوە کـــــــوردت هـەیـە ئـاڵا هـەڵ کـــــــا
لاوەیـی نـاشـێ دەسـی تـێـکـەڵ کـــــــــا
دەڕەوێ تـۆز و تـەمـی ژێـر دەســــــــــتـی
دەیگرین ڕەشـــــبـــــەڵەکی بەربەســـــتی
پیس و چاوشـــۆڕ ســەری پێ شـــۆڕ دەکـــرێ
گـــۆڕی داگـــیـــرکـــەری پێ گـــۆڕ دەکـــرێ
لاوی ئـازا و کـــــــوڕ و مـــــــەرد و ڕەنـدت
زۆر کـــچی گـــوڵبـــەدەم و لێـــو قـــەندت
شـــان بە شـــان دەس لە دەســـا گـــۆوەندە
ڕێکی یـەک دێنەوە شـــەندە و مـــــەندە*

---

* مەسەلە دەڵێن: شەندە لە مەندە کەمتر نییە، یانی هەموو کەس وەک یەکن لە ماف و بەشدا.

پێ کە ئەیدەن بەزەوی بوولەرزە
زەردە لیمۆ دەلەرن لەو بەرزە
گۆڕە سەگ ئەو دەمە وا دائەتەپن
تا زەوی زەوییە، ئیتر لێت نەحەپن

خۆم چۆنم!

من بە بێ تۆم کە دەپرسی چۆنم!
لە تەشەندایە برینی کۆنم
دوور لە بالآت لە ژیانم زیزم
سیس و بابردە گەڵای پاییزم
چاوەکانم کە لە چاوگەت دوورن
وەک سەری کوڵمی کچانت سوورن
ڕەنگی خاڵ و کەزییان جەرگی ڕەشم
وەک کەمەریان شل و باریکە لەشم
ڕەنگ و ڕووم زەردە نەوەک گەردنی زەرد
زەردی بێگەردییە ئەم، ئەو هی دەرد
لەش بەبار، تۆزی گیانمی پێوە
لە لکە و وەک لکە باری لێوە*
نەشەوە شەوم و نەڕۆژم ڕۆژە
داخ لە دڵ بوومە گڕێی بەرکۆژە*

---

* لەش بەبارم یانی نەخۆشم یان لەشم بەرێکی هەیە کە ئەویش تۆزێک گیانە یان گیانم وەک تۆز لێی نیشتووە.
* گیانم لەسەر لکە و لە کەوتن و وەرین نێزیکە و وەک پەڵەیەکە بەسەر لێومەوە، وا ئەزانن بارە لەسەر لێوم نیشتووە.

هێندە نێزیک و هەلێک نات بینم
لە وزەم دەرچوو نەگێڕم شینم*
دڵە، پیشەی کوڵە، ناڵینە بەشم
سەری هەڵگرتووە فرمێسکی گەشم
کاتی وا نەبووە لە دڵما لاچی
تا ژیان ماوە لە بیرم ناچی
سوێند بە خۆت بشچمە ژێر گڵکۆوە
گیان پەپوولێکە بە دەوری تۆوە
نمەکت بم گرێ گەر لێت لادەم
لەو جیهانیش بە بەهەشتت نادەم
بۆ سولەیمانی کە نالی ناڵی
وەک مە نەیچێشتووە تامی تاڵی
نە سولەیمانی وەکو تۆ جوانە
نە دڵی نالی چزا بەو ژانە
«خاک و خۆڵ» ببوە گڕوی گریانی
من چ خاکێک بەسەرم، دوڕدانی!
تۆ چۆن ماوی!
چۆنی تۆ؟ چۆنە دەر و کۆڵانت؟
دیمەنی بەرز و خڕ و خۆڵانت؟
هەموولا کۆنە گراوی خۆمن
مەمی بێچارەم و زین بۆ من

* وەک دوگمەی سەر سنگ و یەخەم کە لە سنگ نزیکە و نایبینی و زۆر بەداخەوەیەو جەرگی کون کونە.

سروەکەی قۆرغێ شنەی بێ گەردە؟
وەک هەناسەی منە بۆ تۆ! سەردە؟*
گەڕەکی شوان، دڵی هەر وا گەرمە
چاو ڕەقی هەر هەیە یان چاو نەرمە*
ئاوی گەرماوی شوجاع هەر شۆرە؟
شەوی جێژنان هەیە سەر لەنگۆرە؟*
دیاری شایانە کە بدرێ پێشکێش؟
توور و کاهوو، کەلەمی شادەروێش*
ڕزگەیی یادێ لە ئاوارە دەکا؟
مەولەوی دەردی دڵان چارە دەکا؟*
نوێژگەیێکیش هەیە لەو دەوروبەرە
باغ و بێستانە مەلای سەلکە کەرە
ماڵەکەم یادی جوانی خێر بێ
هەر کەسی ئەمنی لە تۆ کرد کوێر بێ
سێبەری باو لە سەرم بوو ئەو دەم
باغی شادی لە بەرم بوو، ئەو دەم
دوورخرام وا لە کەس و خوشک و برام
گێژی تاریکە شەوم، دوورە چرام

---

* قورغ: قۆپییەکە لە مهاباد- بای قورغی: بایەکی ساردە.
* گەڕەکی شوانان: گەڕەکێکی لادێییانە و گەرمە لە ڕۆژاوای سابڵاغ. * چاوڕەق: خێزانێکن لە گەڕەکی شوانان شکست هەڵدەبەستنەوە.
* حەمامی شوجاعولمەلیک لە مهابادە و ئاوەکەی سوێرە.
* شادەروێش: مزگەوتێکە کەلەم و توور و کاهووی کە لە حەوشەیدا دەکرێ بەناوبانگە.
* ڕزگەیی: گەڕەکێکە ماڵی هەژار لەو گەڕەکە و نێزیک مزگەوتی ڕۆستەم بەگ بووە کە مەلای مزگەوتەکە جاشی عەجەمە. * مەولەوی نازناوی بنەماڵەیێکە بژیشکی دەکەن

خاڵە سوورەت چ دەکا؟ هەر چاکە؟
یاخۆ داکەوتووە، ڕێکی خاکە*
خانەقای نەهری بە خوێن ڕەنگاوە
ڕێی شەهیدان بووە بەڵگەی ماوە*
گوێم لە شێخ قادرە بانگ ئاوازی
بۆ گەلی کوردە بەسەد شانازی
بەر بەسێدارە دڵت ڕانەچەنێ
بۆ وەتەن بمرە ژیانت ئەدەنێ
چۆنە مزگەوتی هەباساغامان؟
تات و بەر سێبەر و تووی، هەر وا مان؟
وەکو ئەوسایە فەقێ دەخوێنن؟
وەکو من دەقنە لە مالآن دێنن؟
کە دەڵێن ژینی منالّی گەمە بوو
ئەو دەمە جێ گەپ و گاڵتەم ئەمە بوو
گاڵتەی ئەو سەردەمە
خواس و سەرقووت و لە خۆڵا گەوزیو
پیتی چووی پەل بوو بەدەستی قەڵشیو
ئیوهییە، تەوغییە، شەگگە و چک و پک
لیکی زاری دەتکاندم تک تک
وەک هەلووک لێر و لەوێ هەڵدەبەزیم
سواپ و شێشۆقە بۆ چارەی وەڕەزیم

* خاڵەسوورە: چاکێکە لە گەڕەکی قولە قەبران لە مهاباد، دارێکی بەسەرەوەیە.
* خانەقای نەهری: تەکیەی بەرەی شێخەکانی شەمزینانە و لە گەڕەکی سەرخڕێیە و هاوسای مزگەوتی هەباساغایە. * شێخ عەبدولقادر و شێخ محەمەدی شەمزینی لەلایەن تورکانەوە لە ڕێگەی ئازادیی کوردستاندا بەدارا کردان.

مەزرەقم یار و هەواڵ مەرمەڵ بوو
قۆچەقانیم چەکی راو و شەڕ بوو
خازەلی و حەنزەڵ و ئاورۆچکە بە گشت
تۆپەڕاکرن و کەری سووری بەپشت
یان مەلا تەق تەقە یان هەنگڵە شەلە
جێژنە بۆ ئەو هەلە رۆیی بەپەلە
جەغز و سوڕدانی بە دەوری خۆما
لەم هەموو چەرخە خولێکم بۆ ما
تازە وا بوومەتە گۆچان بەدەسێ
لێم وەدی دێتەوە حوللەی مەرەسێ
ڕۆژی ماندوو بە خەیاڵی شەو بووم
شەو لەبەر بەزم و گەمەم بێ خەو بووم
ڕێزە چوقڵێ کە لەسەر هەورازن
یاری بەرژانگی منن هاوڕازن*

دیسان گەڕەک و جوانەکانی

«سەرخڕێ» زۆرتری هەمووان بەشی تۆم*
کۆرپەیێکی خڕەکەی باوەشی تۆم
یەکەمین جێیەکی، لێم دانا پێم
کوری خۆتم، بتەوێم یا نەتەوێم
گەڕەکی «قوبڵە» نەبوورین پێیدا
بێ سەر و شوێنە «وەفایی» تێیدا*

---

* بەرانبەر بە مزگەوتی هەباساغا لە بلّندییەک ڕیزە دڕکێک هەبوو.
* سەرخڕێ: گەڕەکێکە لە مهاباد هەژار لەوێ لە دایک بووە.
* گەڕەکی قوبلە جێگەی وەفائیی شاعیری بەناوبانگ بووە. لە شیعرێکیدا دەڵێ: «وەفایی ئاخیری خێر بێ دەمێکە بێ سەروشوێنە» ، شیعری: «شیرین تەشی دەڕێسێ» لە شیعرە هەرە بەناوبانگەکانیەتی.

شیرنێک لێرە بەناز تەشیەکی ڕست
شیرنی کۆکەنەکەی لە برەو خست
«گەڕەک ئەرمەنیە» بەهەشتی گۆڕین*
ڕوو لە هەر لایە دەکەی هەر حۆرین
سەردەمێک چاوڕەش و چاوشینێک بوون
بۆ سری جەرگی تەزیو تینێک بوون
«سەرپلوسک» دڵ و چاوم لەویە*
بەرەگە و ڕێڕەوی ئاسکی کەویە
سۆفی گەر بەزمی بەهەشتت گەرەکە
تویژێ باوێژە، وەرە ئەم گەڕەکە
«پش قەڵا» دێن و دەچن ئێواران*
دەس لەمل تونگە لەشان نازداران
تاخی «حاجی حەسەنی» لەو پەڕیە*
حەجی سەر وشکی نیە، دڵ تەڕیە
دڵ بەخەم وەرگەڕێ زووی دێننەوە جێ
گەرمە ماچ خێرە لە جێ دەچنە حەجێ

ناو بازاڕەکە

بۆ هەژار دیتنی بازاڕ دەردە
دەس کە واڵایە دەسی لێ بەردە
تۆ بڵێی، تازە بخۆن تێر و تەسەل
چای عمادیش و کەبابی حەمە شەل!*

* (گەڕەک ئەرمەنی) و (سەرپلووسک) و (پش قەڵا) و (گەڕەکی حاجی حەسەنی) لە گەڕەکەکانی مهابادن. * سەرپلووسک و پش قەڵا: سەرچاوە ئاویان هەبوو، کیژان ئاویان لێ دەهێنان.
* عیمادی: چایچییەکی مهابادی و * حەمەشەل: کەبابچییەکی بەناوبانگ بوو.

خەڵکی بازاڕە کە هەروا مەردن!
گوڵی بەر دۆست و لە دوژمن بەردن!
چاخی دژواری لە مەیدان دەچەقن
تای تەرازووی یەک و تێکڕا دەتەقن!
هەر بە بێگانە دەکەن گاڵەی خۆش
دەردی سەرتیپە تەماتەی بێهۆش!*

بەستێن*

دڵە سەیرێکە لە دەم بەستێنێ
دیدە مەستێک لە منت نەستێنێ
چاو کەژاڵانی لە چەم ئاو دێنن
دەم بە جادوون و دڵان دەڕفێنن
پرچە پڕ چینە، کراس هەر چینە
هەر نزای گیانە لە ڕێی ئامینە

چوار چرا*

چوارچرا ڕەنگە ببیسێ دەنگم
وام لەسەر تێزە هەواخوای جەنگم
بەشخورا و مەرگی دەوێ ئاشتیخواز
گریدار ناشکێ بەبێ بیور و پواز

---

* ساڵێک پەهلەویی شای ئێران سەرتیپ هۆشمەند ناوێکی نارده سابڵاغ کە بەزەبروزەنگی خۆی سەرڕەقیی خەڵکی مهاباد نەهێڵێ. ڕۆژێک سەرتیپ دێتە ناو بازاڕ لەپڕ وەک بارانە تێکوڵە شووتی و تەماتە ڕزیوی بەسەردا دەبارێ و ئیتر سەرتیپ هەر ئەو ڕۆیشت ڕۆیشتنە ڕۆیشت و نەهاتەوە، بەڵام ناوی دەرکرد بە سەرتیپ باینجان.
* بەستێنی چۆم: سەیرانگای ئێوارانە٠
* چوار چرا: جێگەیەکە لە نزیک بەستێن، قازی محەمەد و سەدر و سەیف و چەند کەسێکیان لەوێ بەدارا کردووە.

تۆزێ ڕاوەستە، ئیتر گوێ هەڵخە
ڕاخە کەوڵی عەجەم و خوێ هەڵخە
دەچەقێنینەوە داری تۆڵە
شاخی شاخدار دەپەڕێ بۆ کۆڵە*

کووچەی جوولەکان*

ڕوو لە کۆڵانی جوان کەین نامە
لە هەمووی بیرەوەریی خەییامە
ئەوی تێی نەچووە دڵی پڕ لە خەمە
تەنگ و تاریکی هەبێ: پرچ و دەمە
ئەو کچە جوانە کە مەی دەفرۆشن
نازی چاوانە بە مەی دەفرۆشن

جا چبکەین؟

لە هەوار «مامڵێ» مریەم بێنێ
هێند بە ئارامی کە شیر نەڕژێنێ
جوانە چارۆکە بە دابی بڵباس
لە پەڕی مێشێ تەنکتر بێ کراس*
ڕەنگی خۆش بێتە پەنای دەنگی خۆش
شێت و شوورن دەمی خۆش بیر و هۆش
بەستەییێکی من و ئاوازی ئەو
ڕازی دڵخوازی من و سازی ئەو

---

* مەسەلێکی مەشهوورە دەڵێن: خوا هەقی بزنی کۆڵە لە شاخدار دەستێنێتەوە.
* کووچەی جوولەکان جێگە مەیخانە و بەزمی لاوانە. گۆرانییەک هەیە دەڵێ: کووچەی جوولەکان تەنگ و تاریکە + یەکێکی تێدا کەمبەر باریکە.
* هێندێک لە گۆرانییەکانی مامڵێ بەم ناوانەن: «هەوارە، مریەمێ سابڵاغی، ئارامی گیانم کوڕە مەکە، شیرەکەم لێ دەڕژێ هەتیو مەکە، چارۆگێ چارۆگێ، کراسێکی دەبەردا تەنکە وەک پەڕی مێشێ».

**وەرگرین بادە لەدەست مەیگێڕێ**
**خۆش و مەستانە بڵێین چەند دێڕێ**

**بەستەکە**

**ئەی مهاباد گوڵی سەرتۆپی زەوی**
**زیاد لە هەر جوانێ وەبەر دڵ دەکەوی**
**هەر کەسێ جارێ ئەتۆی ناسیبێ**
**خۆش و جوانتر دەبێ چی دیبێ!**
**کێیە ژیا بێ لە بەهەشتی خوادا**
**دڵی هەڵ دەگرێ کە لای لێ لادا!**

**ئەدی بۆ بێ دەنگن!**

**هۆنەر و نووسەرەکانت لە چییان**
**چۆنە تا سەر بە هەوای تۆ نەژییان؟**
**«خالەمین» زیرەک و پسپۆڕی چییە***
**چاوی سوور و تەڕی وشک و سپییە!**

---

* خالەمین: شاعیرێکی زۆر باشە لە مەڵبەندی مهاباد، لە شیعری خۆیدا گوتوویە:
خاڵی خۆو لێک دەکاتەوە بۆتان
دۆست و دوژمن، چ زیرەکە و پسپۆڕ
بەهومێدی خودا و پێغەمبەر
بەدڵی گەرم و چاوی سوور و تەڕ
کوردەکان چییدی سەرنەوی نابن
هەرئەوەندە نەختێ بۆ خۆ ئازابن
ئەو کوڕانەی کە ڕوو بەمەیدان دێن
دەیگرن تۆپی زل بە دەست و زوخاڵ
بچۆ لای کوردە، کاکی ژیر و زرینگ
چونکە جێی کوردە دەس بنێ سەرسینگ
پێی بڵێ خالەمین دەڵێ تاکەی
گەنم و جۆ چان و جرینگە جرینگ
وا بەسەر دوژمنا دەگوڕێنن
وەک لە کەروێشکی هەڵدەکێشێ تەماڵ

تۆپ بوو، ئەو تۆپی کە دەیگرت بە زوخاڵ
گەنم و جۆ چاندنی هەڵنا بە تەماڵ!
«سەوزە سیس» نێوی دەنێ کاری بەجێ:
نیوە نووزەی مەم و سیامەند و خەجێ!*
ئەمە دەرمان نییە بیفرۆشێ بە گەل
دەردی زۆری دەوێ شەل دەرچێ لەزەل
«هێمن» ئەو بولبولە سەر بێتووکە
چۆنە لێی نایە چ جووکە و نووکە!*
کوانێ ئەو سینگە کە «ماژینۆ» بوو!
سەر لە مەیدانی نەبەردا گۆ بوو
وەکو بیستوومە لە مێروولە بەزی
دڵی وا گەرم و گوڕی سەیرە تەزی!
کوا تفەنگی دەس و ڕاوی کامە!
گۆشەگیری چییە ئاغای دامە
بۆ دژە و ئەژنۆ دەباوەش دەکرێ
یان بەسەر بەرزی بژی یان بمرێ!
نیشتمان هەر کەسی بۆ بمرێ نەمرد

* سەید عەبدوڵڵا ئەیووبیی دەرمان فرۆش: نووسەر و مامۆستای دانیشگایە، دوو کتێبی چاپ کردووە بە تەرجەمەی فارسییەوە «چریکەی مەم و زین و چریکەی سیامەند و خەجی».
* هێمن: شاعیری زۆر بەناوبانگی مهابادە، هێندێک لە شیعرەکانی کە لێرەدا ئیشارەیان پێ کراوە ئەمانەن: (ئەو بولبولەم ئەمن کە دەستم کرد بە ناڵەناڵ + بێدار بۆوە میللەتی کوردی بە خوێندنم)، بۆ نیشتمان دەڵێ: (لە باتیی ماژینۆ سینگم قەڵای تۆ)، پاش لێقەومان لە شیعرێکیدا گوتوویە: (لە مێروولە بەزیم)، شیعرێکی خۆشی لەسەر تفەنگی ڕاو و گەمەی دامە هەیە. لە جێگەیەکی تریشدا دەڵێ: (هەمنشینی گۆشەیی تەنهایی هەر ئەژنۆکەمە + بۆیە ڕۆژ و شەو وەها گرتوومەتە نێو باوەشم). لە جێگەیەک دەڵێ: (عاشقی چاوی کەژاڵ و گەردنی پڕ خاڵ نیم + عاشقی کێو و تەلان و بەندەن و بەردم ئەمن). شیعرێکی هەیە بە وەلیعەهدی پەهلەویی هەڵگوتووە.

لەشی سەر دۆشەکە هیچ بەهری نەبرد
دەبا بیشێلم
لێم گەڕێ دڵ بەزوخاو و خوێنم
با لە دوور دوورە برام بدوێنم:
کاکە مەرجی من و تۆ کوا وا بوون؟
کەی تیانا بوو لە یەکدی جیابوون؟
هەرچی دەرد و کوڵە بەر من بکەوێ
تۆش وەکو خۆشی بە جێمێنی لەوێ!
بیر و پێنووس و دەس و دڵ یەک بوو
دوانەیەک بوون و بە دەم یەک چەک بوو
تۆ ئەویندارى تەلان و بەرد بووی
دژی سای گەردن و زێڕی زەرد بووی
سوێند و پەیمان بوو نەگۆڕێی، گۆڕای
وازی وازی لەسەری دای دۆڕای
بولبولی کورد وەکو قەل دەنوێنێ
بێزی بێ بۆ کوری شا بخوێنێ
باڵی بشکێ و پەڕ و پۆی هەڵبوەرێ
مەل بکا زەمزەمە بۆ جاشە کەرێ
ئەوە چت کردوە بێ من، هێمن؟
تێر و تانەت فرە لێمن، پێمن*
نەت کرا بدڕی لە خۆت ئەو پەردەی
دەس لە گۆشتاو و پلاوێ بەردەی!

* تیرت لە منن و تەنانەت بە منن.

لێم ببوورە کە ئەوەندە بەرلۆمی
شینە بۆ خۆمی دەکەم، تۆش خۆمی
ئێستەکەش نەچوە بچێ چوو ڕۆیی
وەرەوە ناو گەل و خزم و خۆیی
بۆ گەلت بێژە هەتا ڕۆژی مەرگ
بێ منەت بێ تمەن و نان و بەرگ*
ڕکەراکە و ببە هاودەنگی خۆم
بێ کرێژ بەو ببە هاوڕەنگی خۆم
با دەسەومل مەلی بێچاران بین
هەر «هەژار هێمن»ەکەی جاران بین*
نیشتمان وەک مەلە، نووسەر باڵە
هەر مەلێ باڵی شکا جێی چاڵە
دڵە وشیار بەوە مەستی بەستە
ڕێووشوێن بەر مەدە خۆ دابەستە
پاش ئەو مەستییە گەشتێ بکەین
بەرەژێر ببیەوە نوێژگەی سوورە
زۆر مەلای لێن کە نەچووم ببوورە*
لەو مەلایانە یەکێ زل جاشە
خەرتەلە و چاوی لە پێنج شەش لاشە

---

* ئەو بیتانەی منەتیان لێ دروست بووە پیتی تمەنیشن، تمەن بێ منەت واتا نەمێنێ.
* ئەوەندە لە مهاباد هەژار و هێمن دۆستایەتی و تێکەڵاوییان هەبوو خەڵک لێیان گۆڕابوو کامیان هەژارە و کامیان هێمنە، بەهەردووکیان دەگوت: هەژارهێمن.
* مزگەوتی سوور: کۆنترین بینایەکە لە بداغ سوڵتان ماوەتەوە و ئاواڵ دووانەی پردی سوورە.

تاخی «دارۆغە»یە جێی بیرەوەری
بیر ئەوێستاش دەگەڕێ دەوروبەری*
ترسی دارۆغە نەمابوو ئەو دەم
دڵ بە ئاواتێ ژیابوو ئەو دەم!
«کوپێن ئاوا» دڵی هەر ئاوا بێ
زۆر دڵاوا بوو سپاردەی خوا بێ*
تیری چاوبازێ لە جەرگم ڕاچوو
کوشتمی و خوێنەکەشم هەر وا چوو

## لەسەر داشا مەجید

وام لە سەر «داشە مەجید» وێستاوم
گیانە گەش بۆتەوە، ڕوونن چاوم*
دڵە بێ دیدەنیی ئەم دیمەنە کە
«لالە باس» یارە لە گۆمی «تەنەکە»*
«مێشە کورتانی» ببینە و «یەرغو»
بێرە دا باری مەنیج تێپەڕ بوو*
دڵگوشایە و گەشە «باغی سیسە»
ترسی ئەو ناوە لە چاوی پیسە*
ئاوێ ئەسکەندەری لە شوێن وێڵ بوو
لە کن ئەم ئاوە خناوو لێڵ بوو

---

* گەڕەکی دارۆغە و کووپێن ئاوا: دوو گەڕەکی مهابادن.
* داشا مەجید: کێوێکە لە ڕۆژهەڵاتی مهاباد.
* لالەباس: باغێکە. * گۆمی تەنەکە: لە نزیک ئەو باغەیە.
* مێشەی کورتانێ: مێشەیەکە لە خوار مهاباد و یەرغوو چۆمێکە هاوینان وشک دەبێ. گۆرانییەک هەیە دەڵێ: مەنیج بارگەی تێک نا گەییە بارگەی کورتانێ، مەنیج بارگەی تێک نا هات گەییە پردی یەرغوو.
* باغی سیسە: سەیرانگایەکی خۆشە لە مهاباد.

«کانیی مام قەنبەر»ە لێی بڕوانە
دیمەنی جوانی دەمی جێژنانە*
پڕکەژاڵ، ئەو کەژە زەردە و سوورە
چت دەوێ بەر دەمە، هەر خەم دوورە
پیرە سەر سەوزەکە «ئەسحابە سپی»
بوویە پێشێلی عەجەم بۆیە کپی!*
تووکی تۆ وەرگەڕێ تەخی تاران
تا بەهار ببیەوە جێی دڵداران
«گومبەزان» جێگە نیاز و ڕازە
چیت نیازە وەرە لێی بخوازە*
کورد و ئازادی بە یەکتر شاد بن
دوژمنان ببنە گڵ و بەرباد بن
«باغی شێخی» گوڵی ناو باغانە
سەیری هەتوانی جگەر داغانە*
سەر لە ئێوارە سەرێک هەڵبێنە
ژین وەسەر بگرەوە خەم بپسێنە

مالئاوایی

چۆن وەها شارێ لەسەر دنیا بێ
بە خەیاڵا دێ کە مانگ ئاوا بێ
سا مهاباد بە هومێدی دیدار

---

* کانی مام قەنبەران: جێگە بەزمی ڕۆژی جێژنانە.
* ئەسحابە سپی: زیارەتێکە و خەڵک بەهاران دەچنە سەیرانی.
* گومبەزان: گۆڕخانەی بەرەی بداغ سوڵتانییە و زیارەتگایە.
* باغی شێخی: باغ و باغچەیەکە لە قوبلەی مهاباد، ئێوارانە خەڵکی لێ کۆ دەبێتەوە.

تاکو دەتبینمەوە ئازا و ڕزگار
با لەشار دەرکەوین
داوەتم دێنیەوە بیر «زاوا و بووک»
وەک سەری هێمنی بۆر و بێ تووک*
لێرە «لاچین» وەرە «شیلاناوێ»
کۆنە لانمانە بمێنین تاوێ*
شایی هێمن بوو هەژار هەڵدەبەزی
دۆیەکی هاتە دەس و جەرگی تەزی

سارەوانانە*

سارەوانانی تەمەن خۆش ئاژۆن
بێ وچان دەیدەنە بەر تازە و کۆن
«سارەوانانە» دڵت بۆ لادێ
هیچ لە دڵتا هەیە یادی یادێ!
بە نەمامی گەش و شەنگ و شل بوو
بە نەکامی بەر و مردن کل بوو!

بەسری*

لەو بەرەت «بەسری» دەسی دز ببڕە
لەو سەرەت ئارەقی ماندوو بسڕە

---

* زاوا و بووک: کێوێکە لە نزیک مهاباد و لەسەر ڕێگەی گوندی لاچین و شیلاناوێیە کە ماڵی خانەدانی هێمن لەوێ دەبن، هێمن کە ژنی دێنا هەژار برازاوا بوو و لە داوەتی کە لە شیلاناوێ بوو بەشدار بوو.
* سارەوانانە: گوندێکە نزیک مهاباد، دایکی هەژار کە سەیدزادە فاتمی کچی سەید محەمەدئەمینی نوورانییە خەڵکی ئەوێ بووە و زۆر بە گەنجی جوانەمەرگ بووە.
* بەسری: کێوێکە لە ڕۆژهەڵاتی مهاباد زۆر زۆر جار دز و جەردەی لێ دەبێ.

## سەری سوڵتان

«سەید وەقاس» هەر بەگەڕی ڕەش بەڵەکی
وەکو جاران بەکڵوک و کەڵەکی!*
خۆشی بۆ تۆیە دراوسێ جوانی
دۆستی تۆن «قەمتەرەیی» و «دەرمانی»
لایەکت «چۆمی مەجیدخانی» بەرین
ماڵ و قۆپی هەموو پڕ پۆڕ و پەرین
ڕاسپێرە لە قەلا بۆ «کاکم»
هیچ قسەی ماوە! دەڵێ بێ باکم!*
گەیوەتە کوێ! شەڕی ئاغا و گوندی!
سەیرە دنیا کە چلۆن بوو، چن دی!
کۆنە «سوڵتان» و «سولەیمان» ڕێوبن
شێت و خووداری خەتەی بێ خێوبن*
کۆسە بۆ ڕیش دەگەڕا و بۆ جاشی
داشی هات کلک و سمێڵی تاشی*

ئیساکەند*

باشە شەوباشێ لە «ئیساکەند» کەین
یادی یارێکی دەم و لێو قەند کەین

* سەید وەقاس: کێوێکە لە نێوان چۆمی مەجیدخان و لەناو قەمتەرە و دەرمان و بورهاندا، گۆڕێکی لێیە گۆیا جێگەی سەعدی وەقاسی ئەسحابەیە، چوارشەممەی بەهاران کچ و کوڕ دەچنە سەری و داوەتی ڕەشبەڵەکی لێ دەگرن و نیازی لێ دەخوازن.
* کاک: نیاز مەلا ئەمجەدی قەلایە کە نازناوی شیعری کاک بوو.
* سوڵتان ئاغا و سلێمان ئاغا دوو ئاغای زۆر دەوڵەمەند و دەست ڕۆیشتوو بوون لە چۆمی مەجید خان و دژی کۆمەڵە بوون.
* داشی: بە شەلاتی تارانی دەڵێن.
* ئیساکەند: گوندێکە لە موکریان هەژار لەوێ ماوەیەک فەقێ بووە و وا دیارە لەگەڵ سەیدزادەیەکا دڵداریی کردووە.

شاڵ شلێ چاو بەکلێ لێو ئاڵێ
چوێلەکێک بووم بە دەسی منداڵێ

سەید کاکەجان*

«کاکە جان» پیری «سەهۆڵان» هەرهەی
نیاز ڕەوای لاو و کچۆڵان هەرهەی!

بەرەو پیر

گیان لە ڕێ چوونی بەلەز دەمدا هان
کەوتە بەر کێشەری «پیری بورهان»*
مانگە زەرد بوویەوە؟ ڕۆژت دیوە؟
دیارە تۆ بەر لەمنت ناسیوە
دڵە دامرکێ خەیاڵ لێم لادە
گیانە بۆ دیتنی پیر ئامادە
«کانی دولمانە» لەسەر ڕێگامان
خۆت بشۆ بێ چەپەڵی بێ ئامان
جێ گەلێ پاکە ئەتۆش خاوێن بە
بۆ هەموو سووچێ دەسەو داوێن بە
لە «لووساوکانە»وە خۆش ڕاببرە
دەس بەدەم نەوسی چنۆکا بگرە*
لە هەموولاوە گوڵ و گوڵزارە

---

* کاکەجان: چاکێکە لە نزیک گوندی سەهۆڵان لە موکریان کیژ و کوڕ داوەتی لەسەر دەگرن و نیازی لێ دەخوازن.
* پیری بورهان: نیاز شەمسەدین شێخ یووسفی بورهانییە کە لە نزیک شەرەفکەند لە جێگەیەک بەناوی خانەقا نێژراوە و ئەو خانەقایە جێگەی فەقێیەتیی هەژاربووە
* کانی دولمان و لووساوکان: دوو جێگەن لە خانەقا.

شینییە جوانییە ئاوە و دارە
دڵی شێت چەپکە گوڵێکیش بچنێ
باشە هۆشی هەبێ هێشوو نەڕنێ

گومبەز

گومبەزی سپیە وەکو ڕووی چاکان
پاکە وەک گیان و دڵی دڵپاکان
سەدەفە و گەوهەری یەکتای تێدا
بارەگاهێکە شەهەنشای تێدا
ماڵی سەرخێڵی خوداناسانە
بێرەدا چوونە بەهەشت هاسانە
لێرە کەشکۆڵی هەژاری تژییە
هەرچی ئێرەی هەیە چاوی لە چییە!
ڕۆژێ تینی بە گەشە و تیرێژە
ڕۆژێ دینی گەش و تیشک ڕێژە
تیشکی ئەو کاری بە خۆڵ و خاکە
شۆقی ئەم گیان لەبەری ڕووناکە
گیانە تا هەل هەیە لەو جێ گەورە
بدە حەو جاری وەکو حەج دەورە
لێی بپاڕێوە نزا لە خوا کا
با گرێی کاری هەژاران ڕاکا
کوردی بێچارە هەتا کەی دیل بن!
تۆق و کۆت هاودەمی پێ وو پیل بن!
خوا نەناسان و چرووک و پەستان

بەس بگەوزن لە چیای کوردستان
بەزەیی هەوری لە کەژمان هاڵێ
زبڵ و زاڵی دەسی زۆر ڕامالێ

سەید ڕەشید*

وەرە سەر گۆڕی شەهیدی دڵتەڕ
هەموو دنیا لەبەرێ ئەو لەو پەڕ
«چاوەشی» پیر بە هەوای زانستی
لە ملی شێری دەخستن ڕستی

نوورانی و مەولانا*

گۆڕی نوورانییە، مەولانایە
کەسی وا گەورە لە مەولا نایە

لەسەر گۆڕی دایک و بابم*

گیان وچانێ لەسەر ئەم دوو گۆڕە
دڵە خوێن هەڵ بدە چاو داچۆڕە
دای و باب لێرە بە خاک ئەسپێران
بە پەکوو بوومە پەپووی جێ وێران

دایک ئەدوێنم

دایە شەوگاری درێژ گریابووی
بۆ کوڕت دڵ بەنزا و بریا بووی

---

* سەید ڕەشید: عالم و شاعیر و قسەخۆشی بەناوبانگ، لە شیعرێکیدا کە لەپەسندی شێخی بورهاندا بیگوتایە نازناوی چاوەش بوو، لە ئەشعاری تریشدا شەهید بوو.
* نوورانی: سەید حەمەسەعیدی کولێجیی عالمی بەناوبانگ، کە مامی دایکی هەژارە.
* مەولانا: مەلا سادقی خەلیفەی شێخی بورهانە کە پردی قەرە قشلاغ و قەڵاتاسیان و ڕێگەی بەسری ئەو دروستی کردوون. مەولانا خاڵی باوکی هەژار بوو.
* باوکی هەژار مەلا محەمەدی شەرەفکەندی لە تەمەنی ٦٥ ساڵیدا لە کاتێدا کە هەژار تەمەنی ١٧ ساڵ بووە، مردووە و لە خانەقای شەرەفکەند لە پەنا گۆڕی دایکی هەژار نێژراوە.

دەتەویست تاکە نەمامیساڵت
بەری شیرن بێ لە ڕۆژی تاڵت
گوڵ و لک بلکێ بە دەور و بەریا
ئارەقت بسڕی لەبن سێبەریا
برتە ژێر خاکەوە ئاواتی دڵت
هەر بەهارت بوو وەرین پەلکی گوڵت
ئاه و زووخاوی دڵەی پڕ سۆکەت
دڕوو دەڕوێنێ لە بان گڵکۆکەت

ڕوو ئەکەمە بابم

باوە نیازت بوو وەکو تۆ وا بم
لە جیهان دوورە پەرێز، بۆ خوا بم
پێت وتووم چەندی لە تۆم پرسیوە
نیشتمان دۆست بە خودات ناسیوە*
هەرچی فرمێسکی هەژاران بسڕێ
بۆ دواڕۆژی بەهەشتێ ئەکڕێ
نیشتمانم کە ڕوانیم دیلە
باغی واخۆش بەرەڵا و بێ چیلە
تورکی تۆڕتووڕی ئەدا بۆ بەر پێ
لێی دەگەوزن عەرەبی بێ دەرپێ
مشکە کوێرەن عەجەم و ڕیشە بڕن
خێوی باغ برسییە ئەو تێر و مڕن

* فەرموودەیەکی پێغەمبەرە «خۆشەویستیی نیشتمان لە ئیمانەوەیە».

نیشتمانم کە ئەویست، کەوتە دڵم
بێم و پەرژینی بکەم باغی گوڵم
وارشی گاڵە درێ و دەربەست بێ
بەس لە داگیرکەری پەست پێ پەست بێ
* * *
چ هەژارم نەدی وەک کوردی هەژار
چاو بە ئەسرین و سری دەس زۆردار
خێوی خەرمان خڕی بێ نان دەنوێ
گەلە خوێ پیوی نەبێ داس بسوێ!
خۆی، ژنی، کیژ و کوڕی کووڕی مەڵۆ
وەکو جووچک دڵە لەرزێ لە هەڵۆ
گەنم و جۆ، ڕۆن و خوری و تووتن و نەوت
گۆشت و میوە و بەری لێڕی شەش و حەوت
هەرچی داهاتە لە لادێ و شاران
بگرە هاتە ئەنقەرە، بەغدا، تاران
گورجێ ئەیقۆزنەوە دەستی بە خوێن
نانی پاک بەو دەمی پڕ جوێن ئەجوێن
هەستی من ویستی کە دەستیان ببڕم
لە هەموو چاوی تەڕ ئەسرین بسڕم
ئەو دەمەی دابدڕم کورد ئەخوا
لای هەژاران بم و نیزیک بە خوا
چم بەسەر هات!
سەر بەخۆ کەوتمە شوێن ئاواتم

دوور لە تۆ تووشی نەهاتی هاتم
ئابڕوو تایەک و حیزی تایەک
سەرپشک تەک بدەمە هەر لایەک
خوێڕیەتی خوو بدەمێ نان زۆرە
دەفری نامووس و شەرەف پێخۆرە
دەستی پانم لە بنی باغەڵ گرت
ئابڕووم ویست و سەری خۆم هەڵگرت
ئەوە چەند ساڵە کەوا دەربەدەرم
لە گوتن نایە چ هاتە سەرم
ڕوو لە سووچم، وەکو تۆز بێ بایەخ
عاسمان لێفەیە هەردەم ڕایەخ*
هەر بەڵای بووری گرێی دا هێڵە
شووم خەتی خۆشە لە کێڵگەی توێڵە*
جوانی وەک ژینی کوڕێنیم دەرچوو
سپیەتی ڕووم خزی بۆ مووی سەر چوو
زەردە بۆ لێوکە دەهات لاڕێیە
پەڕیە سەر ڕوومەت و تاپۆی پێیە
خەم ڕەوێنم خەمە کەس هەر کەسەرە
دەردی دڵ چاری دڵی دەربەدەرە
خۆشی وەک ئێوە مەگەر بێتە خەوم
گەر هەبێ جێگەیێ لێی وەر بکەوم

* ڕوو لە گوناهم. یان وەک تۆز فڕێ دراومەتە قوژبنەوە بەبێ قیمەت.
* هەر بەڵایەکی رابرد نیر و ئاموورى دابەست. شیوەردم خەتی ورد و خۆش بووە لە کێڵگەی نێوچاوانم. یان نەگبەتی ئەوەندەی مەشق کردووە خەتی خۆش بووە و خەتەکانی گنجی نێوچاوانمە.

چاوی ژیرم هەبێ خەو بنوێنێ
نوێنی زبر و تەڕی نەی تۆرێنێ
وشک و زەرد لەش بە دڕک بەر لێژم
سووک و بەرباد و بەسوور و گێژم
قانگەلاشێک و لەبەر دەم باوە
یان تەلاشێک و بەسەر دەریاوە
گا بە شێواوی لە چۆڵێ ئەکەوم
گا لەگێژاوی شەپۆڵێ ئەنەوم
بەڵام هومێدم ماوە
لەو جیابوونە کە جێگەم جێ ما
شادی دا کەوت و هومێدم پێ ما
ڕەنجەڕۆ بووم و لەڕۆ نارەنجم
تا هومێدم هەیە خاوەن گەنجم
دڵ بە ئاواتەوە ماوەی بدرێ
پارچە پارچەی لەت و کوت گەو بکرێ
باغی زێد بێتەوە دەستی خێوی
دەستی کورد بچنێ هەنار و سێوی*
پڕ نەمام بێت و نەمام پڕ گوڵ و چڵ
چاو پەپوولێک بێ لە پەرژینی بە گوڵ
گیان بە هەر لایەکی باغا بفڕێ
گەشکە بێ و چاوی بە گریان بسڕێ

* سیف القضاە شاعیری موکریانی لە شیعرێکیدا دەڵێ: «تاکەی لە باغی خەڵکی بە زیزی و بەملکەچی + خۆشە لە باغی میلی چنینی هەنار و سێو».

ئەو هەلە هەلیــە لە عــاســمــانی کــورد
ســەربەخــۆ ســەرکــەوێ لای وابێ نەمــرد
لەش لەلای ئێــوەوە بســپــێــرێ بە خــاک
خـۆشــە لای دایک و کـەس و بـاب و کـاک
خــواش کــەسی بێکەســە بـۆ ڕۆژی ژمــار
زۆر دڵ ئــاوایــە دەبــوورێ لــە هــەژار

دیمەنی گۆڕستانەکە

گــــیـــانە بڕوانە چ گـــۆڕســـتـــانە!
جێ وچان و خـــەوی چاو مــــەســـتـــانە
ســــوور ئەوا پـێـــتـی دەڵێ شلـلێـــــرە
کـــولـمـــە ئاڵێکە لە ئاخـــا لێـــرە
ئەو وەنەوشـــەی کـــە لە ســـای دارانن
شـــینی ســـەرشـــینی گـــرۆی یارانن
خـاک و خـۆڵی هەمـوو گـەنجـە و سـامـان
چـاوی بـادامـی لـە ژێـر بـا دامــــــان*

جۆگەی قوڵقوڵە*

لاکـــــەوە دڵ پڕی زوخـــــاو و کـــــوڵـە
وەرە ســــەر قـــوڵـقـــوڵـە فــێنکایی دڵە
مـــســـتـــە ئاوێکی بەڕووی دڵدا کـــە
ڕوو بـەڕووی تـەکـیــە ئەبین ئەو ســاکــە

---

* گۆڕستانی خانەقا پڕیەتی لە دار بادام.
* قوڵقوڵە: کارێزە ئاوێکە لە خانەقا.

## خانەقا

خـــانەقـــا دارو دەرت چیـــــمـــەن و چیم
لە هەمـــــووی هەڵ دەقـــولێ بیــــرەوەریم
تات و ئاوی، بەر و ناوی حـــــەوشـــــان
هەر لە مـــیـــحـــرابەوە تا جێ کـــەوشـــان
مـــیچ و بان، ڕێڕەو و مـــافـــوورە و بەڕ
تووەکـــــەت، ڕێزی چنار و عـــــەڕعـــــەڕ
وشـک و تەڕ حـــــــەوز و دەر و دیـوارت
تازەو کــــۆن و خـــــویا و پێـــــوارت
ژوورەکـــــــــــانـت چ لـەبـەرد و چ گـلـن
حـوجـرەکـان. گـشـتی لە من نوشـتـە دڵن
داخـۆ ئێـسـتـاش وەکـو پێـشـوو مـاوی!
دڵـنیـــــــا و دڵگری پیـــــــری و لاوی!
پیـت و بەهرەیان هەیە لاوی دڵـســــــۆز!
ســـۆزی دڵیـــان هەیە پیـــری پیـــرۆز!
کێ لە جـێی «جـەعـفـەرە» بۆ ئاوردوو!
کێ هەڵی دەگـــــرێ ســــەوەی پڕ نردوو!
کـێیـە وەک «حـاجی» نەهێـڵی چەپەڵی
کێ بەفـر دێنێ لە جـێگای «شـخـەڵی»
«شـــاپەسندێ» هەبوو مـــیـکایلی گـــەل
ڕیشـــە چوار گـۆشـەیەکـیش زۆر تەوەزەل
مـامـۆسـتـا مـەنگوڕەکـەم حاڵی چییـە؟
«شـێـخی شـامی» وەکـو ڕیش سـپییـە؟

کێ وەکو «سەید»ی دەس و دڵوازە
تووتنی کۆنی هەبێ و چای تازە؟
«مەمەیار» «کاکی مەلازادە»ت چۆن؟
کێوە چوو تازە موسوڵمانی کۆن؟
کەللەزل پیری «فەریک» چی لێ هات؟
شێری بەگزادە گەڕۆکی دێهات
کێ لە جێی ئێمە فەقێ و نانخۆرن
تەمەڵ و بۆرە کەمن یان زۆرن؟
هاودەمی ئەو دەمە سێ شێخزادەن
داخوا بۆ ڕاوەکەوان ئامادەن؟
خێوەکەو هەر هەیە قیڕە و سوێندی
بۆنی با هات و کەوی شەو خوێندی*
قازیەک و مینەو و دەروێشێک بوون
هاودزی شەو لە مریشک و قەلەموون
کێیە پیر؟ کێیە منالّ؟ کێ گەنجە؟
کێیە پێم خۆش بووە؟ کێ دڵ ڕەنجە؟
کێ بووە؟ کێ چووە؟ کێ وەک خۆیە؟
دێ و دەچێ ژین وەکو ئاوی جۆیە!

---

* ئەو ناوانەی لەم بەندەدا هاتوون ناوی ئەو کەسانەن کە سەروەختی منالّی و فەقیەتیی هەژار لە خانەقا ژیاون و بیریان دەکات. جارێک هەژار و ئەو ٣ کوڕە شێخانە زۆر لە بەر سۆفی سالّح ناوێک کە خاوەن کەو بووە دەپاڕێنەوە کە لە گەڵ خۆیان بیانبا بۆ ڕاو، لە بەرەبەیاندا لە چیای پشت گوندی گڕاو چای لێ دەنێن و کەو دەنێنەوە. کابرا دەڵێ کەس دەنگ نەکا، چونکە کەوی شەو خوێندوویە. لەو دەمەدا بۆ خۆی بایەکی بەدەنگی لێ دەردەچێ! گەلێک گاڵتە بە کابرا دەکەن و ئەویش لە تووڕەییی خۆی ڕاو بەجێ دێڵێ و بە ناهومێدی دەگەڕێتەوە.

## شێخ محەمەد*

سـەروەرێـکت هەیـە پێـی دڵـشـادی
تـا ئـەوت مـاوە لـە خـەم ئـازادی
خۆشەویست «شـێـمـحـەمـەد»ی ڕیش سـووره
لـە خـودا یـار و لـە دنـیـا دووره
چـۆڕه ئـاوێـکـە لـە دەریـای بـێ پـەی
دڵـی دەریـایـەکـە پـەی پـێ نـابـەی
وا لـە جـێی پـیـر و بەبیـریش پـیـره
لـەنـەزان شـێـره، بـەزانـا ژیـره
سـەد بـری هـێـنـده بـرای نـەبـوایـە
پاک و بێ گـورگـە بۆ ئەم کـۆگـایە
تـووک سـپـی زیـانـە لە پەمـبـۆ تـۆزێـک
ئـابـڕووی هـۆزێ دەبـا ڕەشـبـۆزێـک

بەرەو دۆڵی ئاجی کەند

بـاغـی فـاتێ مـەڵێ بووری و خـۆی بـوارد
گـەردن ئـازاکـە گـەلێک مـیـوەم خـوارد*
دامـە گـوارتـە گـوێ لەسـەر دزیەکی بـاغ
بـاغـەوان لـێم دەگـەڕا دەس بـە پـەیـاغ

* * *

---

* شێخ محەمەد زانای زۆر بەناوبانگی موکریانە و کوڕی گەورەی شێخی بورهانە و بەسەر خانەقا رادەگا. برایەکی هەیە بەناوی شێخ رەحیم جاسووسێکی زۆر پیسی عەجەمە. نیاز لە رەشبۆز ئەو شێخ رەحیمەیە.
* باغی فاتێ: باغێکە لە نێوان خانەقا و گوندی شەرەفکەند. گوارتە گوێ کێوێکە لە نێوان خانەقا و گوندی ئاشی گوڵان.

وا شەرەفکەند پڕی شۆخە و جوانە
کوڕە شێخ تووڕە دەبن مەڕوانە*
جێی دڵە باغی مەلا و ئاجی کەند
هەر گوڵە و بولبولە هەرسازە و بەند*
باغی باخچان و نەمامی ساوا
چۆن دڵاوایەکە ماڵی ئاوا
هەرچی گێلاس و بەڵاڵووکی خوارد
سەری هەوساری بەزاری ئەسپارد
سێو و مێو بەردڵە قەیسی بەڕمێن
ئەوی زۆر تر گزوفت دەن هەرمێن
گەربکا چاوی خومار ڕزگاریت
وای بزانە لەبەهەشت ڕێبواریت
بێ ترس بیخە سەرت تەشی تەڵا
نۆبەتێ زۆرە مەچۆ تازە قەڵا
چاوگە سەر ئاشی خۆراسانەش بێ
خۆشە ئەو بەندە لەسەر چاوەش بێ
«گەردشی چەرخە مەداری مەلەکە
ئاشی شێخ بابەقەتاری گەرەکە»*
دێتەدەر ئاوێ لەسایەی داران

* شەرەفکەند: جێگەی لە دایکیبوونی باوکی هەژارە.
* باغی مەلا و ئاجیکەند و خوراسانە و ئاشی مەلا و تازە قەڵا و ئاشی گوڵان چەند گوندێکن لە موکریان گەلێک باغاتیان هەیە. ئاشی شێخ لە خوراسانەیە. بابە قەتار: چاکێکە لە خوراسانە ئاوێکی لێ هەیە گۆیا هەرچیی بیخواتەوە کۆخەڕەشە ناگرێ و ماریش پێوەی نادا.
* ئەم بەیتە هی سەید ڕەشیدە لە هەجووی خات مەلەک ناوێکدا کە ئاشەوانی ئاشی شێخ بووە.

چارە بۆ کۆخەڕەشە و بۆ ماران
با وەخوێن من عەجەمم کۆخە ڕەشەن
دەشگەنە ماری مژی مژ بەڕەسەن
سەردەمێک ببوە بەهەشت ئاشی گولآن
گیان لە زانست ئەگەڕا و دەم لە چلآن
«سەردەراباد» نەچی خێوی لێیە
بە تەنێ باری هەژاریت پێیە
لەم «عەزیز کەند»ە بەناو باخچێک بوو
جوان و بەرچاو و لەبار و ڕێک بوو*
سەری سەودام هەبوو لام دایە کنی
کاڵە هەرمێم کوشی، سنجووم نەڕنی
تەرەغە*
تەرەغە خۆشی سەرت هەر بەرزە
لێک جیابوونەوەمان چەند وەرزە؟
یاری ڕاکردوو دەمی ڕابردوو
وا بەسەر تۆوە کلاو با بردوو
هەر لەلانن! دەمەوێ سەیری بکەم
سەنگەری سارمی خوێنڕێژی عەجەم*
دێننەوە بیر کوڕی کورد مەرگی ئەوێ
ئەو سەرەی ناوێ بە حیزی بنەوێ

---

* سەردەراباد و عەزیز کەند دوو گوندن.
* تەرەغە: شاخێکی زۆر بەرز و قووچە لە موکریان، گوندێکیش بەو ناوە لە دامێنی هەیە هەژار بەگەنجی لەوێ ژیاوە.
* سازم بەگ کە لەگەڵ شا عەباس شەڕی کردووە ئێستاش سەنگەرەکانی لەو کێوە ماون.

کـــــارگ و ڕێـواســـــه بـەهـارانـه بـەرت
وەکـــو جـــاران کـــوڕ و کچ دێنە ســـەرت!
گـــەنجی ئـاوایـیـــەکـــە چۆنـن! ســـازن!
دڵـتـــــەڕن! دەس لـەملـی دڵـخـــــوازن!
جـــوانی ئـەوســـاکـــە ئـەوێســـتـــا پـیـــرن!
هـیـچ لـەلات وایـە لـە مـن دڵـگـیـــــــرن!
جـــوانی جێ مـــا کـــە نـەمـــام لـەو نێـــوە
داری دووری بـەری پـیـــــــری پێـــــــوە
تۆ کـــــە قـــــیت مـــــاویـەوە بـارت بـارە
هـەڕەمـــــــەی جـــــــوانـی لـە تـۆڕا دیـارە
باخـــــچـــــەیـە ســــــەریـەتی چـوار دیـوارە
پـاش بـلاغـــــــە و قـــــــەرەڵـی و نـۆبـارە
کـانـیـــەڕەش لان و مـــەکـــۆی چاوجـــوانان
بەنـد و بـاون لـە دەمـی خـــــۆش خـــــوانان
زانـین ئـاوات کـــــــــــە لـەبـن بـالاّیـە
گـش لـــە لاو چـاکـی دەســـی بـــالاّیــە*

یادی دڵدارییەک

داخـــــەکـــــەم باوی کـــــوڕێـنـیـش لاچوو
هیچ هەتا ســـەر نـیـــیـــە وا هات وا چوو
چاو شــــەهێنێک دڵـی گـــرتم ئـەوســـا
چەن لە بەر نازی ئەوا گـــیـــان چەوســـا

* باغـچە و سەر باغـچە و چوار دیوار و پاش بلاغ و قەرەلی و نوبار و کانیەڕەش و عیلمابات: چەند گوندێکن بە دەوری تەرەغەوە.

تازە لاوێ دڵ و ڕوومەت سادە
مەستی سەرخۆش دەگەڕام بێ بادە
ڕێ نەدیو، چاو دەگەڕا بۆ باڵا
داوی دڵداری لە گەردەن هاڵا
بەرزە دیوار و بەهەشت لەو دیوە
دەرکە داخراوە، کلیلی زیوە
دانە فرمێسکە لەلام سوێراوێ
دڵ هەیە و سواڵەتە لەتیان ناوێ
نەمبوو سامانێ جیا لە جوانی
جوانییەکەش توایەوە تا پێی زانی
مامەوە، توامەوە، برژام، ئێشام
بەزەیی هات و دەسی ڕاکێشام
چاوی خۆم کردەوە وام لەو جێیە
سۆفی پاش مردنی هیوای پێیە
زەردی تاوداری هەژاری بێ بەش
تاو بڕاو کەوتمە سایەی باوەش
توانە، بووژاوە بە ماچی لێوان
گیانە، ژیر بۆوە لە سەیری سێوان
ئەو دەمانەی کە لە باوەشیا بووم
ئادەمانە لە بەهەشتا ژیا بووم
گوڵی سەر کوڵمە گەشەی تیشکی چاو
ئارەقەی خۆشی ئەکرد بۆنی گوڵاو
سێوی لاسوور سەری گۆنای ناسی

داخ لە دڵ خۆی بە پەلێ هەڵواسی
دەمی شیرن بوو لە دەمیا هەنگوین
بادە دادی بوو لە لێوی ڕەنگین
خونچە دەم سوورە لەسەر لاسایە
زۆر دڵی تەنگ بووە هەر بۆی نایە
تا بهاتایە بەرانبەر لاجانگ
لەشی سەر ئاو دەگەڕا تیشکی مانگ
لاملی، ئاسک و کەوی خستە گرەو
تۆقی گیرۆیی ڕفاند گەردنی کەو
زێڕ دەلەرزی لە پەنای گەردنی زەرد
تاوو تینێکی نەبوو، زەرد و سەرد
شانە هەنگوینی سپی سەر سینە
بۆ تەماشا بەشی سەر تا سینە
گەر پەپوولەی چەمێ بەو جێ فێر با
باڵ لە بەرچاو بوو دەترسا کوێر با
خڕی ناو مەم پڕی ئاونگی گەزۆ
شیری خاوی لە دەما بوو لیمۆ
مەمکی بدیایە چ ئادەم چ ئەوا
بە لەز ئەیقۆزتەوە هەر کەس لە هەوا
لارو لەنجەی کە دە لای «لالەش» ئەخست
کێ مەلەک تاوسی پێشووی دەپەرست!*

* لالەش: گەلییەکە لەلای مووسڵەوە لە کوردستانی عێراق، جێ گۆڕی شێخ هادییە و زیارەتگای هەرە پیرۆزی یەزیدییانە. یەزیدی بە شەیتان دەڵێن: مەلەک تاوس.

پرچی پڕ پێـــــچی قـــــەد و باڵا بـوو
ڕەشـــــەمـــــاری لـە نـەمـــــام هاڵابـوو
هەر لە ســـەر نێـــوکـــەوە تا بەر ئەژنۆ
لـەرز و مـــــوچڕکی لـەشی تـامـــــەزرۆ
جـــیـــوە لای هێندێ لە ژێر پشت بەندی
ئـابـڕووی چووبـوو لـە تـوندی و مـــــەندی
شـلـکـەڕان و قـــــەفی تـێـــــراوی بەلـەک
مـــۆمی کـــافـــوور لە پەنایا بەلەچەک
تـــام و ڕەنـــگـــێ لـــەلـــەشـــی ئـــەودا بـــوو
ئـارەزوو واقـی تـیـــــــا وڕ مـــــــابـوو
لە هەمـــوو لاوە گـــوناه بانگی ئەکـــرد
هەرچی لەو مـیـوەیە چێـشـتـوویە نەمـرد
تـاوســـــە، مـــــارە، نـەمـــــامـی بەژنـە
پێم ئەڵێن بچنە بەشی خـــۆت جـــەژنە
دەنگی «تۆم خۆش ئەوێ، تۆ خۆشت ئەوێم؟»
گـیـانـی کـێـشـابـووە پەنا پەردەی گـوێم
دڵ لە دڵ نیـــازی نزیک بوونی ئەبیـــست
دەمی نای نازی ئەگـوت، مـاچی ئەویست
لـێـــــــوی ئـاوی دەمـی دڵـی دەتـکـانـد
چاوی شـــەرمـــاوی لە چاوم دەچکاند
وەک ئـــەنـــی و چـــاو و چـــەن و دیم و دەم
خـاڵی ڕووی خـۆی دەنوان مـاچی کـەم.
چاو بەچاو، دڵ بە بەرامـــەی مـــەست بوو

مێشک و هۆش و ڕەگ و خوێن بێ هەست بوو
هەر لەبەر پێــــوە هەتا تۆقی ســــەرم
لە گــــەڕاندا بۆ تەزووی ســـارد و گــــەرم
ناسکە پەنجــە و مــەچەک و باسک و زەند
دینـی بـەردا و ملـی تـۆبـەی هـەڵکـەنـد
بەرەژوور چوو کــــەف و کـــۆی لاوچاکی
کـــــــــەوتە داوێنەوە داوێن پاکی
بوومــــە ڕەزوان لە بەهەشـــــتی جـــوانی
لــە گــــــــــوناه تـامـی ژیـانم زانـی
ئەو ژیانەی کــــە لەگـــــەڵ ئەو بووری
خـــــۆشی کـــــرد ئاگـــــری دەردی دووری
وام بە پیــــــریش بە خـــــەیاڵی ئەودەم
پەل بە ســـینگ دائەکــوتم لە شــوێن مــەم
دیسان ڕوو دەکاتەوە تەرەغە
لادرێ تـاڵـی خــــــــــــەیـاڵـی لاوی
بادرێ باشـــــــتـــــــرە داوی خــــــاوی
کــەژ و کـــۆی دۆست و دراوســـێت چۆنن!
دڵ و ڕووخـــــۆش و گـــەشن یان مـــۆنن!
هەر بە قــەزوانە ملی «پیــر ســڵــەمــان»!
تەڕ دەژی دوورە لە ئاســــــۆگی نەمــــان
زۆر لە دەورەی دەگــــــەڕێن بە نیـــــازان
دۆ بەهانێکە لە کن دۆخـــــــــــوازان
«کــۆشکی زارا» کــە بەخــاڵ نەخـشــاوە

هەژدیهای نەمری لە داوێن ماوە!
شانی «میرقازی» چڕ و بژوێنە
زیندەوەر لێی دەگەڕێن، دژوێنە!
خۆش بووە «پێمەڕەکەی فەرهادی»
بۆ سەری دوژمنی ڕێی ئازادی!*
تەرەغە، کێوی لەمێژینەی کورد
کۆنە هاوڕازی «سەفین» و «هەڵگورد»
«ئاگری» و «پیرس» و «مازێ» و «ساسۆن»
خزمی «پیرانی» کەس وکاری تۆن
لە لوڕستانەوە تا پشت «تۆڕۆس»
گەلێ زۆرن بنەماڵەی «زاگرۆس»
کورد هەزاران و هەزاران ساڵە
سایە پەروەردە ئەژین لەو ماڵە
ئێوە بوون، پشت و پەنا و دژداری
نانبدە و یار و دژی بەدکاری
پیاوەتی و مایە ژیانی ئێوەن
مانەوەی ناو و نیشانی ئێوەن
کێوی «جوودی» لە گەڕی تۆفانا
گەمیەکەی نووحی لەسەر سەر دانا*

* پیرسلەمان و کۆشکی خات زارا و میرقاز و پێمەڕەی فەرهاد، چیان لە دەوری تەرەغە، هەژدیهاداشی بەردێکی سپییە لە داوێنی کۆشکی خات زارا، گۆیا مار بووە ئیمام عەلی کردوویەتە بەرد.
* سەفین و هەڵگورد و پیرس و پیران لە چیاکانی کوردستانی عێراقن. ئاگری و ساسوون و تۆرۆس و جوودی لە چیاکانی کوردستانی تورکیان.

پەندی پڕ بایەخی پێشینانە
«کورد لە تەنگانە تەلانی لانە»
«چیای مەزن لێی هەبێ بزن و هەرزن
نابەزن بۆ کەس و هەر سەربەرزن»
ئێوە دیتان بەسەتان خونکاران
زۆرو بیست هەو هەو و خرمەی سواران
پانی پاڵ داوە دەمێ «بانیپاڵ»
ڕێوی لێ کردنە کوێخا بە خەیاڵ
گەلێ ئەسکەندەر و زۆر وەک زەنەفۆن
دانی هەڵ بڕیەوە ئەم کوردە بخۆن
عەرەبو هات بەسەرا وەک لێشاو
بێ بەزەی دڵ ڕەشی فێڵبازی بە داو
چەنگی چەنگیزی بە خوێن پاراو بوون
بۆ هەلاکۆ بەرەگە و سەر ڕاوبوون
جارێ تەیموور بەشەلی سەر دەکەوت
تیری کوێری کەڤری بەر دەکەوت
شا عەباس ویستی سمێڵ بابڕ کا
کێو لە بن بێنێ، گەلی کورد قڕ کا
نادریش سوڕی لە زۆر جێگادا
بەهەڕوگێڤەوە خۆی لێ بادا
زۆری زۆردار کە سەرێک پێو وێران
بە ملی وردەوە لێو هەڵدێران
زۆر گەماڵ داویە گەمارۆی ناومان
ئێمە هەر ماین و ئەوان بەدناو مان

هاتن و چوون زلی زۆر خاوەن زۆر
کوردستان گر بە خەیاڵ و کورد خۆر
شرت و گوم بوون و هەموو ڕابردن
کوردستان هەر هەیە کورد هەر کوردن
بەڵکە بۆ چەنگە چەمووش و تۆڕێک
دێتە دی لێر و لەوێ چەند گۆڕێک
خواردنی کورد و چیا دژوارە
دەرنەچوون فیل و نەهەنگ لەم بوارە
تازە وامشک و تولّە و وشتری گەڕ
بەتەمان بیکەنە جێ مۆڵ و گەوەڕ
خاک بە سەریان بێ وەکو پێشوویان
دەبێ بیهێننەوە هەرچی جوویان
شل نەما کوردە پەڵوولّەی دوێنێ
ئێستە وا توندە ددان دەشکێنێ
سەردەمێک خاوی مەلا و خانان بووین
پارەوە خۆشەی دەمی بێگانان بووین
ئێستە ئەو تاوە لە ئاوا بوونە
شێری کەژ نیازی لەلان ڕابوونە
تۆڕی دیلی لە پەلان هەڵ دەدڕێ
کێ بەشی خواردووە گورچووی دەبڕێ
دێتە گوێت گەرچی کڕ و بێدەنگی
دەنگی پێشمەرگەت و زەبروزەنگی
داد و هاواری عەرەب لەو لاوە
تینی بۆمبا و کەڤری تاواوە

ئەمە بوولێڵەیە بۆ ڕۆژی ڕوون
بانگەوازیانە کە ڕۆڵەت زیندوون
بێنی خوێن، دووکەڵە شینکەی باروت
با کە بۆت بێنێ لەسەرخۆبێ پشووت
تەمی خەم نەگری بلێی چارەڕەشم
شۆڕشی کورد هەیە من دوورەبەشم
ئاوەدان دەبنەوە ناو سەنگەری تۆش
دڵ پتەوبە بە هەوای ڕۆژی خۆش
تازە دەکرێتەوە دوژمن کوشتن
ژەنگی سەر دڵ ئەسڕێ خوێن ڕشتن
ئاگرت هەڵبێ وەکو ڕابردووت
لاشی دوژمن دەکەمە ئاوردووت
ڕۆژ دەبێ ناوی هەژار نامێنێ
سازی و ئازادی لە ڕووت ئەخوێنێ
خوات لەگەڵ بێ تەرەغەی قیت و قۆز
جەژنی ڕزگاری نزیکت پیرۆز

## یادی جوانە مەرگێک

«پیر محەممەد» تەڕە تیراوێی دڵ
تۆز و هەتوانی دەست خوێنە و گڵ*
گیانە پڕسۆیە برینی دەرکا
گەشە خوێناوێ لە چاوم سەرکا

* پیر محەممەد چاکێکە لە گوندی بوغدەداغی لە موکریان، نەخۆشی تیراوێدار دەچنە سەری مریشک سەر دەبڕن و خوێنەکەی دەگەڵ گڵی ئەو چاکە لێک دەدەن و دەیکەنە شەڵتەی برینیان. هەژار ژنێکی لە نەتەوەی ئەو پیر محەممەدە هێناوە و بە جوانی جوانەمەرگ بووە و لە دامێنی پیر محەممەد نێژراوە.

جـــــــوانـەمـــــــەرگێ هەیە لەو داوێنە
خــــاکی نمدار کـــەمــــەوە بەو خــــوێنە
جـــــــەرگی تۆ و بەرگی ژیانی من بوو
گـــــەوهەری نەرم و نیـــــــانی من بوو
بـــەر لـــە ڕۆژانـــێ ئـــەوم پـــێ نـــاســـی
ســـەر لە ســـووڕابوو بە گـــێـــژی و کـــاسی
دەس لە دڵ تەنگـتـــر و ناز شـــێـــواو بووم
زۆر لە دامــــــاوی پـتــــــر دامـــــاو بووم
گـــیـــان لە خـــۆیلـــێنی گـــومـــانا وێڵ بوو
بـــواری بـــەربـــاری بـــە دیمەن لـــێـــڵ بـــوو
داوی ئـاوات و هـومـــــــێـــــــدان باریک
تەم تەنیـــــبـــــووی ســـەروبەر چوو تاریک
لە پـرێ پەریـیـــــــەکی نـازدار و شـــــەپاڵ
ئـاسکێ ناسکی شـــیـــرین خـــەت و خـــاڵ
بوو بەدەســـــتگرتەم و شـــــایی شـــانـدام
ڕووبـــەڕووی بـــاغـــی ژیـــانـــی هـــانـــدام
ڕابـەرم بـوو لـــە ڕچـەی دڵ پـتـــــــــــەوی
ورە بەربوونی نەبوو، ببـــــــووە کـــــــەوی
کـــیـــژی تۆ بوو بە فـــریشـــتـــەی بەخـــتم
تەختی کرد کەند و کـلـۆی ڕای سەختم
تـــای ژیـــانـــی لـــە ژیـــانم هـــالاّنـــد
تـــا ئـــەوم بـــوو لـــە ژیـــان نـــەمـنـــالانـــد
شـــــەوچرایەک بوو لە ڕۆژی ڕەشـــــمــــا

بەختی بێدار بوو لەناو باوەشما
گێژەڵووکەی ڕەشەبای مەرگی نەکاو
گشتەکەی کردەوە یەکباد و خاو
هەڵوەری سوورەگوڵی بولبولی دڵ
شینی بۆ ماوە لە جێی چۆڵی چڵ
تازە پەروانە دەسووتا باڵی
بای نەهات شەوقی شەماڵیماڵی
یار لەگەڵ بەختی هەژار ڕێک کەوتن
دوور لە من چوون و لە خاکا خەوتن

خوا بژاردیەوە

گەرچی خوای گەورە بەزەی خۆشی نارد
گەڕی گەردوون چ بوو تاوانی بژارد*
دەردی بێ هاوسەریی دەرمان کردم
ڕەقەنی بێدەری نەرمان کردم
جوانترین پەریەکی خۆی خستە پەنام
باغی شادیم لە گوڵە و تازە نەمام
ئەو هەموو کۆسپە کە دێنە سەرە ڕێم
ئەو هەموو داوەی دەپێچن سەر و پێم
ئەو هەموو تاڵییە من دەیچێژم
ئەشک و خودانێ کە من دەیڕێژم

---

* هەژار دووای جوانەمەرگ بوونی ژنی پێشووی، مەعسوومەی کچی حەمەد بەگی نۆباری هێناوە: شێرکۆ و ئاگری و زاگرۆس و خانیی کوڕی هەژار، لەو ژنەن.

هەر کە خۆم خستەوە سای شابالّی
بەرگی ژان و شەکەتیم دامالّی
چەند پەژارە و کزی زۆری بێنێ
یەکێ نامێنێ کە ئەو دەمدوێنێ
چاوی نەرمی کە دەچاوم دەبڕێ
ژەنگ و فرمێسکی دلّ و چاو دەسڕێ
دینی ودمە، دەسی هەتوان بێژە
تا هەیە کۆنە برین سارێژە

بەو حالّەش

هێشتە تا با لە موکوریانەوە دێ
نیازی سەردانە بەلای گیانەوە دێ
دلّ دەورتێنێ لە سوێی ئەو ناوە
سەرەتیرێکی تیا جێماوە
جاروبار خوێن دەدەلّێ و دێتەوە سۆ
خوێن و گلّ تێکەلّە هانامە بەتۆ
پیری دلّ چاک ئەوە خۆت و ئەوە دلّ
دلّە ئارام بە لە دەرمان مەکە سلّ

بەرەو بۆکان

بەس خەوالّوو بە خەیالّ بڕوانە
شاری بۆکان وەکو بووکان جوانە
مێشەیە، باغە، گولّستانە، چەمە
لاوی لاولاوە، کچی خونچە دەمە
ئاوی چاوێک لە دلّی ئەودایە

چاوی قرژاڵی لەبەر هەڵنایە
مانگ لەمێژساڵە لە ڕێدا فێرە
وەک تریفەی مەلەوان بێ لێرە
تۆش بچۆ، گیان و دڵیش ئامادەن
ترسو دامالّن و خۆ پێ دادەن
مار و جرجی عەجەمو نایەنە بەر
شەو لە ترسان لەکونان نایەنە دەر
ئەو قەلایەی کە بەرز وێستاوە
دوور لەوێستاکە هەوارگەی پیاوە
سەر سەرا و کۆشکی گەلێ سەردارە
بۆتە بەردار چ خودا بەردارە
پیاو نەمان و ئەوی مان خوێڕی بوون
هێڕ و وڕ فێری خڕەی زێڕی بوون
کوردەناموسی فرۆشرا بە چڵە
گای شڵە گشتی لە خۆ بوونە مڵە
هەر کەسەی ببوە کەوی دەس دوژمن
ئەیەویست خزم و کەسی خۆی قڕ بن
دان دران تاکو لە کێو کەو دەفڕی
کاتێ تاران سەری وانیشی بڕی
کەوی سەرداری لە بیرمان ماوە
کە لەسەر چی سەری هەڵ قرتاوە*

* سەردار عەزیز خانی بەناوبانگ بیستوویە کەوێکی ڕاو بە چل زێڕ دەفرۆشن چونکە کەوان زۆر دەخاتە داو، کڕیویە و سەری هەڵپساندووە و گوتوویە: کەسێکی هاوڕەگەزی خۆی بداتە دەستی دوژمن نەمانی باشترە.

بەسە خوێ ڕێژی بەسەر زاماندا
با بنۆڕین وەهەموو لاماندا
ئاخۆ یاران وەکو جاری جاران
شەو نشینیانە لە پای دیواران!
ئەمجەد و قازی مەلا ڕیشی حەسار
کێ بە ئاخ و کولّە بۆ ڕەنجی خەسار*
شێرە چۆبینە بڕشتی ماوە!
یان کەل و کول بووە، کۆڵی داوە!
پیرەشاهۆی قەرەگوێز هەر بەگوڕە
یان عەجەم ترسی وەبەر ناوە، کڕە!
لەمڕۆ داخۆ برای ڕاست ماون!
یان چەماون، لە خەما چەوساون!
کاوە بۆ کوتکی شکاو بێ چەرمە
خوێنی لاوان کە لەبیر کا شەرمە
مچە گردەڵ کە بەرەو باو بۆوە
گشتە یان پێچی دراو خاو بۆوە!
هەڵۆ کل بوون کە لە هێلانی کەل
چینەیان چۆنە لەسەر خوانی قەل!*
بیری ئەم ناوە لە بیریان ماوە!
یان لە پای ڕازەوە هەڵدێراوە!
هیچ لەبیریانە لە لێڕی بیران

* مەلا ئەمجەدی قەڵا و کاکە حەمەی بۆکان هەواڵی زۆر نزیکی هەژار بوون. مەلا ڕیش و چووبینە و پیرە شاهۆ و برای ڕاست و مچە گردەڵ و کاوە چەند ناوێکی نهێنین بۆ چەند برادەرێکی هەژار کە لە ناوچەی بۆکان بوون.
* باسی هەڵۆ و قەلەڕەش هەر لەم دیوانەیە.

جـــەنگی ســـەرچامـــە لە بەرپێی پیـــران!
ڕۆژ بە دوومــــــانەوە وەک کـــــوێنـی ڕەش
لاشـــــە ئەتلانەوە لە خـــــوێنی گـــــەش
لـە فـــــــڕۆکـــــــانەوە بـۆمــــــبـــــــاباران
کڵ و پێـــشـــــمـــەرگـــە بە ئاگـــر خـــاران
لە تەقــە و دووکــەڵی گــەرمی گــڕی شــەڕ
خــوای ترس پێـــشی هەڵات کــوێر و کــەڕ
کێ پەنای گـــرت لە ڕەهێـــڵـــەی تۆپان!
چەند سەکەت بوون عەرەب و جاش تۆپان!
ســـەردەمی خـــەنجـــەری کـــورد هاتەوە گـــەڕ
ســـــەری وشکی دەبڕی و گـــۆشـــتی تەڕ
خــوێنی پیـــسی لەشی ســیــسی عـــەرەبان
گـوڕ و فـیـــچـقـەی بوو لە بان تیـخی دەبان
باوی بـوو گـــــاڵتـــــە بەمـــــردن کـــــردن
کـــورد وەســـەر کـــەوتن و، دوژمن مـــردن
دێتــە بیــریان کــە لەســەر نوێنی ســەنگ
ببـــوە لای لایێی شـــەوان دەنگی تفـــەنگ
«دۆڵی ســـەفــتێ» «بنی پێــرس» «ڕێزان»
خـــۆش بوو چۆن بوو کــە لەبەریان بێــزان!؟
ســـــەرچیـــــای شـــــیـــــرن و چای بەر باران
لای ئــەوان تــاڵ بـــوو لــە تــاوی تــاران!*
دەست و چاو ئێـــســـتـــە ئەوەند تێـــر و پڕن
ســـــەد هەژار ڕەنگە بە پوشـــێک نەکـــڕن

* لێرەبیر، چامە، سەفتی، بنی پیرس، ڕێزان، چیای شیرین: چەند جێگەیەکن لە بارزان.

## سەیرێکی جوانی بکەین

مانگە هەرچەند بەلەزی ئەیزانم
لێم گەڕێ تۆزێ تریش بڕوانم
سەر بکێشم بە بڕێک ماڵاندا
چاو بگێڕم بە خەت و خاڵاندا
کیژە بۆکانی خەواڵووی نازن
پاوپووز ڕووتن و پێسیر وازن
زەردەمەم دیارە کە خاوەن خەوتوون
بۆ پشوودان لە کراس دەرکەوتوون
پرچی ئاڵۆز کە لەسەر لەشیانە
شەوەزەنگ داگری ئاوی ژیانە
مانگ ئەگەر تیشکی بدا ڕێنوێنە
شنەبا بسک و کەزی بزوێنە
هەلە تا چاوی خەواڵوو مەستن
تا جەزایەرچی بەیان بێ هەستن
دڵە خۆ تێرکە لە سەیری جوانی
ڕێت هەیە چەند بە خەیاڵ بڕوانی

### تا من گەشتێک ئەکەم

تا من و گیانی پەژارم تاوێ
تۆزێ لەم دەورە بگێڕین چاوێ
«وشتەپە» داخۆ فەقێلەی دێنێ
یان لە جێی ئێمە پەپوو دەخوێنێ*

* وشتەپە و تاراوا و شێخلەر: گوندن لە دەوری بۆکان، * سولەیمان و ئاغای شێخلەر و (ئاوات) کە شاعیرێکی نیشتمانییە برادەری هەژار بوون.

کوا سولەیمان و لەچی تاراوە
تەخت و قالیچە نەما با ماوە!
شێخی شێخلەر بەڕووالەت بەختە
دوورە بەختی لە هەژاران سەختە
خێوی کێو خاسە کەوێ لە شوێنێ
بەدڵ ئاواتە کە بۆم بخوێنێ
ڕاوکەری تەپلە بەسەر لەوناوە
لە گەرە و داوی لە دەورەی داوە

## ماڵئاوایی

گیانە مەودا کەمە ئاسۆ سوورە
بیر نەبوورێتەوە ڕێمان دوورە
وەختە لێلایی لەبەر چاو بڕەوێ
خێڵی شەو کۆچەرە، ڕۆژ دەردەکەوێ
بە هومێدم کە بە ڕۆژی ڕۆشن
تیشکی ئازادی خەمان داپۆشن
ئاشکرا ڕوو بە گوڵ و گوڵزاران
بێمەوە و بێمە دەس و ڕووی یاران

* * *

ئەی موکوریان بەخودات دەسپێرم
یادگار وەرگرە ئەشکی سوێرم
بێ منیش خۆش بە مەکۆی بیرەوەریم
تۆ بەجێ هێشتنە هۆی کوێرەوەریم

* * *

هەڵشۆ، ١٩٦٥/٧/٢٩- هێندێک لە جاشکە زلەکان لەگەڵ تاهیر یەحیای سەرەک وەزیرانی عێراق چوونە قاهیرە، باسی ئەوەم نووسیوە، لە خەباتی مانگی خەرمانانی ١٩٦٥دا چاپ کراوە:

## جاش چوونە میصر

عەبدولناسر دەگەڵ یاران
لەقاهیرە لە مەتاران
لەو لاش حەرەسی شەرەفە
بۆ بەخێر هێنان سەفە
تاهیر یەحیایان میوانە
پیاوێ بەشەوکەت و شانە
لە عێراقا سەروەزیرە
کەوچک بەدەستی موشیرە
لە تەیارە دێتە دەرێ
دەگەڵ چەند مێزەر بەسەرێ
لە جیاتی سڵاو زەڕینە
جووتە و لوشک و دەرپەڕینە
بۆ میواندار سەرسوڕمانە
وەزیر فەرموو چین ئەمانە
میرم برامن زۆر باشن
کوردن، دوور لە ڕووتان جاشن
سێ چوارێکیان پیرەکەرن
فەرقێ ناکا، جاش لەبەرن
هێندێکیان حەجیشیان دیوە
بەڵام خۆیان نەگۆڕیوە

ناموس و ئایین و وەتەن
بە مەرحەبا و دینار ئەدەن
کوردن و خۆیان ناناسن
تا بفەرمووی جاشی خاسن
لە ژێر بارا زۆر چەوساون
ماندووبوون، لەزگ وەستاون
هێناومن لێرەیان چاکەین
بەڵکو جاشی تر پەیدا کەین
سمیان بگوشن بەڕووی خۆش
با هەروا بڕۆن مەڵێن هۆش

* * *

هەڵشۆ، ١٩٦٥/٨/٨- عیسا شاوی ئەفسەرێکی عەرەب، بەموشیر عەبدولسەلام عارفی گوت چیای سەفینت پێشکێش دەکەم بە دیاری. لە جوابی ئەودا نووسیومە.

لە خەباتی مانگی خەرمانانی ١٩٦٥دا بڵاو بۆتەوە:

## مارمێلکە نیم

چیای کورد بۆ دیاری نابێ شاوی
دەمت دەشکێنێ گەر بەردم بجاوی
نە خورمایەو نە وشترخانە کێوم
وڵاتم کوردستانە و کوردە نێوم
ئەگەر نامناسی بڕوانە لە مێژوو
بزانەو فێربە کورد چۆنە و چلۆن بوو!
بەری تۆش ڕۆژێ پانیپاڵی ئاشۆر

چیای کوردانی بۆ ڕێوی ئەکرد مۆر
لە پێش تۆ گەزنەفۆن ڕووی کردە خاکم
وەکو دالاش دەسووڕا بۆ کەلاکم
گەلێک تەیموور و چەنگیز و هۆلاکۆ
لە دەشتم تێ پەڕین وەک وشتری تۆ
گەلێک پێ خواس و بێ دەرپێ و ڕەشوڕووت
بە نانم سەردەمێکی چاوی پشکووت
بەڵام من کوردم و کوردیش ئەمێنم
لە زۆردار یەک بەسەد تۆڵەم دەسێنم
لە کۆن و نوێ و درەنگ و زووت بپرسە
دەزانی خەنجەری من زۆر بەترسە
کە من نەم گرتبا پێشی سەڵبی
لەنەنکت پرسە دەبوا ئێستە چی بی!
لە گۆڕستانی بێگانان بنۆڕی
کە لامن بیری پووچی خۆت ئەگۆڕی
لە بیرت دەرچوو بەردی قارەمانم
لە خوێنا سوورە دەشتی بازیانم
لە بەرزانا دەزانی چت بەسەر هات!
لە هەورازم دەتۆپێ هەرچی کەر هات
ببینە هەڵمەتی پێشمەرگەکانم
حەسار و شوورە پۆلای نیشتمانم
سەراپا مەرگی سووری لێ دەبارێ
دەبۆم ڕاوەستە تۆ چت دیوە جارێ

ئەبێ تێــر کـەم لە گـۆشـتت گـورگ و ڕێوی
بە بەرمــیل خــوێنی ســەربازت بپــێــوی
لە ترسان قـوولە مـشکت پێ دەکـەم تەنگ
بە پیـــوی تۆ لە تیـــخم لادەبەم ژەنگ
زگــێکی مـــالی کـــوردی تێـــوە چووبێ
دەبێ بۆ نووکی نێـــــــزەم ڕووبەڕوو بێ
سـەرێ وەک تۆ کـە فـێـری گـوێ لەقـان بێ
لەمـــەیدانا دەبێ گـــۆی بەر شـــەقـــان بێ
ئەبێ ئەو زارە کـــێـــوی من دەبەخـــشێ
بەخـــوێنی ئاڵ و دانی کـــەل بنەخـــشێ
ئەبێ ئەو مـێـشکە پیـســەت تێ گـەیێنم
کـە خـورمـا نیم، پڵنگی لەش بەخـوێنم
ئەمن مـارمـێلکە نیم، حـەزبای کـەژ و کـۆم
خـــەیاڵت خـــاوە من کـــەی خـــواردنی تۆم!
«سەفین» قـووت ناچێ بۆ پێخـواسی ئاغـات
لەبەغـــدا نەبووە قـــازی کـــەر بە ئاوات

* * *

پشتی وڵاش، ١٩٦٥/٩/٦- ئەم دەمەتەقەیە لەسەر ڕادیۆی شۆڕش
بە دوو قۆڵی وەک نومایشنامە خوێندرایەوە:

## جاش و باش

ـ ماندوو نەبی کابرای ڕێبوار
ـ قەزات لە گیانم هەزار جار
ـ ناوەکەت بفەرمووی باشە

ـ دوور لە ڕووتان ناوم جاشە
ـ جاش؟ هەر ئەو جاشی کوڕی کەر
بەکلک و بەگوێ و بارەبەر؟
ـ قوربان من کوردم بوومە جاش
سمم خستۆتە ناو کەلاش
ـ ئاگام لە جاشی کورد نییە
باشە، کار و بارت چییە؟
ـ من کوردم، وەک دێتە بیرم
کوردیش بوون باب و با پیرم
پەروەردەی چیا و کوێستانم
کوردییش نەبێ، هیچ نازانم
ڕۆژێ ئاغا فەرمووی حەمە
وەک بزانم نانت کەمە
وەرە بتنووسم بە فورسان
ئیتر نانالّی لە برسان
تفەنگم نایە سەر شانم
جاشکم و ئەلّێم فورسانم
سێزدە دینارم ئەدەنێ
شەو و ڕۆژ وام لە بەندەنێ
لەگەلّ پێشمەرگە ئەجەنگم
لە ترسانا زەردە ڕەنگم
عارەبێک خوێنتالّی چەپەلّ
زمان پیس و خوێڕی و دەغەلّ

به کوردستان ئەڵێ شیمال
لە شوێنمە بە تەعال تەعال
بە عارەبی پێمان ئەڵێ
ئەیکوژم کێ لەشەڕ هەڵێ
خۆشی ناوێرێ بێتە پێش
ڕۆحی ئەچێ لە وزەی مێش
من ئەبێ چ بێ تەگبیرم
لەناو دوو ئاگرا گیرم
ئەچمە پێش. مردنم بەشە
پاشم عارەبی ڕوو ڕەشە
* * *
ـ تۆ کە لەسەر دنیا جاشی
دیارە ڕووڕەشی ئەو لاشی
دەتۆپی وەک تۆپینی کەر
فریشتەی خودات دێنە سەر
چیت لایە بۆ «مەڕنەمووکە» ؟
ـ سێزدە دینار و ڕبووکە!
ـ لات وایە بەهەشت بۆ تۆ بێ؟
ـ ئەگەر پڕ لە کاوو جۆ بێ
ـ بەڵێ ئێستا تێت گەیشتم
دوژمن و بڕبڕەی پشتم
نازانی جاشی قوڕ بەسەر
گەورەش ببی ئەبی بە کەر!

خۆت حەز ناکەی ڕزگارت بێ
پێت خۆشە دوژمن سوارت بێ
دوژمنی نیشتمانەکەت
کلۆی ڕەز و بێستانەکەت
ئەیەوێ لە ناو بچین گشت
بە یەکترمان ئەدا بە کوشت
تۆی ناوێ و بە منیش ناوێرێ
ئەتگرێ و بۆ منت ئەنێرێ
من و تۆ بەگژ یەکا چین
هەرتک لە کوردستان لاچین
مار بەدەستی دوژمن ئەگرێ
قازانجە هەر لایەک بمرێ
دین و نامووست لێ ئەکرێ
خۆت بەدەستی خۆت سەر ئەبڕێ
بەو فێڵە کورد بفەوتێنێ
کوردستان بۆ خۆی بمێنێ
تا کەی دەسخەڕۆی ڕەنجەڕۆ
کورتانت باوێژە و بڕۆ
بڵێ ئاغا تف لە چارەت
لەعنەت لە خۆت و لە پارەت
من نامووس و نیشتمانم
خۆشتر ئەوێ لە گیرفانم
نامەوێ ئەم نان و بەرگە

ئەچم ئەبم بە پێشمەرگە
ڕێی پیاوەتی و شەرەف ئەگرم
لەسەر کوردایەتی ئەمرم
بمرم لەگەڵ کوردی برام
شادی و بەختەوەریە لەلام
کوردستانی خۆم ڕزگار بێ
کوڕی کوردی دەس بە کار بێ
خێر و بەهرەی وڵاتی خۆم
دوژمن نەیبات و خۆم بیخۆم
منالم کوردی بخوێنێ
حاکم بەکوردی بمدوێنێ
دوکتۆری کورد دەرمانم کا
کورد بیری نان و لانم کا
ئەوسا سەربەرز و دڵخۆشم
زۆری خۆم بە کەم نافرۆشم
جاش ڕووڕەشی خەڵک و خوایە
ـ کاکە هەرچی وتت وایە
زۆر نەزان بووم، تێت گەیاندم
لە خەوا بووم، ڕات پەڕاندم
بەڵام ئەوا گریمان کرد
دەسم بەردا و بوومەوە کورد
خەڵک هەرپێم ئەڵێن جاشی؟
ـ نا ، پێت ئەڵێن کوڕی باشی

ـ دە بەخوا چیت وت وا ئەکەم
تفەنگ ئەڕفێنم و ڕائەکەم
هەر عارەبێ بێتە پێشم
دایکەکەی لەکەر ئەکێشم
هەر جاشێکی بێتە بەرم
ئەی تەزێنێ گوللەی گەرم
ـ وا پێک هاتین
ـ وا پێک هاتین
هەردوک:
هەموو کورد و یەک ئاواتین
کوردستان ماڵی کوردانە
با لێی دەرکەون بێگانە
* * *

پشتی ولاش، ١٣/٩/١٩٦٥- بەسەرهاتی پێشمەرگەیەکە و کردوومەتە شیعر،
لە ئیزگەی شۆڕش خوێنرایەوە و لە ڕۆژنامەی خەباتا بلاو کرایەوە:

## چۆن بوومە پێشمەرگە؟

تۆڵەساندنە

گـــــــوندەکـــــــەمـــــــان زۆر ئـاوا بـوو
هـەرچـی بـتـــــەوێ تـێـــــیـــــــدا بـوو
زەوی بـــــە پـــــیـــــت و ئـــــاوی زۆر
تـەســـــــەل بـوویـن لـەنـان و پـێـــــخـــــۆر
خـــــــــــــاوەنـــی ڕەز و تـــووتـــن بـــووم

خاوەنی مناڵ و ژن بووم
هێندێ پاتاڵی دۆم هەبوو
لە هەر شت بەشی خۆم هەبوو
لە ڕۆژا خۆم و مناڵم
ماڵی مامم، ماڵی خاڵم
وێکڕا بەر ئەبووینە زەوی
ڕێکمان ئەخست بەرز و نەوی
کێڵان و کڵۆ شکاندن
بژار و هەژگەڵ پەڕاندن
دایک مێوەی لێوە دەکرد
باب تووتنی پێوە دەکرد
لە کاری ڕۆژ بەتاڵ ئەبووین
ئێواران بەرەو ماڵ ئەبووین
زیقەی مناڵم لا خۆش بوو
خەمم بەوان فەرامۆش بوو
حیلکەی کیژە چکۆڵەکەم
خونچیلە و نەرم و نۆڵەکەم
گاڵەی کوڕە سێ ساڵەکەم
وەک بەهەشتێ بوو ماڵەکەم
ئازووقەی سێ مانگم دانا
برسی نەبین لە زستانا

* * *

ڕۆژێک ئای لەو ڕۆژی وا شووم
وەک جاران بەرەو مەزرا چووم
تازە زەردە دابووی لە کێو
هارە ئەهات وەک هارەی دێو
فڕۆکەم بەرچاو کەوتن دوان
گەمارۆیان دا گوندی جوان
بۆمبا دابارین سێ و چوار
دێ ون بوو بە تۆز و غومار
ڕام کرد بەرەو ماڵ بزانم
چی لێ هات ماڵ و خێزانم
چی ببینم؟ ماڵ کوانێ ماڵ؟
گڕی ئاگر، مشکی، زووخاڵ
نەشمیل، کوردە، بابە، دایە
کڵۆڵ خۆم کەس دەنگی نایە
جیران، لە کوێن؟ بۆ ناپرسن!
ئەویش ماڵ سووتاون وەک من
خۆم هاویشتە ناو گڕی سوور
گڕ چی! وەکو گڕی تەنوور
کە ڕوانیم، چیم بێتە بەر چاو
کافر دڵی ئەبوو بە ئاو
ژنم ڕۆڵەی لە باوەشا
کۆڵوون لەناو خۆڵی ڕەشا
دایک لە لایەک سووتاوە

باوک بە دووکەڵ خنکاوە
نەشمیلم لە بێشکەی سووتاو
نیوە مردوو، نووزە تیا ماو
خۆم دا بەسەریا لە تاوان
شوشتم بە فرمێسکی چاوان
سووتام، بەڵام پێ نازانم
کیژۆڵەم خستە سەرشانم
هێنام ڕام کرد بەرەو کانی
ئەمجا لە پڕ هێندەم زانی
دەبابە گەینە لای ڕەزی
زۆر عەسکەریان لێ دابەزی
عارەبی چەپەڵ و خوێن تاڵ
تەعال تەعالیانە وەک لاڵ
کیژیان لە شانم کردەوە
بەرەو ئاگریان بردەوە
هەیهاوار هەیداد هەی بۆ خوا
لەلای زاڵم بەزەیی کوا!
مەلا هات بە قورعانەوە
لەڕێ بەرپەرچی دانەوە
زابتێکی ڕەشکەڵەی لەڕ
ڕووگرژی چاوسووری بەدفەڕ
مەلای دایە بەر مست و جوێن
ڕیشی سپی ڕەنگا بە خوێن

قورعان، ئەو قورعانی وا هەق
لە بەرچاوم دایە بەر شەق
بەستیانم، دڵم ڕاچەنی
ڕووڕەش قاقا پێ دەکەنی
خوایە هەر خۆت هەڵی نەگری
ئێستاش ئەبیەم نەشمیل ئەگری
دەگەڵ زیڕژنی جەرگ بڕ
نەشمیلیان هاویشتە سەر گڕ
لە تاوان لە هۆشی خۆم چووم
ئەوان لایان وابوو مردووم

* * *

ئێوارە چاوم هەڵێنا
وام لەناوەند لاش و خوێنا
هەر ژن و پیرە کوژراوە
هەر منالە و سەر بڕاوە
گوند بەسەر یەکا تەپیوە
ئاگر هەر دانەمرکیوە
نە ڕەز، نە تووتن، نە پاتاڵ
نە جیران ماوە و نەهاواڵ
زۆر گوندان گەڕام سەر و بن
زۆر کەسم دی بە دەردی من
هاوار قورعان خوا پێغەمبەر
چیمان کرد ئێمەی قوڕ بەسەر!

مناڵمان کام گوناهی کرد
خوا بۆ ئێمەت بەو دەردە برد؟

* * *

ڕیش سپییەک هات بە لامەوە
گەلێک دڵخۆشی دامەوە
تێی گەیاندم لە کارەسات
لەچی و بۆچی وام بەسەر هات
هێندێک عارەبی ئەو خوارە
نەزان و خوێڕی و بێکارە
زۆردارن، خودا نەناسن
پیسن، بێ دەرپێن، پێخواسن
هاتوونە سەرمان وەک جەردە
چاویان لە خواردنی کوردە
ویستیان بێ سەروبەرمان کەن
لەم کوردستانە دەرمان کەن
داگیری کەن شار و دێمان
خۆیان دانیشن لە جێمان
زەوییەکەم ڕەشێک بیکێڵێ
نانی شەو بۆ من نەهێڵێ

* * *

لەو ڕۆژەوە من و زۆر کەس
بەسوێند دەسمان خستە ناو دەس
بڕیارمان داوە تا ماوین
بەهار بێ و زستان و هاوین

لــه هــەوڵــدان دانــەمـــــــــــــێــنــین
تا تۆڵەی خـــــۆمـــــان دەســـــتـــــێنین
مـــــاڵ و گـــــیـــــان هەرچی هەمـــــان بێ
بە قـــــوربـانی کـــــوردســـــتـــــان بێ
ئەم هەمـــــــوو ئـازا و بـە جـــــەرگـــــە
بۆ وڵات بـوونە پـێـــــشـــــمـــــەرگـــــە
وێســـــتـــــا گـــــەلـێک زۆرن وەک مـن
بـۆ تـۆڵــە ســـــــــــەنـدن لـە دوژمـن
شـــــۆڕشـــــمـــــان بە هێـــــز و گـــــوڕە
بۆ کـــــــوردخـــــــۆران جـــــەرگ بـڕە
* * *
هـەر بـەو زووانـە خـــــــــوا یـارم بـێ
گـــــــــەلـی کـــــــورد هـاریـکـارم بـێ
ئـاگـــــــریـان لـە گـــــیـــــــان بـەردەدەم
خـــــۆڵ و قـــــوڕیـان وەســــــەر دەدەم
تۆڵـەی کـــــوردەو تۆڵەی نـەشـــــمـــــیـل
ئـەبـێ هـەڵـیـــــــــان واسـم بـە پـیـل
تـــــۆڵـــــەی ژن و دایـــــک و بـــــابم
شـــــەرتە چیـــــان کـــــرد مـنیش وابم
تـوڵـەی ڕەز، تـۆڵەی مـــــــاڵـەکــــــــەم
تـۆڵــەی دەغـڵ و پـاتـاڵـەکـــــــــــــەم
لـە بیـــــــرمـــــــە و دڵ پـڕ ئـاگـــــــرم
نـەیـســـــــێـنـم ئـۆقـــــــرە نـاگـــــــرم

هەر کـــــــەس نـەیبـێ بیـــــــری تـۆڵـە
لـە بـابـی خـــــــــــۆی نـەبـووە و زۆڵـە

* * *

لێوژە، ١٩٦٥/١٢/١- ئەو چیای سەفینەی عیسا شاوی بە دیاری ئەیدا بە موشیر عارف دەس کوردان کەوتەوە و جاش و عارەبیش ئەوی لە تۆپین ڕزگار بوون و زۆر بە شپرزەیی هەڵاتن. لەو بارەوە نووسیومە. لە ژمارە (٤٨٢) خەباتدا چاپ کراوە:

## دەمەتەقەی پیرۆت و باپیر

پ: باپیر مەرحەبا

ب: مەرحەبا سەرچاو

پ: بۆ کوێ وا گورجێ؟

ب: بەخوا، ئەچمە ڕاو

پ: ڕاوی چی ئەکەی؟

ب: هەر چیم دەسکەوێ

بەراز بێ، جاش بێ، زابتە عەرەوێ

من هەر پیس کوژم بچمە هەر جێیە.

پ: بۆ ناچیە سەفین! شاویەکی لێیە

ئەوی کێومانی ئەدا بە دیاری

ب: پیرۆت لە ئەقلا گەلێک هەژاری

شاوی و ماوی چی؟ ئەو ڕۆژە نەما

جاشک بزەڕن بە هەوای کەما

پ: ڕاست ئەکەی دیتم (زێڕۆ) بەگیان کوشت

چوو بۆ جەحەندەم کلک لەسەر پشت

ساتۆخوا مەڕۆ پێم بێژە باپیر

ئەوێستا چۆنن جاشوولەی موشیر؟

ب: یەکجار کەساسن گوێیان تەپیوە
موشیری باوکیان سمی قەڵشیوە!
پ: جا گوایە سمی بە چی قەڵشاوە؟
ب: جووتەی لە بەردی کوردستان داوە
پ: دەک مردووی مرێ بەخوا گوێرێژە
ب: ئیتر مۆزی کرد لەو سەرو لێژە
زابت سواری جاش سەر بەرە ژێرن
پ:ڕاست ئەکەی عارەب بەجاشان فێرن
دەیسا ئەچیە کوێ بۆ نێچیر و گەشت!
ب: ئەبێ لەمەودوا ڕاو بخەینە دەشت
بۆ هەر کوێ ڕاکەن ئەیاندۆزمەوە
بەم بەراز کوژەم ئەیان قۆزمەوە
پ: ئا، قوربانت بم باپیر بیانپێکە
کلکە جاشێکیش بۆ من بەڕێ کە

* * *

لێوژە، ١٩٦٥/١٢/٢٦- موشیر عارف خوا جەزای کردەوەی خۆی بداتەوە هەمیشە خۆی وا نیشان ئەدا کە موسوڵمانی چاکە و بە بێ مناسبە ئایەتی قورعانی دەخوێندەوە. لەو بارەوە ئەمەم نووسیوە:

## دەمەتەقەی پیرۆت و باپیر

پ: تووڕەت ئەبینم، خێرە مام باپیر؟
ب: پیرۆت زۆر قەڵسم لەداخی موشیر
پ: موشیر یانی چی؟
ب: یانی مل هوڕێ

ڕووڕەش و دەسبڕ وەک قەل ئەقڕێ
پ: چی ئێژێ؟
ب: ئێژێ من موسوڵمانم
حاجیم، نوێژکەرم، لە دین ئەزانم
ئایەت ئەخوێنێ خوێناو هەڵێنێ
ساوا ئەکوژێ و گوند ئەسووتێنێ
مەلا و مزگەوت بەر بۆمبا ئەدا
چی خوا پێی خۆشە خۆی لێ لا ئەدا
پ: فێڵ لە خوا ئەکا؟
ب: نەخێر لە من و تۆ
دز بەشەو دزە، ئەم بە نیوەڕۆ
پ: ئای لەو مەلعوونە لەو بێ ویژدانە
دەک بە گژیا چێ خوای ئەو قورعانە
ب: پیرۆت گیان گەرەک خۆمان ئازا بین
بچین بە گژیا و بە تەمای خوا بین
پ: سا پەنا بەخوا سەکەتی ئەکەین
هەرچی دەسبڕ بێ لە ناوی ئەبەین
حاجی جاشیش هەن بۆ وان چە ئێژی!
ب: بەخوا پیرۆت گیان ساویلکە و گێژی
کەر بە چوونی حەج چۆن ئەبنە حاجی
هەزار جار بیشۆی هەر پیسە تاجی
کەسێک ببێتە داردەستی زۆردار
ناموس و خزمی بدا بە دینار

حەجی لە کوێ بوو؟ نوێژ و ڕۆژووی کوا!
پ: بەخوا ڕوو ڕەشن، ئەی پەنا بەخوا!
مەلاش ئەیفەرموو جاش بتۆپێن
خەزایە و خێرە دەس دامەنوێنن
وا خەنجەر دێنم بۆ عەسکەر دڕین
ب: نەقیزەش بێنە بۆ جاش لێخوڕین
* * *

لێوژە، ١٩٦٥/١٢/٢٦- ڕادیۆی بەغدا پەرازیتی هاویشتبووە سەر ڕادیۆی شۆڕش و لە پەسنا سەفحەیەکی لێ ئەدا کە هەر دەیگوت «هانی هانی» ، منیش گاڵتەم پێ کردووە و ئەمەم نووسیوە. لە دەنگی پێشمەرگەدا چاپ کراوە:

## هانی هانی

ئەڵێن خوالێخۆشبووەکەی باوکی موشیر چل ساڵ فەرمانبەری حکوومەت بوو لە زەمانی عوسمانلیدا. ئەوەندە نازیرەک بوو تەنیا وشەی هانی فێر ببوو، کە بە تورکی یەعنی کامە؟ جا بۆیە ئێستاش موشیری کوڕی ئەوەندەی قەوانی هانی هانی پێ خۆشە؛ چونکە تەنیا کەلیمەیەک بوو کە باوکی لە زمانی بێگانەوە فێری ببوو. هەموو ڕۆژ بە گۆرانی ئەیگوت. وا ئێمەش بۆمان کردە گۆرانیەک:

هانی هانی هانی هانی
مام عارف ترکی ئەزانی
موشیر ئەیڵێ بە گۆرانی
هانی هانی هانی هانی
موشیر ئەڵێ موسڵمانم
بۆیە دوژمنی کوردانم
با پێی بڵێن سیکتر جانم
بردت ئابڕووی موسڵمانی

هانی هانی هانی هانی
شەوێ لە میسرا ئەرەقسی
ڕۆژێک حەرەسی بۆ بەعسی
لە سێبەری خۆت ئەترسی
پێشت وایە پالەوانی
هانی هانی هانی هانی
دنیای پڕ کرد چەق و لوورە
وتت کورد لەو دیو سنوورە
ئەگەر دوژمن هێندە دوورە
بۆ تۆقیوی لە بارزانی
هانی هانی هانی هانی

* * *

لێوژە، ١٩٦٥/١٢/٢٩- ئەم چیرۆکە بەسەر هاتی پێشمەرگەیەکی پیرە کە بۆی گێڕاومەوە و منیش کردوومەتە شیعر. لە ئیزگە خوێنرایەوە و لە ڕۆژنامەی خەباتا چاپ کراوە:

## چۆن بوومە پێشمەرگە

ناموس پارازتنە

لە مێژە نازانم کەیە
هەر ئەمان بیست شۆڕش هەیە
ئەیانگوت کورد ڕاپەڕیوە
پرزەی حوکماتی بڕیوە
پێنج شەش گەنجیشمان دیار نەبوون
ئەمانزانی بۆ شۆڕش چوون
بەڵام ئێمەی پیر و بەساڵ

مابووین لە ناو ماڵ و مناڵ
وتمان پیرین و نەفەستەنگ
نەمان ماوە تاقەتی جەنگ
کەس کاری بە ئێمە نییە
ئەم بەردا و بەردەی بۆ چییە!
ئاگرە سوورە لە خۆم دوورە
مەسەلەیێکی مەنشوورە

* * *

ئاغامان یەکی زگ زلە
خودا و دینی پارە و جلە
تێر ناخوا ئەڵێی کەندووە
بۆ فلسێک گیانی دەرچووە
چەندێک هەر ئەهات و ئەچوو
جارجار دوو سێ ڕۆژ ون دەبوو
ڕۆژێک تەشریفی هاتەوە
بەتفەنگێکی خەڵاتەوە
بە دوو ڕێز فیشەکدانەوە
بە فیز هات بە لامانەوە
وتی دوێنێ چوومە هەولێر
سەفەرێکی بە خێر و بێر
پارە و چەکیان زۆر داوە پێم
منیش لەشتی وا ئەگەڕێم
وا عەسکەر دێنە ئاوایی

براتانن خۆم ئاسایی
موسوڵمانن، کوڕی چاکن
عارەب دەس و داوێن پاکن
مەلای دێش هاتە بەرەوە
مێزەری زل بە سەرەوە
فەرمووی مەترسن خۆم زامن
عەسکەری عارەب ئیسلامن
فەرقیان نییە دەگەڵ خۆمان
وەک برا باش ئەبن بۆمان
زانیمان ئاغامان جاشە
بە ناچاری گوتمان باشە

* * *

چل عەسکەرێ هاتە ناومان
خوایە چی هاتە بەرچاومان!
قەت پیسی وامان نەدیون
پێت وابوو مشکە تۆپیون
ئێسک قورس و ڕەزا گران
ئەتوت لەگەڵ شەیتان بران
هەر بەع بەعیانە وەک کاوڕ
بە چەڵتەچەڵت و زمان شڕ
بە ئاگری چەرخیان ئەوت: ناڕ
ئاغایان ناو نابوو: حوماڕ
برسی و دز ئەچوونە ماڵان

تەبەکیان ئەبرد بە تاڵان
ڕاوکەی بەر مریشکیان ئەبرد
هەر باسی ناکرێ چیان ئەکرد
نە نوێژ نە دین نە ئیمان بوو
مەلاش لێیان پەشیمان بوو
ئەی گوت ئەمانە کافرن
کافر لەمانە چاترن

* * *

ڕۆژێ ئاغا چووبووە هەولێر
بە ملی شکاوی و چاوی کوێر
ئەرزاق و دینار بستێنێ
هێندەی تریش عەسکەر بێنێ
بەیان بوو، لەلای مەلا بووین
لە بیری چارەیەکدا بووین
چەند کەسێک ئاغا بدوێنن
ئەمانە لامان نەمێنن
لە پڕێکا لە ماڵی موختار
بوو بە قیژە و زیڕە و هاوار
کەبانووی موختار خۆیەتی
بەگریان داد و ڕۆیەتی
بانگمان ئەکا ئەگەر پیاون
کوا ناموستان بۆ وەستاون!
وا عەسکەر زۆرم لێ ئەکەن

نەمگەنێ نامووسم ئەبەن
ئیتر تەم هاتە سەر چاوان
دەنگ نەکردن ببووە تاوان
لەسەر نامووس خوێن هاتە کوڵ
دەمی کێرد گەیشتە سەر دڵ
وێکرا دەسمان دا خەنجەران
بەربووینە گیانی عەسکەران
مەلاش بە خۆی و تێڵایە
ئەیوت بیانکوژن خەزایە
کێ جوندیەکی سەکەت ئەکرد
تفەنگەکەی بۆ خۆی ئەبرد
هەتا لە چنگمان خەلستن
چاردە کەلاکمان لێ خستن
ئەوەی مان، لاقیان ببوە چوار
پێخواس قاچاندیان بەرەو شار
قیڕەقیڕی یابە لەو ناوە
هەر ئەتگوت بەرازە ڕاوە
دوایی عەسکەرمان بڕیەوە
نامووسی خۆمان کڕیەوە
نامانەچاڵ هەرچیەکمان کوشت
ئەمجا کەوتینە خۆمان گشت
لە نوێن و هێندێک ورد و پرد
هەر کەس سووکە باری بارکرد

منال و ژنان دایە بەر
بەرەو شۆڕش بووینە کۆچەر
بەرهەمی شەڕ و هەرامان
خەتای کەوتە سەر ئاغامان
گیرا و لە جاشەتی کەوت
شەش حەو مانگ لە حەپسا خەوت
وێڵ کرا, نە جۆ، نە کایە
ئێستا جاشی بەرهەڵدایە
دوژمن هاتە سەر گوندی چۆڵ
ڕێکی کرد دەگەڵ خاک و خۆڵ
بردیان هەرچی بە کاریان بێ
با بیخۆن ژەهری ماریان بێ
ماڵی دنیا چڵکی دەستە
شەرەف و نامووس مەبەستە

* * *

هاتووم تا ماوم بێ وەستان
ئەمە پێشمەرگەی کوردستان
قەدری شۆڕش وا لای منە
شەڕی نامووس پارازتنە
مەڵێن پیربووی گەنج بوومەوە
لەسەردا تێ هەڵچوومەوە
سا شەرتە بە شەرتی پیاوان
ناوم بخەمە ناو ناوان

کارێک بەسەر دوژمن بێنم
چەرمیان لە دار بهاڵێنم
لە مێژە بە عەسکەر فێرم
نابێ یەکیان لێ ببوێرم
بەزەم بە دوژمنا نایە
نایکەم بە ئاگری بن کایە
هەتا دوژمن بەرباد نەبێ
تا کوردستان ئازاد نەبێ
تفەنگ لەشان ناکەمەوە
ئاورِ لەخۆم نادەمەوە

* * *

لێوژە، ١٩٦٦/١/١٦– دوژمن زۆری شایی بە فەوجی مغاویر بوو تا لە شەڕی پێنجوێنا زۆر شپرزە کران. بەو دەمەتەقەیە گاڵتەم بە مغاویر کردووە لە دەنگی پێشمەرگە چاپ کراوە:

## دەمەتەقەی باپیر و پیرۆت

ب: مام پیرۆت کزی؟
پ: لێم گەڕێ باپیر
ئەڵێن پاپەتی بوونە مغاویر
مار ئەخۆن، ئاگر ئەنێنە باخەڵ
مریشک ئەدزن وەک ڕێوی و چەقەڵ
ب: پیرۆت بێ دەنگ بە مغاویری چی!
پەلکی پیاز و سەری سیری چی!
لە پێنجوێن ئەوەی بەمان کراوە

له هیچ دەورانێک وا ڕووی نەداوە
دەڵەک نەدەژیا لە پاش مغاویر
واقوڕ ئەپێون بەزاز و موشیر
پ: دەم خۆش مام باپیر دیارە هەرایە
ب: سەیرە لەو دەشتە جاش بەرهەڵدایە
ترومبێل نەما بەپاشوو هەڵدێن
زابت لە شوێنیان بە پلار و جوێن
یابای عەسکەرە و زەڕینی جاشە
ڕێوی مر بووە و لاشە بەلاشە
موشیر ناوی خۆی لە بیر چۆتەوە
بەزاز چاویلکەی لێ بەربۆتەوە
پ: بیستوومە بەعسی دێنە هاواریان
ب: لە بیریان ناچێ دەردی پێراریان
ڕەمەزانیان گرت بە لەشی خاوێن
تازە دێن خۆیان دەئاگر داوێن؟
هەر کەسێ جارێک شەقی کوردی دی
دەرس وەردەگرێ، کەر نابێ چیدی
پ: یەکێ تریش هەس، بلێیی بۆی بکا*
ب: با کەچەڵ دەرمان سەری خۆی بکا
وەگیان تۆ پیرۆت گشتیان هەڵبستێ
هەر خۆمان یەک بین پێمان ناوەستێ

* نیاز عەبدولناسرە.

پ: دڵت خۆش کردم، خۆش بی مام باپیر
هەی ڕەحمەت لە تۆ و نەحلەت لەموشیر

* * *

لێوژە، ١٩٦٦/٣/٣- موشیر عارف شەکری شکاند و قەولی دا کە لە بەهاردا کوردەکان خەلاس دەکا، گاڵتەم پێ کردووە، لە دەنگی پێشمەرگە ژمارە (١١)دا چاپ کراوە:

## دەمەتەقەی پیرۆت و باپیر

پ: باپیر ئەتبینم کەیفت زۆر سازە
ب: پیرۆت دنیاکە ڕاوە بەرازە
شتی وا ئەبیەم کەس نەیبیستووە
وا دیسان موشیر شەکری فەرمووە
پ: ئەڵێ چی! ئادەی
ب: ئەڵێ تا بەهار
کورد ئەتوێنمەوە وەکو بەفری پار
پ: با بەس بوەڕێ ئەوە چوار ساڵە
هەر دای ئەبەستێ و نوێژی بەتاڵە
خۆزگە ئەو دایکەی کەری هێنابا
لەدەس منا با و بارم لێ نابا
بۆچ لە ناو فەسڵان لە بەهار گیرە!
ب: بەهار بەهەشتی نێرە موشیرە
چەندێک تەشریفی بەرەو میسر کرد
جوزیان پێوە کرد لە خشتەیان برد
لای وایە ئەوجار پێمان ئەوێرێ

له کۆشی خەڵکا گوێزان دەژمێرێ
پ: خۆ ئێژن کاکەی زۆر حاڵی شڕە
لەشکری قڕە و له مشت و مڕە
ب: با تێر باوبژ له خۆیان دەرکەن
مەگەر تا پایز هەرخۆڵ وەسەرکەن
پێشمەرگە خۆش بێ هەزار هێندی دیش
بۆمان بێن، سمێڵ ئەنێنە سەر ڕیش
ئەو بابەیان مرد بە جاش و بە فێڵ
کوردستان پیس کەن توتکە سەگ و دێڵ
پ: ئای هاتە بیرم، جاشوولە چۆنن!
ب: کەتوونە لوشمە و له شوێن کای کۆنن
سەگ کلکیان لێ دا سلار ئەبنەوە
ناگەنە بەهار مردار ئەبنەوە
پ: باپیر من ئەڵێم با بێنە لای من
کای عارەب نەخۆن بێنە سەر کای من
ب: ئەگەر تێگەییان جاشک نەدەبوون
بەرەو تۆپینی خۆیان نەدەچوون

* * *

لێوژە، ١٩٦٦/٢/٢٤- حیزبی بەعث له سووریا ئینقلابیان لەسەر یەکتر کرد و تێک بەربوون و ببووە شەڕە سەگ، ئەمەم لەسەر نووسین، بەڵام بڵاو نەکرایەوە:

## دەمەتەقەی پیرۆت و باپیر

پ: باپیر تۆ له کوێی؟ ڕادیۆنت بێنە
ئەڵێ له شاما کوشتار و خوێنە

ب: دەی دەی، مام پیرۆت پێی ناوێ پەلە
بەعسی تێک بەربوون شەڕی سەگەلە
یەکتری ئەدڕن لە مشت و مڕا
عەفلەقی باوکیان فلّقەی لێ بڕا
پ: عەفلەق کامەیە!
ب: ئەو فەلەی پێرار
موشیر عارفی کردە سەر کۆمار
پ: بەلّێ ڕاست ئەکەی کە وابێ باپیر
چیدی لە بەعسی ناترسێ موشیر
ب: تەڕی تێ ناگەی! چاتر ترساوە
دەسنوێژ ڕاناگرێ و پزووی پساوە
ئەمانەی ئێستا لە شام سەرکەوتوون
بۆ سەگ خنکاندن لە کلّ دەرکەوتوون
موشیر فیتەی خۆی زۆر باش ناسیوە
پاشووی گیرۆدەی تەلّەی تەقیوە
ئەزانێ بەعسی چەن شڕو دڕن
ڕاویان بۆ ئەوە و کەولّی ئەکڕن
پ: مام پیرۆت نەمگوت کورد وەجاغ زادەن
کێ دەستیان لێدا نەجاتی نادەن
ئەوانەی قاچی کوردانیان ئەگەست
وەک سەگە خوێڕی، لێک هاتوونە دەست
لەو سەگ سەگێنە جاشک چی ئەلّێن
ب: گوێ ئەبزوێن خەریکن هەلّێن

موشیری باوکیان ئەوە حاڵی بێ

جاش چۆن ئەوێرێ خڕەی ناڵی بێ

نەقیزە زۆرە و کاوو جۆ کەمە

تا بەهار دادێ ژینیان حەستەمە

پ: خۆ من کام زۆرە لە موشیر بەر بن

با بێنە لای خۆم بەس کوڕی کەر بن

* * *

سوورەبان، باڵەکایەتی، تەشرینی دووهەمی، ١٩٦٦- برایم ئەحمەدی محامی کە بە بلەی ئەحەڕەش مەنشوورە، مامۆستای جاشکەکانی شێست و شەشە و جارێک شینە و تاوێک سوورە و لە نیشتمان فرۆشیدا دەستی هەموو خاینانی لە تەختە بەستووە و بەدار لە پشتدانی بێگانان قاچی کوردی گەستووە. بە لاوەتی کە هەوای پیاوەتی لەسەری دابوو شیعرێکی لە ژێر ناوی (شیرن بەهارە)دا هۆندۆتەوە کە زۆر شیعری چاکە و جێگەی خۆی کردۆتەوە، بەڵام لە دوای ئەو، کە فێری بێگانەپەرستی و ژیانی پەستی بووە زۆر جاری فەرمووە «شاعیر بێ بارن!» چونکە خۆی باری پێشووی هەڵوەشاند و پاشووی جووتەی ئەوەشاند، لەوەتا بووە بە جاش قەریحەی مبارەکی هەر لە دەوری ئارەزووی بێگانان دەگەڕێ و بە بلوێری دوژمنانی کوردستان هەڵدەپەڕێ. شیعری بۆ نایە کە شیرن بەهارەکەی پێشووی بشواتەوە. وا من بە خێری خۆم بە گوێرەی باری ئەمڕۆی بۆم گۆڕیوە:

## شیرن بەهارە

شـــــیــــــرن بەهـارە، بـەهـاری شــــــادان

خــــۆشـــە مـــــەیخـــــانـە و بـابـۆڵـە بـادان

تـازەم زانـیــــــــوە پـارەی زۆر تـێـــــــــدا

گـــــــەل فـــــــرۆشـتن و لـە ڕێـگـە لادان

* * *

شــــیـــــرن بـۆت بـکـەم بـاسـی جـــــوانـیـم

خــــۆم لـە کـــــورد گــــۆڕی هـەتـا توانـیـم

ئێستە نانخۆری دەستی بێگانەم
جارێک بەغدایی، ڕۆژێک تارانیم
* * *
شیرن بت دیبام لە «کافەی شمشاد»
چۆنم ڕا ئەبوارد سەرخۆش و دڵشاد
نیشتمانم دا بە ویسکی و کۆنیاک
گوێ نادەم بە کەس، هەرچی باداباد
* * *
شیرن، لە بەغدا دەگەڵ منا بی
سەرخۆش ڕابوێرین لە «حەمموڕابی»
ئەوسا تێ ئەگەی ژیان چەند خۆشە
عەقڵت دێتە سەر، ئیتر کورد نابی
* * *
شیرن لە تاران قەسر و سەییارە
دێمەوە بەغدا، دینار هەزارە
چیم لەنان و دۆی پێشمەرگایەتی
کێ لە کێو دەژی ڕەنجی خەسارە
* * *
بژی بۆ پارە، مەمرە بۆ ژیان
هەر مەڵێ کوردم تا نەکەی زیان
لە خەشەی دینار دڵت نەلەرزێ
لەزەت بۆ لەشە نەوەک بۆ گیان
* * *

شـــیـــرن بۆت بڵـــێم باسی نیـــهـــانیم
بـه بـێ هـوده چـوو ژیـانـی جـــــــوانـیـم
من و کـــوردســـتـــان کـــوجـــا مـــەرحـــەبا
بەڵام داخـــــەکـــــەم، بـە پـیـــــری زانـیـم!

* * *

شـــیـــرن، حـــاکم بووم دەســـتـــدار و توانا
خــــۆشی لە دڵا، زێڕ لە گـــــیــــرفـــــانا
بە هەوای کــــورسی کــــوردایەتیم کــــرد
بۆ ڕیش ئـەگـــــەڕام ســــــمــــێــــڵم دانا

* * *

شـــــیـــــــرن تـۆبـە بـێ لـەمـــــە بـەولاوە
کـــورد و کـــوردســـتـــان ئەنێـــمـــە لاوە
کـێ بـڵـێ کـــــــوردم ئـەیـدەم بە گـــــــرتـن
ئـازادیـخـــــــوازی خــــــەیـاڵـی خـــــاوە

* * *

مانگی ١١/١٩٦٦- شیعرێکە پێشکێش بە مامۆستا بلە کراوە و لە خەباتی ژمارە (٤٩٢)دا چاپ کراوە:

## کوێخای بەکرەجۆ

بلـەی ئەحـــــەڕەش جـــــاشی ڕەنجـــــەڕۆ
وەکـــیلی عـــارەو لەســـەر «بەکـــرەجـــۆ»
چەند جوانت لێ دێ موی سپی و ڕووی ڕەش
نۆشی گـــیـــانت بێ کـــەنگر و کـــەربەش
نـەقــــــیــــــزەت ئـەوێ ڕێگـەت هـەورازە

دەک پیـــــــرۆزت بێ کـــــــورتانی تازە
پیـــــری ئاخـــرشـــەڕ وەتەنت فـــرۆشت
ئابڕووت گـــۆڕیەوە بە شـــەراب و گـــۆشت
چـــوویـــە بـــاوەشـــی دوژمـــنـــانـــەوە
خـــول ئەخـــۆی بەلای قـــاتر خـــانەوە
زۆر هەرزانت دا شــــــــەرم و ویژدانت
کـــــوێرت کــــــردەوە مــــــاڵی باوانت
ئەحــــەی باوکــــیـــــشت تۆ ئابڕووت برد
بیـــری لێ بکەوە مـــامـــۆســـتـــا چت کـــرد
نرخی نیـــشـــتـــمـــان پارە و جـــۆ نیـــیـــە
نیـــشـــتـــمـــانی کـورد مـــوڵکی تۆ نیـــیـــە
گـــــەر ئابڕووت بوو بێ! ئەویشت دانا
ســـەڵا لە ئەقـــڵت مـــامـــۆســـتـــای زانا
هەزار خـــــاییـنی وەک تـۆمــــــان دیـوە
بە ئاوات نەگــــــا و لە ڕێ تـۆپیـــــــوە
کـــورد هەر ئەمـــێنێ و مـــافی دەســـێنێ
یادی تۆش ئەکـــا جـــار جـــار بەجـــوێنێ

* * *

سوورەبان ـ ١٩٦٨

## دەمەتەقەی پیرۆت و باپیر

پ: مام باپیر تووڕەی؟

ب: هەر تووڕەم و بەس؟

پ: لەسەرچی؟
ب: لە داخ جاشوولەی تەرەس
گازم لێ ئەگرێ، لووشکە ئەهاوێ
پ: دەیسا بیفرۆشە وەبۆرە پیاوێ
ب: بۆ خۆی خۆی فرۆشت پێرار وەپارە
ناو کورتانەکەی پڕ لە دینارە
پ: کام جاش؟ شینەکە یان هینەکەی ڕەش؟
ب: دێزە و پێی ئێژن جاشی شێست و شەش
مامۆستامان بوو، بۆ کورد کوردێنە
ماڵی ڕماندم، هەر ئەیوت بێنە
بڕنۆی پێ کڕیم، شەڕی پێ کردم
بۆ هەمەدانیش لەگەڵ خۆی بردم
گەڕاندمیەوە بۆ شەڕی وڵات
منی تووش کرد و خۆی بەشەو هەڵات
لە ناو تەویلەی عارەو خزیوە
ئێستە جەهەندەم هەرچی دزیوە
بۆتە دوژمنم، یەخەم بەرنادا
وەزۆر ئەیەوێ ڕەنجم بە بادا
ئێژێ کوردستان ئەبێ شیمال بێ
جاشک جەحش بێ، وەرە تەعال بێ
عارەو بێنە ناو کوردستانەوە
کوردیش دەربەدەر وەکێوانەوە
دەک یاخوا بەش خۆی ڕەنج خەساری بێ

ئەو جۆبەی ئەیخوا ژەهرەماری بێ
ئەو زۆڵە کوردەی جاشی دوژمنە
گاز لە کورد ئەگرێ گۆڕی کوشتنە

* * *

سوورەبان، ١٩٦٨/٣/٢١- جاشکەکانی مامۆستا برایم و مامۆستا جەلال تاڵەبانی لە بەکرەجۆ گوێزرانەوە چەمچەماڵ و کەرکووک، ئەم سروودەیان بۆ نووسراوە کە هەموو بەیانییەک بیخوێننەوە:

## بەکرەجۆ

بەکرەجۆ مەفتوونی تۆم و شێوەتم بیر کەوتەوە
پەینی وشک و شاڵ و قاشاغت بە کاوو جۆتەوە
من لە زیکر و فیکری تۆ خافڵ نەبووم وا تێ نەگەی
چەمچەماڵ و شاری کەرکووک تۆی لە بیر بردۆتەوە
بەو ڕەئیسەی عەسکەرێکی هیچ نەزان و مل هوڕە
جۆبەکەت جۆرێ لە زگما ئاگری کردۆتەوە
ئەو هەموو بیرە و شەراب و ئارەقەی پێدا دەکەم
قەت گڕو گڵپە و بڵێسەی تاوێ ناکووژێتەوە
باسی خەمباری و کەساسیم هەر مەکە، ترسم هەیە
جێ نەقیزەی تیژی قاید فیرقە پێنج بوکڵێتەوە
سوێند بە بەززاز و بە یەحیا و مەرقەدی مەرحوومەکە
دوور لە تۆ هەر کەس شەرابی خواردەوە دەڕشێتەوە
ئێمە ڕۆڵەی عارەبین، هەرچەندە کوردن دایکمان
ڕوحمی بابان سەد هەزارساڵیش لە بیر ناچێتەوە
بێ قسوورە، چەند جەسوورە جاشی بێ پاڵووی بلە

وا له ڕێی کورد کوشتنا لاشی له خوێن ئەتلێتەوە
بەسیە تەعنەم لێ مەدە هەر جاشەکەی جارانتم
هێندە حیلمت بێ هەتا ئەمجاش مەعاش ئەدرێتەوە
شەرتە شەرتی جاشەتی بێ سووریاش کۆمەگ بکات
ناوی کوردستان شیمال بێ و ناوی کورد گوم بێتەوە
وەرامی پێشمەرگە:
جەحشی وەحشی بووی لە تاوی پارە بیر ناکەیتەوە
جەنگی کوردستان نەمێنێ جاش بەلاش دەخولێتەوە

* * *

شێخ حەنەشی عارەب جاشکی خالیدی کوڕی وەلید بوو، ڕۆژی ١٩٦٧/٤/١٤ لەگەڵ ٥ جاشکی هاوڕەگەزی خۆیدا کوژرا. بەغدا بۆی کەوتە شین و شەپۆڕ و بە هەزاران عەسکەر و جاشی کورد و عارەبی بە تۆپ و تەیارە و زرێپۆشەوە ناردە سەر پێشمەرگەی دەشتی هەولێر، فارس باوە و پێشمەرگە قارەمانەکانی هەواڵی، کارێکیان بەسەر حکومەتی بەغدا هێنا، بانەیی دەگەڵ کەری خۆی نەکردووە لەو بارەوە نووسیومە:

## دەمەتەقەی پیرۆت و باپیر

پ: دیارنەبووی باپیر لە کوێ بووی بە خێر؟
ب: بەخوا مام پیرۆت چووبوومە هەولێر
پ: دەنگ و باس چبوو؟ چۆنە ئەو ناوە؟
ب: دنیا شێواوە، حەنەش کوژراوە
پ: حەنەش یانی چی؟ کام جانەوەرە؟
ب: جاشکی وەلید بوو ئەو پیرەکەرە
لوشکی ئەهاوێشت، ئەیگەزتین بەدەم
لوولە ڕەشاشێک ناردیە جەهەندەم
حوکماتیش کێچی کەوتە کەوڵەوە

بۆ تۆڵەی باوکی کەوتە هەوڵەوە
ئیزگەکەی بەغدا هەر هاواریەتی
شینی بۆ کلک و گوێچکەی لاریەتی
چاو بە گریان و خوێن بە دەمەوە
فەرمووی سەری کورد پان ئەکەمەوە
مغاویر هات و تۆپ و دەبابە
هەروا گابۆڕ بوو، یا وەیلی و یابە
جاشوولەی کورد و عارەبە ڕووتە
بەو دەشتە وەربوون بەزەڕە و جووتە
عەسکەر لێی ئەخوڕین بۆ تۆڵەساندن
پێشمەرگەی خۆشمان باش تێی گەیاندن
ساعیقە پەل بوو، دەبابە شکا
حەیای نەماوی مغاویر تکا
جاشە کورد کلکی بە گەڵۆزەوە
وەلید پەین و خۆڵ بە لمبۆزەوە
کورتان بەجێ مان، عەگاڵ بڵاو بوون
کلاو بێ سەر بوون، سەر بێ کڵاو بوون
سەتیان لێ تۆپان لە سۆنگەی حەنەش
سەری شکاویان بۆ ماوە و ڕووی ڕەش
پ: بۆ حەمەی سابیر بۆ وایان نەکرد!
چەند جاش تۆپێنرا، هەر باسیان نەکرد؟
ب: پیرۆت هۆشت بێ، حەنەش عارەوە
جاشەکەری کورد چۆن وەکو ئەوە؟
جاشێک وەزمانی خۆیان بزەڕێ

هەزار جاشی کورد دەسەری گەڕێ
جاشی کورد بۆ بار، عارەب بۆ بەرە
جاش کە تێ ناگا جسناتی کەرە

* * *

گەلاڵە ١٩٦٨/٦/٢٦

## قەوانە شڕە

بـوو بـە هـەزار و چـوارســـــەد ســـــاڵ
لەگـــەڵ عـــارەب بووینـە یەک مـــاڵ
خـــێـــوی قـــیـــبله و کـــیـــتـــابێکین
وەک دەڵـــێـــن بـــەرە بـــابـــێـــکـــین
بـەڵام ئـەو بـرای ئـیـــســـــلامـــــەم
ئـەو کـــاکـــە نـێـــرە زەلامـــــەم
هـەرچـی هـەم بـوو بـردی بـۆ خـــــۆ
مـنـی کـــوشـت بـە هەرزن و جـــــۆ
بـە فـــــەرمـــــوودەی ئـەو لـە ژینـا
هـاوبـەشـین لـە شـــایـی و شـــینـا
شـین بـۆ مـن و شـــــایـی بـۆ ئـەو
مـن ئـەبێ لـەڕ بم، ئـەو قـــــەڵـەو
***
ئـەگـــــەر داوای نـان و ئـاو کـــــەم
ئـارەزووی بـەرگ و پـێـــڵاو کـــــەم
بـڵـــــێـم بـرای هـاودینـەکـــــەم
هـاوڕێکـەی لـە مـــێـــژینـەکـــەم

بە ناشکوری ناڵێم براین
ناچاریان کردم تێک خراین
لە ڕێگەی خوا و قورعانەکەت
خێری دین و ئیمانەکەت
سەد یەکێ لە داهاتەکەم
چۆڕێک شیری وڵساتەکەم
هەزار یەکێ لە نەوتی خۆم
پێم کەرەم کە بێ نان و دۆم
با بەس کوێر بم بێ ڕووناکی
با پێت بڵێم کاکی چاکی
ئەڵێ هەی لە دین وەرگەڕاو
کورد و بەرگ و نان و پێڵاو!
وە دیارە بوویتە «شعووبی»
ئەبێ لە ڕێگە دەرچووبی
***
هەر لەشێخی ئەزهەرەوە
کێ مێزەری بە سەرەوە
مر دەکرێن لە گۆشت و پلاو
پڕ دەکرێن لە پارە و دراو
وەها تیژ دەبن سەردەکەن
فتوای کافریم دەردەکەن
پاش فتوا، لەم کوردستانە
فڕۆکە و بۆمبابارانە

تۆپ و دەبابە و شێست تیرە
خوێن ڕشتنی لاو و پیرە
کوشتنی ژن و منداڵە
بژیومان هەر خوێنی ئاڵە
مزگەوتەکەم دەڕووخێنن
قورعانەکەم دەسووتێنن
سەرلەنوێ تالاّنم دەکەن
هەرزن و جۆیەکەش دەبەن

***

ناچارم ئەکەن بێمە دەنگ
پەلامار بەرم بۆ تفەنگ
کە ئەشچم تۆڵە بستێنم
وەک پڵنگی چەنگ بەخوێنم
دوژمن خۆ ناگرێ لە بەرم
خوێنیان ڕادەماڵێ، تەرم
ئەبێتە قیڕقیڕی یابا
یابا کە زانی دەرنابا
ئەمجارەش وەک چەند هەزار جار
قەوانە شڕ دەخاتە کار
دیسان مەلا و ئایەت دێنن
لەسەر ئیزگە بۆم دەخوێنن
عەرەب و کورد برای دینن
هەردووک دوعای یەک ئامینن

کـــەی ڕەوایە ئیـــــســـــلام کـــوشتن
حـــــەرام کـــــراوە خـــــوێن ڕشتن
منیش بەســـتـــەزمـــان و فـــەقـــیـــر
دیســـــان لـە تەپکە ئەکـــەم گـــیـــر
بە دوو درۆ دەم خـــــافـــــڵـــــێنن
هـەتـا دەرفـــــــــەت وەدەس دێـنن
دیـســــــــان ئـەو زوڕنـا و ئـەو پـیـکـە
دیســـــان هەمـــان فـــاک و فـــیکە
***
ئـاخـــــر نـاڵـێم جـــــارێک و دوان
تاکـــەی ببـــمـــە مـــەڕی بێ شـــوان
تـاکــــــەی بـەدرۆ دەســــــخــــەرۆ بم
هـەتـاکــــــــەی هـەر ڕەنجــــــەرۆ بم
بـــۆ چ مـــن بـــکـــوژرێـــم ڕەوایـــە!
تـاکــــــەی ســـــەمــــا بـەو هەوایـە!
بۆ چ نەیمە خـــێـــوی نـانی خـــۆم!
بۆ نەخـــوێنم بە زمـــانـی خـــۆم!
بۆ نـەوتی خـــۆم دەس خـــۆم نەخـــەم!
بۆ خـــۆم ڕزگـــار نەکـــەم لـە خـــەم!
بۆ چ مـــــاڵـی خـــــۆم دیـاری نـەبێ!
بـۆ بـەشـم یـەکـــــجــــاری نـەبێ!
مـــن چـــم هـــەیـــە بـــا لـــە لام بـــێ
عـــەرەب بڕوا و هەر ئیــــســـــلام بێ

لە خاکم دەرچێ و لە ڕێدا

قەوانە شەڕەی خۆی لێدا

ئەو ڕۆژەی چارەی نابینم

خاوەنی ژیان و دینم

تاکەنگێ برسی و لەژێر بم!

با تاوێک ئیسلامی تێر بم

ئەگەر کوردیش ببن بە پیاو

وەک گەلانی خودا پێداو

هیچ زیانی بۆ پەز نابێ

قەت لەلای خوا ناحەز نابێ

***

ڕۆژی ١٦/ئابی ١٩٦٨- لە ئاهەنگی بیرەوەریی دامەزراندنی پارتی لە پردی گەلاڵە خوێندرایەوە:

## تیتل وبیبل

نەقڵی مام گورگ و خۆ لەقوڕ نانی

نەنک و باپیرەکان دەیانزانی

خواردنی تیتل و بیبلی بزنۆکە

باسی خۆمان و کۆنە چیرۆکە

***

ڕەنجبەری عارەبی لەمێژ ساڵە

بەسەری قووت و لاقی بێ کاڵە

دوازدە مانگە چ خۆم، چ منداڵم

بۆی ئەچەوسێمەوە و ژیان تاڵم

خاکەکەم زۆر بە پیت و دەسکەوتە

دەغـــــــڵـــــــە، ئاژاڵە، تـووتنە، نـەوتە
چەند بەری لێــــڕەوار و چەند مـــــیـــــوە
بـەرەکــــــــــــەت لـەم وڵاتـە بـاریـوە
ســـــەر و بەر پێم ڕەنێـــــو دەنێ ســــاڵێ
گـــەسک و قــــامـــچی ئەهێنێ، ئەیماڵێ
خـــاکی خـــۆی وردە ڕەمل و خـــورمـــــایە
ئارەقـــــەی ڕەش دەکـــا لـە گـــــەرمـــــایە
کـــــۆشک و پانکەی کــــڕی بە پارەی من
هێـــشـــتـــە هەر لای کـــرێتـــە چارەی من
قـــــــەندەهاریم کـــــــــرایـە نـان بـۆ ئەو
خـــوریەکـــــەم بوو بەقـــــاتی جـــوان بۆ ئەو
دەڵێ ڕانـکـت شـــــــــڕۆڵە مـــــــــەم بیـنـە
پڕ لە ئەســــــپــــێــــیــــە جلکی پڕ پینە

***

ڕای ئەبـوێرم منیش بـەکـــــەشک و بەڕوو
نیـــعــــمـــەتی خـوایە چش لە برش و کـەڕوو
ئـەچمـــــــە شــــــار بارەدارێ بفـــــــرۆشم
لـەشـی رووتم بـە جـــــــــــاوێ داپـۆشم
شــــورتەیە، عــــەسکەرە، نەهەشت و نەنۆ
هەر کـەســـەی ڕام ئەکـێـشێ بۆ لای خـۆ
عـــــــەسکەری و باج و دۆنم و خــــــاوە
حـــاکــــمـــیش جـارێ کـاری پێم مـاوە
دەم دوێـنێ بـە «یـا زمــــــــاڵ» و «ولـەک»
باسی ناکـــرێ بەشم لەحـــەپس و کـــوتەک

هێشتە پێ ناشکوریم و نانالّم
هەوڵ ئەدەم بۆ بژیوی مندالّم

***

کە چی سەرباری ئەم هەموو دەردە
تاوێ نا تاوێ پێم دەڵێ جەردە
بۆ کەمت پێیە! بۆ درەنگ هاتی؟
بۆ ژیان نابی زۆر کز و لاتی!
جوولەکەی دووهەمی و بەڵای سێهەم
دەتکوژم، ناشڵێ پێم کەمن کێهەم؟
کە ئەبینێ لە تان و پۆ کەوتووم
دانی چیڕن لە خواردنی بێچووم
تیتل و بیبلی دەوێن و فیلّبازە
کۆن دەچێ و دێتە جێ یەکی تازە
یەکێ شینە و دەڵێ ئەمن پاشام
کوڕی پێغەمبەرم، نزیکی خودام
یەکی تر دێت کە شینە نامێنێ
گۆشتەکەم خۆشە بۆم دەلووڕێنێ
ئیننەنی و ئیننەنام و سووربۆزم
خێوی بەزمی تەمووزی پیرۆزم
ئەو دەچێ، گورگی زەردو ئەبڵەق دێن
بەچکە عارف لەشوێنی عەفلەق دێن
ڕەوە گورگن ئەوی دەڕۆن و دێن
خۆ دەگۆڕن هەتا نەزانین کێن
هەرچی هات پێم دەڵێ ئەمن چاکم

لەوەڕم پێیە بۆت و شیر پاکم
هێندە ماوم هەتا لە پشت چەپەرام
دەرکی لێ دانەخەم، بزانە خورام
وەک یەکن بۆمە زەرد و سوور و کەوە
دەردی کابرا گوتی عەرەو عەرەوە

***

گەلاڵە، ١٩٦٨/٩/١١- یادی حەوت ساڵەی شۆڕش:

## بەسەرهاتەکەم

ئەو کوردەی ئێستا ژێر دەستە
بە خۆی نازانێ و بێ هەستە
هێندێکی سوورە و هێندێک شین
هێندێک هەر تێ نەگەیون چین!
زۆربەی نوقمی ڕیش و پرچە
پێت وایە ئامۆزای ورچە!
مامۆستا و خوێندەوارەکان
شامار و شادەمارەکان
دەبن بەجاش، خۆ دەفرۆشن
بۆ دوژمنان تێ دەکۆشن
هەڵوەدای کورسی و دراون
هەست ناکەن هوڕە لێ دراون
بەبیور لاقی خۆ دەبڕن
مردن بۆ خزم و خۆ دەکڕن

گشتی پاشماوەی پیاوانن
نەتەوەی خاوەن ناوانن

* * *

با پیرەکانمان لە زوودا
بەناوبانگ بوون لە مێژوودا
ئازایەتی و کورد دوانە بوون
ترسێنەری بێگانە بوون
ماد و کەیانی زوو منم
زاڵ و گیو و برزوو منم
بناغەی زەند و ئاوێستا
لەسەر پەنجەی من ڕاوێستا
ئەوسا بوو، یۆنانی و ئاشۆر
ناویان نام کوردی خاوەن زۆر

***

بەڵام ڕۆژێک گەردوونی دوون
هەڵی داشتم سەرەو نخوون
وشتری پێ پان پێی لێ نام
زەروە ڕەشکە دمیان تێ نام
خوێنیان مژیم، لە هێز کەوتم
تریاکیان دامێ لێی خەوتم
خستمیانە قەفەسەوە
دیل بووم بەدەست ناکەسەوە
پەردەی ڕەشیان بە سەردا دام

کەس نەیزانی مردم یا مام
بنووس کەوتە دەستی دوژمن
سەگەل شیشانە گیانی من
گوتیان کوڕی جن و دێوی
چەتەی، دزی، سەربزێوی
حەلاڵە نامووس و خوێنت
بۆ ئێمەیە جێگە و شوێنت
لێم حەرام بوو حەلاڵی خۆم
بوومە غەریب لە ماڵی خۆم
سەتان ساڵە هەتا ئەمڕۆ
من ماڵوێران و ڕەنجەڕۆ
سەدجاران دەستاودەست کرام
هەر جار پتر بێ هەست کرام
دیوەخانم بەرباد کرا
تەکیەی لە جێ بنیاد نرا
بژیو و سامانیان بردم
فێری مار گرتنیان کردم

***

چووم لە مزگەوتان بخوێنم
بەڕەی خۆم لە ئاو دەرێنم
پێیان گوتم قەزا و قەدەر
نووسی لە نەگبەت نەچیە دەر
بۆت نووسرا دیل و لەژێر بی
دەبێ شوکرانە بژێر بی

کێ ڕووت بێ و لەبرسان بمرێ
لە دونیا پاداش وەردەگرێ
بەهەشت جێ زەرگی دەروێشە
ئەسپێون کاری لە پێشە
ژینی خۆش و زۆری بەرهەم
ڕات ئەکێشن بۆ جەهەندەم
چوومە مەکتەب خێری گیانم
بەڵکو دەس کەوێ دەرمانم
لەوێش مامۆستا دوژمن بوو
چاوی لە خواردنی من بوو
دەرسەکەم بە خۆی داینابوو
چی بۆم خراپە تێیدا بوو
فێربووم کەس دۆستی کەس نییە
تا خۆپەرست بێ بەس نییە
برا و دراوسێ و هاوماڵت
باب و دایک و مام و خاڵت
گش بە دوقۆشە بفرۆشە
قەت بۆ کۆمەڵ تێ مەکۆشە
ئەگەر بڵێی کوردم پەستی
بەلایە ڕەگەز پەرستی
نۆکەری بێگانە کردن
بەشی کوردە هەتا مردن
ئازادبوونی نیشتمانت
بدە بە دراو بۆ گیرفانت

قـــــــاپـه ئـارەقـــــــێـک لـه نـادی

بـــــه تـــــام تـــــره لــــــه ئـــــازادی

***

مـنـی وا هـەژار و کـــــــــڵـــــــــۆڵ

لەش کـــرمـــۆڵ، بـڕیـو خـــاک و خـــۆڵ

زۆربـەی لـەش و گـــــــــیـــــــــانم ڕزیـو

ئـەوەی زیـنـدووش مـــــــــابـوو تـەزیـو

وا بـــێ دەرەتـــان و دامـــــــــــــــاو

لـەنـاو قـــــەفـــــەس نـەفـــــەس بـڕاو

مـل کـــەچ و چاو ســـیس و ســـەرشـــۆڕ

بێ تـاووتـین، پـێ لـەســـــــەر گـــــــۆڕ

هەودای هومـــێـــــد وەک مـــوو باریک

دەوروبــــەر و بـــــەرچـــــاو تـــاریــــک

لـــەپـڕ گــــــــــوێـم زریـنـگـایـەوە

چـیـــــــــــا و چـۆڵ دەنـگـی دایـەوە

شـــــــــۆڕشی کـــــــوردە و بـارزانـی

هـاتـە هـاواری خـــــــــزمـــــــــانـی

شـــــووڵـی قـــــەفـــــەزی هـەڵبـــــڕی

پـەردەی بـە خـــــــــەنجـــــــــەر دادڕی

دوژمـنـی خـــــــــســــــــتـــــــــە هـەلـوەلا

قـــــــــەزات لـە هـەژاران مـــــــــەلا

چـاکی مـــــــــەردیـت کـــــــــرد بـەلادا

هـەوری نـەگـــــــــبـــــــــەتـت وەلادا

تا دنیا بێ ناوت ماوە
لەمێژوو، بەزێڕ نووسراوە

***

کوڕی کورد کامەی نەڕزابوو
دەماری پیاوەتیی مابوو
کفن بە شان، سەر لەسەر دەست
لە ڕێی سەربەستی ڕیزی بەست
دڵ پڕ و دەست لە سەر خەنجەر
تینوو بە خوێنی داگیرکەر
تۆڵ ئەستێنی هەزار ساڵە
پاڵەوان ڕەنجبەر و پاڵە
ساتێک لەسەر جێ نەسرەوتن
وەشوێن قارەمانیان کەوتن
ژینی کوێلەیی بابەس بێ
حیزبخویی بۆ ناکەس بێ
مردنیان ویست بەسەر بەرزی
دڵ و دەزگای دوژمن لەرزی
زۆڵە کوردی نامووس نەماو
ڕەتێنرا وەک پووشی لافاو
فڕۆکە و تانکی تۆپ لەسەر
بەهرەی نەدا بۆ داگیرکەر
شکا، بەڵام چۆن شکانێ!
هەر خۆی و خودا ئەیزانێ

***

کوژراین، خوێنی دوژمنمان ڕشت
هەوای ئازادیمان هەڵمشت
بای باڵمان داوە لە چیادا
ناوبانگمان کورد لە دنیادا
پەڕ و پۆمان دەر کردەوە
دیلیمان لە بیر بردەوە

***

یاباش هەر لەسەر بیری زووی
ماتە بۆ کەوی لەدەس چووی
قەفەزە شەڕەی هێناوە
جووتێک جاشوولەی تێ ناوە
یەک کۆنە جاشە و ماندووە
لە زەڕە و جووتە کەوتووە
ئیدیش مودێل شێست و شەشە
لە غیرەتی کورد بێ بەشە
لەلای دوژمنی خوێندووە
بەرگی شەرمی داکەندووە
چەند لاویچێک جۆی بۆ بردوون
بە نەقیزەش فێری کردوون
دەلووشێن تا ڕاوم کەن
دووبارە تووشی داوم کەن

***

بەڵام تێ ناگەن بێچارە
ئەمە ئیشتیای بەفری پارە

ئەمڕۆ لەگەڵ دوێنێ جیام
کەو نەماوم، شێری چیام
تازە بۆی ناچمەوە ناو داو
کوردیش دەبێ بێتە بەر چاو
زمان و ئەدەبیاتەکەم
گوڵی هیوا و ئاواتەکەم
پێویستە بگەشێتەوە
ناشێ لە بیر بچێتەوە
دەبێ ئاڵای «خانی» هەڵکەم
دەگەڵ هەورانی تێکەڵ کەم
شیعری «حاجی» دەخوێنمەوە
تۆڵە لە زۆڵ دەسێنمەوە
گۆران و بێکەس یاد ئەکەم
گیانی پیرەمێرد شاد ئەکەم
بەگڕی نەورۆزی ڕزگاریم
دەسووتێ باری هەژاریم
مام یابا خەیاڵت خاوە
چت دەس ناکەوێ لەم ڕاوە
سوێندم بە عابا و عەگاڵت
کورد نابنەوە بە ئاژاڵت
شیریان بدۆشی و پێی بژی
داوای ژیان کەن بیانکوژی

داو و دانـەت خـــــــــــڕ کــــــــــەرەوە

لـەســـــەر وشـــــتـــــر بـیـــــان بـەرەوە

***

شـیـناوی، باڵەکـایەتی ١٦/ ١٠/١٩٦٨- لە ڕۆژی ١٩٦٨/٧/٦ جـاشکی جـەلال تاڵەبانی و برایم ئەحمەد بە چەک و ئەسپابی داگیر کەرانی کوردستـان هاتنە سەر پێشمەرگە و لە دوای شەڕێکی شەش ڕۆژە. پێشمەرگە دوو سەد جاشێکی لێ تۆپاندن، گەلێکیشی لێ بە دیل گرتن و لە کوردستانی ئازادی دەرکردنەوە. بەو هۆیەوە نووسراوە:

## دەمەتەقەی پیرۆت و باپیر

پ: مام باپیر، ئا بێ، دەنگوباس چییە؟

ب: وەخوا، حاڵ جاشگەل فرەخاس نییە

پ: گوایە گەرەکتە بێژی خەراون؟

ب: بەڵێ سەرشکیاو، پاشڵ دڕیاون

هەر لاشی جاشی کرمێ و بۆگەنە

کەفتگە لەو دەشت قەرە حەسەنە

پ: خاسە، خۆ ئێژن حوکمات گۆڕیاوە

چۆن جاش بەر ئەدا بەم لاو بەو لاوە!

ب: پیرۆت بەعسی گەل خۆت ئەیان ناسی

پا درێژ ناکەن هەرگیز وەڕاسی

وتیان حوزەیران جێ وەجێ ئەکەین

لە جۆر بنیادەم ئەمجا ڕێ ئەکەین

شەڕی هەندرێن دەرسی داداوین

خاسی باداوین، مەیژن هەر خاوین

کەچی ئەیدوونین ماڵ هەر ئەو ماڵە

هەر مێشکی پویچە و کەللەی بەتاڵە
وەدەور خۆیانا ئەسوورێنەوە
خەریکن شەڕمان بۆ ئەنێنەوە
جاشگەل شەست و شەش، چی بڵێم؟ دوور لەڕووت
داگیراونەسە و وەساچمە و بارووت
بزووت ئەخەنە بن کلکیانەوە
ئەتەقن وەلای کوردستانەوە
وەحەچچەی بەعسی وەگژمانا تێن
تێناگەن ئێمە ئەیانناسین، کێن!
پ: دەیسا چەیان کرد توخوا مام باپیر
ب: لەناو تەڵەدا سمیان کردی گیر
ویستیان داگیرکەن مەڵبەن «جەباری»
تیایا بگەوزن وەگوێچکە لاری
بەڵام نەقیزەی پێشمەرگەی ئازا
پێ گەیشت، کاریان لە کار ترازا
هەروا جاشک بوو، بۆ دەرئەپەڕی
بەرەو تەویلەی عارەو ئەزەڕی
لوشمەی جەلال و زەڕینی بلە
دەری خست کەوا پاڵوویان شلە
کوردستان خواردن بۆ عارەو ناوێ
با هەزار جاشکیش جووتە بهاوێ
پ بەڵێ مام باپیر، بەعسی زۆر کەرن
وەهیوای جاشگەل زەحمەت دەربەرن

شۆڕش کوردستان دوژمن دڕێنە

مەلەی گەرەکە ئەم گۆمی خوێنە

ئەیشزانیت جاشک مەلە نەزانە

ئاو بگا بە گوێی، بەشی خنکانە

بەعسی و جەلال و بلە و جاش و ماش

وەمانگ ئەحەپن گەماڵ گەل بەلاش

***

شیناوی، باڵەکایەتی١٩٦٨/١٢/٢١- جێژنی ڕەمەزان:

## چۆن جێژنە ئەگرین؟

جـــێـــژنە، ئی وا هەیە دڵی خـــۆشـــە

زۆر کــەســیش لێــو بەبار و ڕەشــپــۆشــە

هەیە دەســـــتی ئەخـــاتە ناو خـــەنەوە

هەیشـــە مـــاتە و دەسی بە ژێر چەنەوە

یەک بەناز پا ئەخـــاتە ســـەر کـــورسی

زۆر دەســــیش وان لەســــەر زگی برسی

یەکێ ســـینی پلاو و گـــۆشـــتی لەپێش

زۆری ئـاواتـە خـــــــــوازە بـۆ بـڕوێـش

یەک ســـمـــیڵ با ئەدا بە دەســـتی چەور

یـەک دەسـی پـۆرگ ئـەدا بـەدەسـکـی تـەور

یـەکێ قـــاقـــایـەتی دەگــــەڵ یـاران

زۆر کــــەســــیــــرەش هەیە لەبەر باران

یـــەک جـــل و بـــەرگـــی تـــازە دروەوە

یەکێ بێ ڕانک و پێچ و پێـــــــڵاوە
یەک لە باوکی ئەســـێنێ جـــێـــژنانە
زۆری بێ باوک و وێڵـی کـــــــــۆڵانـە
یەکێ ســەرگــەرمی بەزمی ڕەشــبــەڵەکـە
یەک لەناو ســەنگەرە و لە پشت کـەڵەکـە
یەک بە شـــــادی لەناو ژن و مـــــاڵە
یــەک لــە دووریــی مــنــاڵ ژیــان تــاڵــە
یەک لە بان ســینە زەردە مــەم دەگــوشێ
یەک بەرەو دوژمنان بەسنگ ئەخـــوشێ
یەک لە شـــــــارا بە بێ ترس ژیاوە
یەکێ پێشـــمــەرگــەیە و بەســەر چیاوە
یەک لە«حــیــزی و ســەلامــەتی» دەگـەڕێ
یەکێ ســەرخــۆش دەبێ بە کــۆڕی شـەڕێ
یەک لە بێ مـــووسی زبرە، یەک لووســـە
هۆی چیـــیـــە! باسی پووڵ و نامـــووســە
یەک دەژی بۆ دراو وەکـــــۆ کـــــردن
یەکێ نامـــووس پەرســـتـــە تا مـــردن
کـــوردســـتـــان ئەو بەهەشـــتی بێ وێنە
نوقــمی ناو خــوێنە، بێ ســەر و شــوێنە
دیل و داگـــیـــرکـــراوی ئەغـــیـــارە
لە هەمـــــــووی دەنـگی داد و هەوارە
چەندی چاوت ئەگـــێـــڕی دار و پەتە

کوردی پێدا دەکەن بە ناوی چەتە

کوێ ئەچی بەند و چاڵ و زیندانە

ماڵی تا ڕۆژی مەرگی کوردانە

چەند هەزاراران منالّی کورد بێ باو

چاو کز و دڵ پەرۆش و سەر شێواو

چاوەڕێی باوک و کاکی گیراون

جێژنەیە، بێ لیباس و بێ دراون

چەند هەزار بێوەژن هەتیوبارە

چاو بە فرمێسک و دڵ بریندارە

***

لاوی پێشمەرگە شارەزای دەردە

بۆیە جێ بەزمی جەژنی بن بەردە

دەیەوێ نیشتمانی ئازاد بێ

کورد هەمووی شاد و دوورە بێدادبێ

چاوی پڕ ئاوی بێوەژن بسڕێ

جلی جوان بۆ هەتیوی کورد بکڕێ

دەرکی زیندانەکان لە ڕێسمە بەرێ

کوردە گیراوەکان بخاتە دەرێ

باب و کوڕ مێرد و ژن بەیەک شاد بن

خەمی ڕۆژانی دیلی بەرباد بن

لاوی پێشمەرگە مەشخەڵە و ئەگری

تاریکایی لەسەر وڵات ئەبری

دڵی شادە بە کاری پیاوانە
لاوی وا ڕۆشنایی چاوانە
ئەو دڵەی کوردستانی تێدایە
خەمی ماڵ و ژیان لەلای بایە

***

کوردی واش هەن دەژین بەبێ خەبەری
چی لەوان دەردی هۆز و خاکە سەری
بت و قیبلەی ئەوان زگ و ورگن
هاری شوێن گۆشتن و ڕەوەی گورگن
جێگەیان یان حەمامە یان سفرە
پیاوەتی و زبری لای ئەوان کفرە
دۆشەکی تووکی قوو نەبێ نانوون
مێردن، ئاواتەخواز بە کەیبانوون
کوردی داخێون و دەڵێن کوردین
ترسەنۆکین، لە خشپە دڵخوردین
کوردی خاوو خلیسک و دەس بەخەنە
کورد نییە زۆڵە کوردی لاپرەسەنە
دایکی مێردی نەبوو ئەوەی هێنا
غەیرە کوردێک بوو، ناوەکەی لێ نا
هەشە دەروێشە، سۆفییە، کوڵکە
ڕیشی ئاڵۆزە، پرچی پڕ چڵکە
مارگرە، ئاگر و خەڵووز خۆرە

تیــخــه، کــەشکۆڵە، زەرگــە، ســاتۆرە،
باری شــێخ و خــەلیــفــە هەڵدەگــرێ
بێ خــەبەر زاوە، بێ خــەبەر دەمــرێ
بـژی یـان بمـرێ هـەر زیـانـبـــاره
دین و دنیــای لەدەس چوو بێــچــاره
***
هەیشــە هەر کــوردە خــاینە و خــەتەرە
هەرکــەسێ بیگرێ گــۆشــتی ســەرچەپەرە
نیــشــتــمــان، دین و ئایین و نامــووس
لای نیــیــه، هەر ئەزانێ بێنە فلووس
قــولە چۆمــاغی دەســتی زۆردارە
دڵی ســەد پارەیە لە ســوێی پارە
جاشە بێ فەرقە بۆی مەجووس و فەلە
کــێــیــه جــاش ئەگــرێ پارە بێنێ حەلە
عــارفــە، بەکــرە، قــاســمــە، عــەفلەق
جــاشی لازم بێ گــوێ لەقــە و سم ڕەق
گــازیی بۆ ئەگــرێ، جــووتە هەڵداوێ
ئــالــیــکــی زۆر بــێ، ئــابــڕووی نــاوێ
ئەوە ژەهری هەیە وەکـــو مـــاره
تا ســەری نەنجنی نیــیــه چاره
***
هێندەکــیش خــوێندەواری ڕەش خــوێن
کــوردی ســەر مــێــز و مــەردی ناو نوێن

کوردی چاکن لە دەوری شووشە عەرەق
فەلسەفەت بۆ دەڵێ و قسەی نەستەق
ئەڵێ من بم وەها دەکەم، واچێ
دوژمنێکم لەدەستی دەرناچێ
پێی بڵێ، فەرموو وا چیا وەرە شەڕ
گورجێ وشکاوی دادێ ئەو دەمی تەڕ
پێت ئەڵێ من! بەکێ ئەڵێی من بێم!
دەشتەکی تۆ، دەبێ نەزانی کێم!
کوڕی پشکەڵ ئەفەندی، بێتە شەڕێ!
تەخت و بەختی زەمانە وەردەگەڕێ!
ئەوە پێویستە لێی گەڕێی، بدوێ
تا بە سەرخۆشی دەچتەوە، دەنوێ

***

جێژنە، خۆزگە دەستی ئەوەندەم با
یان کڵاوێکی سەخرە جندم با
هەرچی بم ویستبا لە هەنبانە
دەربچووبا و ببا بە جێژنانە

***

بۆ مەلا مەنجەڵێک لە گۆشت و پلاو
بۆ فەقێ مێزەرێکی هەڵپێچراو
دەف و زەرگم دەدا بە مام دەروێش
تۆزێ ئیمان بە شێخی خۆ هەڵکێش

ڕیشی سۆفیم دەشووت بە تاید و سیم
سەیری ئاوێنەکا بلێ من نیم
بەشی حاجی درۆی زل و دەس بڕ
بەشی دێوانە! حاو و حوو، مڕە مڕ
شەتی بەغدایەشم ئەکردە شەراب
بۆ بە دەم کوردەکانی عالی جەناب
خەنە بۆ پیاوی دەم بە نووزە و شل
شانە و ئاوێنەیێک و تۆزێ کل
لوڕ و کورتان و کاو جۆ بۆ جاش
پاڵوو بۆ بەرمل و بەڕەش بۆ پاش
شێست و شەش زەنگوڵەم ئەکردن بەش
لەملی جاشەکانی شێست و شەش
بەشی داگیرکەریش گرامێک بیر
تا بزانێ زمان دەسووتێ بە سیر؟
بیری کوردتوانەوە لەسەر دەرکا
ئەقڵی بێ؟ ناشێ چیدی خۆی کەر کا
ڕەمەزانی ئەوەندە بێ ڕۆن بێ
شەشەڵان گرتنی دەبێ چۆن بێ؟

***

سەد هەزار ئافەریم و هەی دەسخۆش
بەجەواڵ و بە هۆڕ بەچەنگ و بە کۆش
بۆ کوڕی کوردی مەردی ناوسەنگەر
لەم سەری کوردستان هەتا ئەو سەر

ڕەمزی ئازادی لاوی پێشمەرگە
خاکی پۆش، لێت مبارەک ئەم بەرگە
تۆی هومێدی گەلە هەژارەکەتی
تۆڵە ئەستێنی گوند و شارەکەتی
چەند هەزاران هەتیوی باو کوژراو
چەند هەتیوباری بێ کەس و داماو
چاوەڕێی مژدەتن کە مزگێنی
جەژنی سەربەستی کوردی بۆ بێنی
سەر بڵند بین و سەربەخۆ کە بژین
جەژنەمانە، نە ئێستەیە کە دژین
گەلی کورد تا ئەسیرە جەژنی نییە
ژینی بێ سەربەخۆیی نرخی چییە!
جێژنی ئازادی جێژنی کوردە و بەس
ڕۆژی کورد سەر نەوی نەکا بۆ کەس
ئەودەمە جەژنی ڕاست و جەژنی خۆش
بۆ هەموو کوردەواری، بۆ من و تۆش
* * *

شیناوی، باڵەکایەتی٢٧/١/١٩٦٩- حەمەدەمین فەرەج کە زۆڵە کوردێکی نیشتمان فرۆش و هاوبیری جەلال تاڵەبانی بوو، کرا بە موتەسەڕیفی هەولێر. شێخ حەمەدەمین ناوێکیش کە لەو زۆڵتر بوو کرا بەقایمقامی هەڵەبجە:

## دەمەتەقەی باپیر و پیرۆت

ب: پیروت زوو، وەرە، مزگێنیم دەیە

پ: چبووە مام باپیر؟

ب: چەند جاشت هەیە؟

پ: بەخوا، هەردوانن یەک دێزە و یەک شین
ب: برۆ جلیان کە
پ: تۆ جاشکت بۆ چین؟
ب: دەیان نێرمە خوار، پیرۆت وە تەمام
جاشولکەت بۆ بکەم بە قایم مەقام
پ: چی چی؟ مام باپیر دووپاتەی کەوە!
ب: چی چیی، پێ ناوێ جاشک بە برەوە
موتەسەڕیفی هەولێر جاشێکە
پشتی بەقەدەر عەنتەرناشێکە
پیرۆت تۆ بۆ خۆت ئاگات لێ نییە
قایمقامەکەی هەڵەبجە چییە!
پ: ڕاست ئەکەی، ئەویش جاشە و شێخیشە
ئاخوڕە، پەتکە، کوتکە، مێخیشە
پێشوو ئەیانوت وەحیلەبازی
کەرێک لە بەغدا خۆی کردە قازی
تو ئێژی ڕاست بێ!
ب: بۆچی درۆیە
ئێستاش هەروایە، ماست برای دۆیە
لەم ئاڵوگۆڕەی دەور و حەیامە
چوار سەر جاش بوونە خاوەن ڕۆژنامە
بەغداد بە پیتە، جاشی کوردستان
لەوێ گۆڕیاون، ئێستە مامۆستان

پ: سا بەخوا باپیر ئەمەی پێ ناوێ
بیری قایمقام لە دڵ دەرباوێ
یاڵ جاشەکانم لووس ئەکەم وەمووس
پێم خۆشە بکرێن بەرۆژنامەنووس
دێزە، ڕەسەنە، سمی وەک گوێزە
حەیفە پێی نەڵێن مامۆستا دێزە
***

شیناوی ١٩٦٩/٣/٢١- بە هۆی نەورۆزی ساڵی ١٩٦٩ لەسەر ئیزگەی شۆڕشی کوردستان خوێندرایەوە:

## کوتکی کاوە

چیــــــرۆکــــــێک لـە نـاومــــــان بـاوە
زەهـاک و دوو مـــــــــــار و کـــــــــاوە
لە پێ دەشـــتـــان، لە کـــوێســـتـــانان
هەمـــــوو شـــــەوگــــاری زســـتـــانان
وا بـوو بـە چـەنـدیـن هـەزار ســــــــــاڵ
لـە دەوری ئـاگـــــــــــردانـی مـــــــــاڵ
نـەخـــــــوازە داپـیـــــــرەکـــــانمـان
دنـیـــــــــادیـدە و ژیـرەکـــــــانمـان
لـەبـەریـان کـــــــــردووە دەمـــــــاودەم
زۆر شـــــیـــــریـن دەڵـێـن ڕۆڵـەکـــــەم
پـاپـەتـیـــــیـــــەک هەبـووە چـۆڵـپـــــەرست
جـــارێـکـیــــان هەلـێـکـی دەس خــــست

ڕێگای کەوتە کوردەواری
لە چیا هەڵیدا دەواری
زۆر لێی خۆش هات هەواری نوێ
قرمی خۆش کرد لێی نەبزوێ
زەوی بە پیت بوو بۆ کێلان
لێمان کەوتە گەندەڵ فێلان
بە دەم ئەیوت براتانم
بۆ ئێوە دیاریی یەزدانم
ئەسپ و حوشتر یەک ڕەگەزن
مارمێلکەش هەر بەچکەی پەزن
ڕەز و پەزتان بدەن بە من
من زۆرخۆرم، ئێوە کەمن
عابای بەسەر شان دادابوو
کەی نەیدەزانی چی تیا بوو
کوردی ساویلکە و کوردی زۆڵ
بۆیان دا لە دەف و دەهۆڵ
یەک نەیدەزانی چ باسە
ئەویان بۆ لستنەوەی کاسە
یەک بە حاووحو، مڕەمڕ
زۆڵەش تا ورگی بکا پڕ
کەوتنە خاک و پای بێگانە
دایان پێی ئەم کوردستانە
زەهاک بە کوێخا دانرا

عابای لە شان وەلا درا
دوو مار لەسەر شانی ڕوابوون
دیاریی چی غەزەبی خوا بوون
مارێک بە ڕیش و پرچەوە
تەزبیح بە ملی چرچەوە
مێشکی لەسەر بەتاڵ دەکرد
پڕی لە درۆ و خەیاڵ دەکرد
مارەکەی تر شینە مار بوو
شاخدار بوو کونی لە شار بوو
شاڕەگ پسێن و خوێن مژ بوو
وەک قەسپی بەغدا کوردکوژ بوو
ئەشیان گوت پێشوو هەردوک مار
ماری شارو ماری ڕیشدار
بنیچە کورد بوون، جادووکار
بە ئەفسوون کردبونی بە مار
***
زەهاک و زۆڵە کوردی مار
شیشانە گیان کوردی هەژار
دەستیان کرد بە تاڵان کردن
گەلێک کورد لە برسان مردن
ئاژەڵیان بڕی لەو ناوە
کاتێ زانیان هیچ نەماوە
هاتنە سەر بیری پیاو خواردن

ڕۆژێ دوانیان لێ دەبژاردن
مێشکیان ئەدرا بە مارەکان
گۆشتیش بەشی خونکارەکان
ئێسک بۆ سەگ و گوڵ و زۆڵ
بەرماوێکیش بۆ پۆست بەکۆڵ
تا بە کورد بڵێ دەنگ مەکەن
دەگەڵ بەشی خوا جەنگ مەکەن
قەزاو قەدەر وای داناوە
لە ناوچاوانتان نووسراوە

***

مام کاوەی باوکی هەژدە کوڕ
ئاسنگەری بە هێز و گوڕ
حەڤدە کوڕیان سەر بڕیبوو
گەڕ لەسەر دوامین کوڕی بوو
ئاگری جەرگ زۆر بە تینە
تۆڵە دەرمانی برینە
بۆ تۆڵە دەستی لە ژیان شوت
دەستی دا کوتکی ئاسن کوت
بەرهەڵبێنەی کردە ئاڵا
زۆر حەشاماتی لێ هاڵا
گوڕاندی وەک هەوری بەهار
ئەی کوردی ژێردەست و هەژار
تاکەی پێخوستی بێگانەی!

تا کەی لەچاوی خۆت تانەی!
تاکەی بیرێک ناکەیتەوە!
تا کەی ئاوڕ نادەیتەوە
تاکەی ئەژی بە سەرشۆڕی
بۆ زەق بەرەو گۆڕ ئەنۆڕی!
بۆچ سەرکزی چارە نووسیت
چی لێ هات کوردە نامووسیت!
با بەس بێ، سەرشۆڕی بەس بێ
ژین بە حیزی بۆ تەرەس بێ
ڕاپەڕە، باسک هەڵماڵە
خۆت باوێژەدەر لەم چاڵە
بەجێ بێڵە پایەی نزمت
سەر بەرزکە خۆت و خزمت
تا سەر، ڕێی ئازادی بگرە
یان زۆر بە سەربەرزی بمرە
مەرگی گەڕناس هەر یەکجارە
مەرگی ترسەنۆک هەزارە
وەرن پیاو بین لە ڕووی مەردن
ببزووین بۆ دوژمن قڕ کردن

***

بە نەعرەتەی مام کاوەی مەرد
لەرزە کەوتە بەردار و بەرد
لاوی کورد لە خەو ڕاپەڕین

وەک شێری ڕق هەستاو خوڕین
کاوە بڕۆ بە شوێنتەوەین
ئەوەی تۆی بە نیازی ئەوەین
هیچمان سەرمان نابەینەوە
تا تۆڵەی کورد ئەکەینەوە
با بشەکێ ئالآی چەرمت
با تیندار بێ دڵی گەرمت
شان بەشان کوڕ و باب و کاک
گوڕیان بەست بۆ کۆشکی زەهاک
بۆ کوێ دەچی، کورد خۆرەکە!
کوردە زۆڵە چوار مۆرەکە!
ڕۆژ ڕۆژی نێرە پیاوانە
مردن بۆ خاوەن تاوانە
***
بوو بە شەڕ، شەڕی بەرانان
گەرمە کۆڕی پاڵەوانان
بروسکەی شێر، بارانی تیر
گرمە و گوڕینی لاو و پیر
ئەتاوێن زۆری زۆردار
وەک بەفری بەر هەوری ئازار
ئێسک و ڕەگ و گۆشت لێک درا
کۆشکی زوڵمی پێ تێک درا
دیوار ڕمان، دەرگا شکان

خوێن و ئاسن پێک دا لکان
لاش کەوتن لەدوژمن و دۆست
لەسەر ڕێگە ئەبوونە کۆست
کاوە ئەیگوت: گوڕ ببەستن
ناشێ لە خەبات بوەستن
لینگ بەسەر لاشدا هەڵێنن
سەر بە دوژمن بنەوێنن
هێند لە گۆشتی خوێنتاڵ دران
خەنجەریان مشت و ماڵ کران
شەستە ڕەهێڵەی سەر و خوێن
زۆرداری دەرپەڕاند لە نوێن
وەک بەرازی دەورەدراو
بێ هەل و دەرەتان نەماو
ڕەنگ بزڕکاو و دەم بە جوێن
ئەیزیڕاند چڵکاوخۆر لە کوێن!
جاشی کۆن و نوێ بمگەنێ
بۆ جێتان هێشتووم بە تەنێ!
کوا نزاگۆی درۆفرۆش
کوان گیرفان بڕی ڕۆژی خۆش!
زۆریم لەگەڵ کرد بۆ ئێوە
نەمزانی ئەم دەردەی پێوە
بۆچ نایەن بەهاوارمەوە!
لەکوێدا خۆم بشارمەوە!

***

بەدەوری خۆیدا ئەخولاوە
تووشی بوو بە تووشی کاوە!
وتی دەرمانت لای منە
تۆ ژیانت لە خۆت دوژمنە
ئەو کەسەی خۆی بە تۆ فرۆت
تۆشی فرۆت، تەنیا بۆ خۆت
تاوان بۆ گەل دەژمێریەوە
چت لێ ساند پێی دەسپێریەوە
گریان و شین دادت نادا
هەی ڕووڕەش لە قاپی خوادا

***

کوتک هارەی دەهات ئۆخەی
سەری دوژمن سندانە دەی
بە کوتکێک ورد و خاشی کرد
بانگاوازی کرد دوژمن مرد
کورد ڕزگاربوو لە بێگانە
کوردستان ماڵی خۆمانە
هەرچی کیژی کورد و کوڕە
هەرچی دڵ لە دوژمن پڕە
با بیکا بە بەزم و خۆشی
ئازادی خەمی داپۆشی
کورد کە ڕزگارە و دوژمن مرد
ڕۆژێکی نوێ دەستی پێ کرد

بـا نـاوی جــــــــــــەژنـی نـەورۆز بـێ
جــــەژنـه لـه خـــــۆمــــان پیـــــرۆز بێ
لاشــــــــەی دوژمـن وەکـــــــــۆکـــــــرا
ئــاگـــــــــــــــرێـکـی تـێ بـــەردرا
لــه بــەر گـــــــــــــــڕی لاکـی دوژمــن
بـوو بـه هەڵـپـــــەڕکـــێی پیــــاو و ژن
لـــەو ڕۆژەوه کـــــــــــــــــوردەواری
بـۆ بـیـــــــــــری ڕۆژی ڕزگـــــــــاری
هـەر ئـەبـێ هـەڵـکـا ئـاگــــــــــــــرێ
گـــــــــــڕی تـۆڵـه دانـامــــــــــــرێ
تـا ئـێـــــــره چیـــــــرۆکی کـــــــۆنـه
با بـزانین ئـێـــــســـــتـــــامـــــان چـۆنـه!

***

## کاوه: بارزانی

دەردی پـێــــــشـــــــوو تـووش بـووینـەوه
وەک پێـــشـــــووش تـێ هەڵچــــووینەوه
زەهــاک نــەوەی ئــەو زەهــاکــــــــــــــه
داگـــــیــــرکـــــەری ئـاوو خــــاکــــه
زۆڵـه کــــــورد خـــــۆی پـێ دەفــــرۆشـن
به خـــوێنی گـــەلیــــان ســـەرخـــۆشن
هەر کــــوردن لێـــمــــان بـوون به مــــار
له گـــوند و شــــار وەک شـــێت و هار
دەگــــــــــەڕێـن بـۆ کـــــــــوردی هـەژار

بیکەن بە خۆراکی زۆردار
گەلێک ساوا و پیر و لاومان
خوران، دەرخران لەناومان
لە زۆر حەڤدان تێپەڕیوە
کورد کەم ئازاری وای دیوە!
بەڵام خۆ لەگەڵ ئەوەشدا
لەم شەوەزەنگە ڕەشەشدا
زۆر سوپاس کاوەشمان هەیە
تیشکی ڕۆژی گەشمان هەیە
سەد وەک کاوە لەمێژوودا
لە زوودا و لە ڕابردوودا
لە ڕاست بارزانی بێ ناوە
کەس وا ئازا نەڕسکاوە
لاوی کوردیش بە هەزاران
سڵ ناکەن لەسەرماو باران
پێشمەرگەن و دەس بە خەنجەر
گوێ بەفەرمان لەناو سەنگەر
بۆ تۆڵە ساندن ئامادەن
لە شەڕ سەرخۆشی بێ بادەن
خوێن ئەبەخشن بۆ ڕزگاری
بۆ سەربەستیی کوردەواری
دەیسا کاوەی کورد چی ماوە؟
ئازادمان بکە لەو داوە
دڵخۆش کە ئەو دڵمەندانە

کـــــوا کـــــوتکت! دوژمـن سـندانـه
بـاجـــــاشـگـر ئـاوێـتــــــەی گـڵ بـن
بـا جـــــاشـک لـه تـرســــــان سـڵ بـن
کــــوردســـتـــانەکـــەت ڕزگــــار کـــه
دەردی دڵــی گــــــەلـت چـار کـــــــه
بـا خــــۆ لـه خـــــەم جـــــوێ کــــەیـنەوە
نـەورۆزی کــــــۆن نـوێ کـــــــەیـنـەوە

***

شیناوێ ۱۹٦۹/۳/۲۳- جەلال تاڵەبانی و جاشەکانی گوتبوویان ئێمەش کوردین! لە باوەشی داگیرکەرانی کوردستاندا جەژنی نەورۆز ئەکەین! بەو هۆیەوە نووسراو لە ئێزگەی شۆڕشەوە بەدەنگی هەژار و دڵشاد مەسرەف خوێنرایەوە:

## دەمەتەقەی پیرۆت و باپیر

پ: مام باپیر ڕۆژباش
ب: ئەی سەر چاوانم
پ: خاسی؟ بێ خەمی؟
ب: دەردت لە گیانم
پ: وا هاتوومە لات، هەمە پرسیارێ
ب: فەرموو مام پیرۆت، سەدجار نە جارێ
پ: خەڵک لەو خوارە هاتوون ئێژن
جاشگەلیش نەورۆز ئەیکەین بە جێژن
ئەمە یانی چی؟ سەرم سوڕماوە
ب: پیرۆت گیان، تا کەی خەیاڵت خاوە!
جەژن گرتنی ئێمە جیایە
جاش سەماکەری لەوەڕ و گیایە

تێ ئەگەی چم وت؟
پ:  نە بەخوا، کاکە
بۆمی بلێوە و بۆم یەکالا کە
ب: مام پیرۆت زۆر زوو ساڵێک لەسالان
هێندێک پەت وەسەر هاتن بۆ تالان
زەهاک ناوێکیان سەردەستەی خێڵ بوو
دڵڕەش و پیس و خوار و بە فێڵ بوو
ئەیان وت شیمال وەکوردەواری
جاش کوردیان ئەگرت بۆ بار و سواری
کوردیان دەرئەکرد لە ماڵ و مەزرا
ڕەشی چۆڵپەرست لێ دائەمەزرا
ئەیانگوت نابێ کوردێک بمێنێ
کوردستانیان کرد بە گۆمی خوێنێ
ژن داگیر کردن مناڵ سووتاندن
تەبەک ڕفاندن، ئاژەڵ فەوتاندن
هەرچیان لەدەست هات درێغیان نەکرد
بە هەزاران کورد لە زیندانا مرد
پ: باپیر کەس نەبوو دەمیان بشکێنێ!
بۆ کوردی هەژار تۆڵە بستێنێ!
ب: بەخوا بێ سەبری، زۆر هەڵەی پیرۆت
بۆ ڕاناوێستی، تەواوی کەم بۆت
پ: وا ڕاوێستاوم، دە باپیر فەرموو
ب: خوا بۆ کوردی نارد یەکی ڕیش چەرموو

ناوی کاوە بوو، وەستا خاڵە بوو
پاڵە بوو، تەمەن حەفتا ساڵە بوو
کوتکێ گرانی نایە سەر شانی
بوو بە شۆڕشگێڕ لە کوردستانی
کوڕگەل دایە دوو، دەس لە بان خەنجەر
دوژمنیان شکاند لەم سەر تا ئەو سەر
کوردستان ببووە گۆڕ بۆ دوژمنی
کاوە بە کوتکێ زەهاکی جنی
پ: ئای دەسخۆش کاوە قوربانی کوڕم
خوێشم لە کوێ بووم، ورگی بدڕم!
ب: پیرۆت گوێ بگرە
پ: دڵم لە لاتە
ب: کاتێ دامریا، ئەم کارەساتە
سەرەتای مانگی خاکەلێوە بوو
موژدەی ئازادیی کوردی پێوە بوو
ئیتر لەوساوە لە کوردەواری
جەژنە بۆ یادی ڕۆژی ڕزگاری
پ: هەر بژی باپیر، زۆرزانی بەخوا
دەیسا پێم بێژە جاشک چ دەخوا؟
نەورۆز وا جێژنی شۆڕشگێڕییە
چ دەخڵی وەسەر جاشکی خوێڕییە؟
ب: ها، وتمان فەسڵ فەسڵی بەهار بوو
نزیک نیسان و دواییی ئازار بوو

فەسڵی بەهاریش لە هەموو جێیە
موژدەی لەوەڕی بۆ جاشگەل پێیە
پرزەی ئاخوڕ و کای زەرد نامێنێ
زەوی لە گش لا قەرسیل دەڕوێنێ
مەسەلێک هەیە دەڵێن: تۆ بێژە
پ: بەهار بەهەشتی نێرە گوێرێژە
ب: بەڵێ بۆ جاشگەل جەژنی لەوەڕە
کلک با ئەدەن لەناو سێوەڕە
تێر ئەزەڕێنن وەزمان داگیرکەر
بۆ دوژمنی کورد ئەبنە بارەبەر
پ: ئەرێ مام باپیر، جاش بۆ وا کەرە؟
ب: ئەم پرسە بۆ جاش شێست و شەش بەرە
یان لە مامۆستا عەونی پرسیارکە
بێژە بۆ جوابم تۆزێک گوێ لارکە
تا بڵێ جەنابت «مقیاس نەماوە»
جاشەتی کردن لە ڕێی دراوە
وەتەن و نامووس لای جاش پارەیە
چیتر نازانێ ئەو بێچارەیە
پ: بەخوا، ڕاست ئێژی، جاش بەسەزمانن
دەستەی خۆفرۆش ڕوو لە نەمانن
خوا ڕوویان ڕەش کا وەک ڕوویان ڕەشە
کورد ئەوانەی هەن بۆیە بێ بەشە
ب: پیرۆت خەم مەخۆ، هیچ باکت نەبێ

له هەموو چەمێک چەقەڵ هەر ئەبێ
پێشمەرگە خۆش بێ، شۆڕش بە هێزە
کاری لێ ناکا، زەڕینی دێزە
پ: خۆیشم مام باپیر خەنجەرێ ئەکڕم
تووشی جاشک بم کلک و گوێی ئەبڕم

***

شیناوی، باڵەکایەتی٢/٤/١٩٦٩:

## بەزمی بەهار

مـــــزگـــێنی دا بە ســــروە بـای بەهاری
وا هـاتـەوە نـەورۆزی کــــــــــــوردەواری
بە تیـــشکە تێک شکا ســـوپای کـــڕێوە
هەواری ڕۆژ گـــەیشـــتـــە خـــاکــەلێـــوە
فـــەرمـــان درا بە ســـەوزە ســـەر هەڵێنێ
چیـــدی لە بەندی خـــاکی ڕەش نەمـــێنێ
با دەرکـــەون، کـــوڵ و کـــەســـەر بنێـــژن
با ڕۆژی ڕزگـــــاری بکەن بە جـــــێـــــژن
شـــەمـــاڵ، گـــەواڵ گـــەواڵ هەور بنێـــرێ
ئاهەنگ و بەزمی جـەژنی پێ بســـپـــێـــرێ

***

حـــــیلکانەوە لەو مـــــوژدە ئاودڕ و خـــــڕ
ڕەش بوونەوە، ڕیشی ســـــپی چیـــای چڕ
چڵـــوو گـــەشـــایەوە و بزەی لەســـەر لێـــو

پۆتراکی خـــۆی ڕازاندەوە بە گـــۆی زێو
هەور لە دەشت و شـیـو و پۆپە شـاخـان
کــــردی بە تۆپ تەقـــاندن و چراخـــان
مـــــــــراری بێ ژمـــــــاری دادەبـاراند
لـــە دار و دەر ڕووتـــی و نـــەداری تـاراند
شـــەمـــاڵە، گـــاڵەگـــاڵیـــەتی و لە کـارە
هەڵـگرنـەو: شـــــاباشی شـــــای بەهارە
شـــینکە بە گـــەل، لە گڵ ســـەری دەرێنا
هەر یەکـــە چەند قل و پەلێ بە شـــوێنا
خـــــــــڕی بـەرۆک پـڕن لـە دەنـکـە باران
تـازە و تـەڕن بـۆ کـــــــۆڕ و بـەزمـی یاران
نەورۆزە مـــــشـــــتی پڕ گـــەڵای تەڵایە
هەر کــارگـــە بێ بەڵا بێ، بێ گـــەڵایە
ئەگـــــەر چی ســـــاوایە بەهار و باشـــە
لە چاوی بەد بەدوور بێ گـــیـــا هەراشـــە
بە یەک یەکـــە و بەکـــۆ لەدەشت و دەردا
وەک کـیـژە کـورد هەمـووی گـوڵی لەسـەردا
شــــالوور و بولبـــول ســـەرەڕۆی ئەوینن
هەر چاوەچاویانە گــــــوڵان ببـــــــینن
هەر مـــەلە بۆ گـــوڵی دڵی ئەخـــوێنێ
هەر گـــوڵە بۆ دڵداری خـــۆی ئەنوێنێ
نەرگـــــسی مـــــەست لە زەردەزیرە زیزە
بە جـــوانی خـــۆی دەنازێ، زۆر بە فـــیـــزە

وەنەوشە مل کەچە لە حاند پەپوولە
ڕێی داوە بێ وتەی مەلا و پسوولە
وا کیژ و لاویش دەچنە دەر لەدێوە
لە ڕێوە تێک دەگەن ژوانگە کێوە
گۆرمەزە، مام ڕێواس و هەندرێشن
بۆ دڵتەڕان بەهانەن و لە جێشن
گۆوەند لە کەوشە، دوور لە وشکە سۆفین
دەرفەتە مەم گوشین و هەڵگلۆفین
شادن بە یەک مەل و گوڵ و دڵ و دڵ
بەیەک ئەگەن لە بن دەوەن، لەسەرچڵ

***

هەر من لە دووری تۆ: هەژار و داماو
دەڕوانمە ڕێگەکەت بەچاوی پڕئاو
بەشم هەتا لەشم لە تۆوە دوورە
هەنیسک و هەڵمژینی ئەشکی سوورە
خشڵی گوڵان، بەژن نەمامی چاوکاڵ
وەرە دەرم خە لەو ژیانی وا تاڵ
من بولبولم لە نالەدا بەزاندن
گەرم و گوڕی دڵم دڵی تەزاندن
بمگەیە، خۆبنوێنە، دڵ بستێنە
بازاڕی گەرمی نازی گوڵ بشکێنە

***

شیناوێ، باڵەکایەتی ١٩٦٩/٦/٧:

## دوژمنی نەزان

لە بیـــرمـــە لەم کـــوردســـتـــانە
لەم کـــوێســـتـــان و دارســـتـــانە
خـــێـــوی دیوەخـــانان مـــابوون
دوور لە ئێـــســـتـــا کـــەیخـــودا بوون
بۆ دڵخـــۆش بوونی مـــیـــوانان
دەگـــەڕان بۆ چیـــرۆک زانان
سـەر گـوروشـتـەی نیـوە شـەوان
بەهانە بوون بۆ بێ خـــەوان
ئێـــســـتـــا کـــە دیوان نەمـــاون
ســـووری و ڕەشی دەوری داون
زۆربەی کـــورد بێـــهـــۆش کـــەوتووە
لەناو گـــوێی گـــادا خـــەوتووە
تاو ســـوتاندی و ناتلێـــتـــەوە
مـــەگین بەخـــەو بوخلێـــتـــەوە!
جـــا، چونکە دنیـــا گـــۆڕاوە
ســـەرمـــایەی تەمـــەڵ دۆڕاوە
خـــەوتوو دەبێ بێـــدار کـــرێ
خـــۆی بناسێ و وەکـــار خـــرێ
بۆ کـــوردی لە خـــەو خـــەوی گـــێـــژ
بۆ خـــۆم دەبم بە چیـــرۆک بێـــژ

سەر گوزەشتەی من و عەرەو
بۆ ڕاپەڕینە نەک بۆ خەو!
با گوێم لێ بگرن، گوێ دێران
بتەکنەوە لە خۆ بوێران

***

## چیرۆک

یەکێ هەبوو، یەکێ نەبوو
زەوی دەگەڕا بێ پشوو
ڕۆژگارێکیان لە ڕۆژگاران
بەساڵ گەیوەتە هەزاران
زەردەشتی بووم، ئاگرپەرست
گوێم لە ئاوێستا هەڵ دەخست
وتاری موبیدم ئەبیست
ئاهۆرەمزدام خۆش دەویست
ئەهریمەنم لا دزێو بوو
پێم بەدفەڕ و سەربزێو بوو
لەشەڕو شۆڕ خۆم دەپاراست
دەژیام بەگاڵ و کەشک و ماست
چرای شەو ڕون گەرچەکی خۆم
پێلاوی پێم کالاشی دۆم
چانگ و بووزووم دەبەر دەکرد
بێ وەی ژینم بەسەر دەبرد
بێ ئاگا شەوێک نیوە شەو

بوو بەزیڕژن و بە هەوهەو
وشترسوار بە ناوگوند وەربوون
کراس شۆڕ و بەن بە سەربوون
بە زمانێکی دژوار و ڕەق
دەیان درکاند قسەی نەستەق
ئەڵلا بەرزە و یەزدان نەوی
تەمی زەند و پازەند ڕەوی
قەڵماسک و ڕم وتیر و شیر
وەک یەک ئەیپێکا لاو و پیر
کێ دەستی دانەنواند کوشتیان
خوێنی کێ گەرم بوو ڕشتیان
تیخیان لەخوێنمان شەڵاڵ بوو
خوێنی مەجووسان حەڵاڵ بوو
هاتنە سەر ژن و منداڵان
ئەویش بەشێک بوون لە تاڵان
چ کرا، کردیان و بردیانن
کەنیز و کۆیلەی خۆیانن
لاوی کورد، پاڵەوانی کار
فرۆشیار دەیدا بەکڕیار
لاوی کورد پاک و ڕووئاڵ
سەودای پێ دەکرا بە کووتاڵ
پێتی ئاگر کەوتە ژێر ئاو
ئاورگەکەم بوو بە میعراو
کرام بە ئیسلامی دین پاک

عارەو لێم بوون بەباب و کاک
موبید لە موغییەتی کەوت
کرا بە مەلای مزگەوت
ڕۆژووم گرت و فێرە نوێژ بووم
خرامە ئاو، بێ کڕێژ بووم
لاشەی باوکم سەنگباران کرد
تفم لە کاری جاران کرد
ئەوی خۆم کوشتم لە وانە
جێگەی نیازانە و چل دانە
وتم ئۆخەی حەسامەوە
خەم لاناکا بەلامەوە

***

لەو ساوە کۆیلەم بۆ کاکم
زۆر گوێ لە مست و چالاکم
هەرچی پێی ئەسپاردم کردم
بۆ ئەو ژیام، بۆ ئەو مردم
پیتاکی خۆم بۆ وەکۆکرد
بۆ شەڕان لەشکرم بۆ کرد
میسر و شامم بۆ ڕزگار کرد
خاچ پەرستم تار و مار کرد
بە زمانە شیرینەکەی ئەو
زەمزەمەم هات بە ڕۆژ و شەو
بە عارەبیم نووسی و خوێندم
هەر بەسەری ئەو بوو سوێندم

زۆر ئامـــــــێـــــــدی و شـــــــارەزووری
بـە نـۆکـــــــــــــەری هـات و بـــووری
فـــــێـــــربـووم پشـــــتی خـــــۆم دانەوێ
عــــارەب پێی لـێ نێ و ســــەر کـــەوێ

***

گـــــــــــــەلانـی دیـش وەک مـن هـاتـن
ســـــــــەرێـک مـــــــانـەوە و هەڵاتـن
بـوونـە خـــــــــاوەن مـــــــاڵ و ئـاڵا
هەر خـــــــۆم مـــــــامـــــــەوە لـە چاڵا
هـیـچ کــــــەس وەک خــــــۆمی دەر نەبـرد
کــــــەس وەک منـی بـەســـــــەر نـەبـرد
نـۆکـــــەریم کـــــرد بێ مــــووچە و نـان
کـــــــــــــرام بـە دارهـەنـەی تـەونـان
کــــەرکـــیت بووم کـــریان پێ کـــوتام
بـەشی مـن هـەر هێـنـدە بـوو ســـــــوام
گـــــوتم قــــەیناکـــــا ئیـــســــــلامین
هەردوک لـکی یـەک نـەمــــــــــامین
خــــــوا وای نـووســـــــیــــــوە لـە چارەم
مـن پیــــــاوی ئـەو ئاغــــــا ســــــوارەم
ڕازیم بـــــە بــــەشـــــی بـــێ بـــەشـــی
دەســـــــــــــازێم بـە چـارە ڕەشـی
بـۆ ئـەو هـەرچـێـکی مـــــــەبەســــــە
زەرگ و ڕیـش و پـرچـم بـەســـــــــــە

***

جا وەرنە سەیرم خزمینە
چۆن گەڕا ئەم چەرخە شینە!
لە پاش هەزار ساڵ هاتوو چوو
چوومەوە سەر دەقی پێشوو
من هیچ نەگۆڕام، هەر وا مام
شانازی دەکەم بە ئیسلام
کاکم پەشیمان بۆتەوە!
دیسان لێم تێ هەڵچۆتەوە
لە ئیسلامەتی لای داوە
ئاوڕ ناداتەوە دواوە
کۆمۆنیستیشە و نازیشە
ورچی سپیە و بەرازیشە
هەرچیم بۆ کرد، بە هیچ ڕۆیی
لێم دەڕوانێ بە نامۆیی
نە پیاوەتی هەیە و نە خوا
جوو ئەو دەخوا، ئەو من دەخوا
هەر دەم پەڵپێکم پێ دەگرێ
کاری وام پێ دەکا نەکرێ
عەفلەق لای ئەو پێغەمبەرە
پێم دەڵێ سوژدەی بۆ بەرە
گەر نانیشت لە سەر سێڵە
نیشتمانت بە جێ بێڵە
ناوت ئەگۆڕم لەمەو پاش
کورد نابی و لای خۆم دەبیە جاش

ئەگینا پێت دەڵێم تۆ جووی
هەردوژمنمی و هەردوژمن بووی
***
لەشکری لێ کردووم دیسان
لەشکری دەست و دڵ پیسان
وشتری ئەمڕۆی فڕۆکە
قۆچەقانی نارنجۆکە
تیرەکە بۆتە ناپاڵم
دەیهاوێتە سەر منداڵم
ڕمبی ئێستای لوولە تۆپە
دەم پێکێ لە ڕاستە و چۆپە
بە تێزاب گوندم قڕ دەکرێ
ساوای بێ تاوان گڕ دەگرێ
کوردی خۆ فرۆشیان هەیە
جاشی زۆر لەجۆشیان هەیە
بۆ شەڕ دەستیان لەپشت ئەدەن
هەر خۆم بە خۆم کوشت ئەدەن
بەلام
بەلام ئەگەر ئەو گۆڕاون
لە پیاوەتی هەڵچۆڕاون
گەڕی جیهانیشمان گۆڕا
مام نازی لە بازی دۆڕا
شێر بوون بەپەندی پساتێ
تازە تاژیەگەڕ ناگاتێ

دەوری گەل خواردن بەسەرچوو
چیان دەوێ لەدەستیان دەرچوو
نەما ئیتر دەستم ببڕن
دەستی خوێناویم پێ بڕن
چاکیان کرد گەمارۆیان دام
وەک هەبوون خۆیان نیشان دام
ئەگینا هەزار سالّی دیش
فریو دەدرام بە پرچ و ڕیش

### گەنجینە

ئافەریم یابا بۆ کارت
بۆ خۆت و جاشی گوێ لارت
مێژووت بۆ تازە کردمەوە
هاومالّیت لە بیر بردمەوە
دوژمنی کەر گەنجینەیە
ڕووی ڕەشی تۆ بێ پینەیە
کەوتە روو دیوی ئاوەژووت
کەلّپت دەرکەوتوون گورگە ڕووت
بۆ خۆت جادووی خۆت بەتالّ کرد
بۆ خۆت خۆت وێرانەمالّ کرد
دەستت لەنوشتە و فوو بەردا
خەلّتەت لە مێشکی من دەردا
زۆر بەجێ گورزی خۆت وەشاند
برایەتییەکەت هەلّوەشاند
لە پەیمان رزگارت کردم

لە زۆر دەردان چارت کردم
چیدی بە فێڵ نەت تاساندم
خۆت و خۆشمت پێ ناساندم
بەو گرمەی کە بۆمبات باراند
خەوی هەزارساڵمت تاراند
بە زۆر چاوت پێ کردمەوە
تۆ دۆڕاندت، من بردمەوە

نۆرەمە

سا ، خۆت بگرە بۆ تۆڵەی کورد
بەژانە مستەکۆڵەی کورد
خەنجەرم چاوەڕێی تۆیە
بۆ خوێنی پیس تامەزرۆیە
وەرە بەو خەیاڵە کاڵەت
لە شوێن خەونی هەزار ساڵەت
تا تێ گەی ئەوی دیت هەو نیم
شاهێنی چیام و کەو نیم
بیردانی مێشکت ڕزیوە
خەونی بەراوەژووت دیوە
کوردم و ئازادی خوازم
بە کوردستانم دەنازم
لە سەر چەوێک و لوێچێک خۆڵ
دەدڕم ورگی زۆر کەری زۆڵ
بەهومێدی کوردستانم
بەیاریی کورد پەرستانم

تـالاوت بــەدەمـــــــــدا دەکــــــــەم
کــــــارمت دەگــــــەڵ یەک لا دەکـــــەم
لە کــــــوردســـــتـــــان نەمـــــا کــــارت
تـف لـە حــــــــوشـــــــتـــــــر و دیـدارت
لـە پـشـــــــــتـت دەبەســـــــــتم هـێـلـکە
دەچیــــە لای کـــــوللە و مـــــارمــــێلکە
دەبـێ وات بـوکـــــــــــتـم بـە هـێـــــــــڕی
هەر کــــــەونە خــــەونـان وەگـــــێـــــڕی
هـەربـڵـێ ڕۆژێـک دەســــــبــــــــــڕ بـوویـن
بـەدیمـەن جـــــــوان و بـن شــــــــڕ بـوویـن
پـەل بی و لـە دووی جـــــاشـکان هـەڵێی
وەیـلـی و یـالـەیـلـیــــــــان بـۆ بـڵـــــــێـی
***

شیناوێ، باڵەکایەتی، ۱۹٦۹/٦/۹- برایم ئەحمەدی محامی کە فەیلەسووف و مامۆستای کوردە خۆفرۆشەکان بوو، لە بێگانەپەرستی و نیشتمان فرۆشیدا ڕووی هەموو نامووس فرۆشێکی سپی کردەوە، لە ڕۆژنامە و کۆوارەکانی «نەوەر» و «ڕزگاری لە ناموس»دا هێرشی دەکردە سەر هەموو کوردێکی کوردستان پەرست و وەک تووله بە کونی خۆی ئەوەڕی. لە ژێر ناوی «مامەپیرە»دا گەمارۆی «هەژار»ی دا و بە تیزەوە پێی گوت "شایەر و موهەرریجی بارزانی" و گوتی"هەژار کۆنە پەرستە و جوێن بەداگیرکەرانی کوردستان ئەدا و تورک و فارس و عەرەب بە برای هاوپشت و دڵسۆزی کورد نازانێ و کارێکی وا دەکا"کوردەکان ئەو برایانەیان ناخۆش بوێ! ئەمەش خزمەتە بە ئیستیعمار و کۆمپەرادۆر و زیانە بۆ گیرفانی زۆڵە کوردە نەجیبەکان". لە وەرامی نووسراوە بەنرخەکانی مامۆستادا ئەمە نووسراوە:

## دەمەتەقەی باپیر و پیرۆت

ب: پیرۆت، ئا وەرە

پ: ئێ، چی ڕووی داوە؟

ب: لە کاری دنیا سەرم سوڕماوە!

پ: خێرە؟ چی بووە؟
ب: کۆستت نەکەوێ
مامۆستا جاش بێت، ئیتر چت دەوێ؟
پ: کامە مامۆستا؟
ب: کابرا پیرەکە
ئەوەی تۆ ئەت وت پیاوێ زیرەکە
پ: زانیم کێ ئێژی «بلەی ئەحەڕەش»
پیرە پێشەنگی جاشی شێست و شەش
ب: بەڵێ بۆزی پیر ڕێی لێ گۆڕاوە
لەسۆنگەی دراو ئابڕووی دۆڕاوە
لە ژێر عەماشا جاشی گوێ لەقە
باوکی عوڕووبە و فەرخی عەفلەقە
پ: کە وابێ باپیر، ئەو پیرە مامە
جوێن بە کورد ئەدا لە ناو ڕۆژنامە
مامۆستا قادری چەم ڕێزانەکەس
کۆنە کوردەکەی قانوون زانەکەس
ب: عامفەرم پیرۆت، زانیت خۆیەسی
ڕێوی بۆ سیرمە مڵ و مۆبەسی
ئەو ساختەچییەکەی ئەمانگوت کوردە
پشتی لە ڕێباز عارەبا بردە
ئێژێ عارەبی کۆڵوانە سوورم
دۆستی عارەو بوو خوشکەکەی پوورم
ئێژێ: کوردستان ناشێ بۆ کورد بێ
با لەژێر چەکمەی بێگانە ورد بێ

ئێژێ: کێ کورد بێ ڕەگەز پەرستە
کوردستان پەرست نازی و فاشستە
ئێژێ: داگیرکەر برای خۆمانن
کورد بۆ مردن و ئەوان بۆ مانن
پ: پیری ئاخرشەڕ دەک خوا ڕووی ڕەش کا
چۆن توانی، وا خۆی بەسەد جێ بەشکا
هەر ڕۆژ بە گەزێ، هەر شەو بە سەنگێ
هەر سات لە بارێ، هەر کات لە ڕەنگێ
ڕۆژێک لە «ژێ، کاف» دەبوو بە ئەندام
جارێک لە شۆڕش ئەیوت خۆم کوێخام
هەڵی کرد ئاڵای دژی کۆمۆنیست
شووتی و تەماتەش سوور با نەی دەویست
لە هەمەداندا قایش فرۆش بوو
دەمێک لە تاران لە حەیش و نۆش بوو
هاتەوە بەغدا بە داوێن پاکی
هاوماڵی بەعسە بە ئیشتراکی
پاڵو هەڵماڵاو، منەی جۆ دەکا
عارەو سواریەتی و قەوچەی بۆ ئەکا
ب: بەڵێ پیرۆت گیان مامۆستا بلە
جێ پاڵوی شلە و زۆر جاشێ زلە
سووری دووگرە و هێلکەی بەرازە
لە ژێر تارای سوور، عوڕووبە بازە
پ: کەواتە بێژە وەک مەیموون وایە
وە زوڕنای لۆتی دێتە سەمایە

ب: بەڵێ مامۆستا جاشکی مەیدانە
ڕووگە و هومێدی ئاخوڕ و خانە
ئیتر ئالیکدەر بەکرە، موشیرە
بێژن ماست ڕەشە، ئێژێ وەک قیرە
شەڕی کورد بکەن، ئێژێ کوردکوژم
وشتری شاندەن ئەڵێ شیر مژم
نامەرد لە شەرم و نامووس بێ بەشە
سووری کەن سوورە و ڕەشی کەن ڕەشە
پ: ئەی سندانی بێ، نرخی شەرەفی
خاین هەتا سەر دەنگ نادا دەفی
بازی وەڕیشی بابای خۆی ئەکا
سەلا لەو کەسەش خاین بۆی ئەکا
ب: جا ئێستا تۆ بڵێ کاک بلە چییە!
پ: پیرەکەرێکە و لە ژێر بەعسییە

***

ناوپردان، ٥/ ١٠/١٩٦٩- لەشەڕەکانی ساڵی ١٩٦٩دا جاشکەکانی برایم ئەحمەد و جەلال تاڵەبانی گوندی کوردانیان بۆ فڕۆکەی دوژمن دەست نیشان دەکرد کە بۆمبارانی کەن، حکومەت بەجفرە بەفڕۆکەوانەکانی خۆی دەگوت: برای بەهیمەت (الاخ الشهم) عومەر دەبابە و پاڵەوان (البطل) عەلی عەسکەری هەر گوندێکی کوردستانیان بۆ دیاری کردن بۆمبارانی بکەن و لەناوی بەرن:

## دەمەتەقەی پیرۆت و باپیر

پ: باپیر لە کوێ بووی؟
ب: بەخوا، لەو دەشتە
پ: خۆشە ئەو دەشتە، وێنەی بەهەشتە
ب: بەڵام ئێستاکە وەک جەهەننەمە

کوشت و کوشتاره و هێمناییی کەمە
ژن و منالّمان لە خوێن شەلاّلە
لەتەنگانەدان ڕەنجبەر و پالّە
دوژمنی ناکەس بەر بۆمبای داون
گوند و مەزرامان گەلێک سووتاون
پ: گەرەکتە بێژی بەعسی ناکەسن!
ب: بەعسی چی! پیرۆت جاشک تەرەسن
بەعسی دوژمنە و کوردستانخۆرە
گەر کورد بۆی بکا داخ و ناسۆرە
پ: ئاخر، مام باپیر، جاش کوڕی کەرە
لە حالّی دنیا زۆر بێ خەبەرە
نەخوێندەوارە بە خۆی نازانێ
کوێری بێ گۆچان پێ لە کوێ دانێ؟
ب: پیرۆت تۆ لە کوێی؟ کوردی خوێندەوار
خوێناو هەلّێنن! لێمان بوون بە مار
بلە ناناسی؟ ئەو مەحامییەکە
مل باریکەکە، مامرە شامیەکە؟
پ: چۆنی ناناسم! مامۆستای خۆم بوو
بەلای خۆی بۆ کورد بۆمبای ئاتۆم بوو
ب: بەلّێ مامۆستا دەس بەخەنەکە
لە پێشا بۆ کورد زۆرناژەنەکە
ئێستە بۆ پارەو بۆ کوێخایەتی
وازی هێناوە لە کوردایەتی

ئێژێ ئاتۆمم دژی گەلی خۆم
لەگەڵ دوژمنا کوردستان ئەخۆم
جاش مامۆستایە و مامۆستای جاشە
کەری بەرباری بەکر و عەمماشە
عابای نامەردی لەسەر شانیەتی
دوژمن بە کورد و کوردستانیەتی
جاشکی ئەو لە پێش ڕیزی دوژمندا
بە سەولەی عارەب دێ بە گژ مندا
منالّی ساوا و ژن ئەسووتێنێ
لەجێی کشتوکاڵ مردن دەچێنێ
فڕۆکە گوندم بەر بۆمبا ئەدا
جاشکی مامۆستا دەرسی دا ئەدا
ڕۆژنامەکەی ئەو دوژمن تاو ئەکا
خۆیشی تاژییە و بۆ سەگ ڕاو ئەکا
داویەتە هاری ئەگرێ بەلەکمان
پ: یاخوا کوێری کات نان و نمەکمان
بە نانی کوردان گەورە کراوە
بە پارەی ئێمە پێی خوێندراوە
لەسەر شانی کورد کرا بە حاکم
بۆ دەس بڕینم خۆی کردە کاکم
بە کورد کوردێنە چاوی منی بەست
تا لە سایەی من پلەی کەوتە دەست
لێم هەڵگەڕاوە و ڕووی کردە شاران

ڕۆژێک لە بەغدا جارێک لە تاران
خۆی خۆی فرۆشت و لە منیش ناگەڕێ
لێم بۆتە تولّە و بە کون دەوەڕێ
گەرەکیە ئێمەش جاش بین وەکو ئەو
بەزۆر ڕامکێشێ بۆ تاریکەشەو
سا ئەبێ چ بکەین لەدەس ئەم تولّە!
ب: پیرۆت گیان، خاین تەمەنی کولّە
خۆ فرۆش هەر بوون لە ناو گەلاندا
قەلی ڕەشیش هەن لەناو مەلاندا
بەلّام دەستی گەل، خاین خنکێنە
گڕپەی ئازادی، دوژمن سووتێنە
کورد و کوردستان هەر ئازاد ئەبێ
دوژمنت کوێر و دۆستت شاد ئەبێ
ڕۆژی داگیرکەر لە ئاوا بوونە
بەرەو ئازادی ئاسۆمان ڕوونە
خاین مەرگی خۆی لەبەر چاویەتی
وا پەلەقاژەی گیانەلّاویەتی
پ: واتە، جاشە ڕەش بەلاش ئەزەڕێ
ب: بێژە، تولّەیە و بە مانگ ئەوەڕێ

***

هەر کەس ئاگای لە رابردووی پاش پاشایەتیی عێراقە دەزانێ حیزبی کۆمۆنیست تا سەرێک دەگەڵ قاسمدا وەکو گوێی هەرامە جووت بوون. لە کوشتاری بێ پرسیاری سەتان عەرەب و تورک و کورد لە موسڵ و کەرکووک و کوێ و کوێ. وەک بزووت بوون، هەر کەسێ دەیگوت عەرەبیم، هەرچی بیگوتایە کوردم، بە گوناهی ناسیۆنالیستی لێ براوبوون سەربەنیستی کەن. خێزەرەی بەرەی جرِوجۆنگ کەڵکەڵەی کوێخایی کردن بای کردن و بایی کردن. دروشمی "مەتلەب عەزیمی" کەریمی لێ دردۆنگ کردن، کەوتە گرتن و لێدانیان. کاتێ بەعسی کۆدەتای کرد، فەرمانی سوورقران دەرچوو. هەر ئەوانە سەریان دەرکرد کە ماڵیان لە کوردستان بوو، یان توانیبوویان هەڵێن و پەنا بە بارزانی بێنن. پەنادران، وەک خۆمان و تۆزێکیش زیاد بەخێو کران و بە ئارخەیانی دامەزران و گوتمان بران. بەڵام دوای ئەوەندە ساڵە کە پەیمانە نەوتینەکەی نێوان سەددام و شورەوی ئیمزاکرا، بەعسی گوتی با بێنەوە چیان لێ ناکەم. هەر هێندەی فوو لە قەننە کەی گشتی پێشمەرگەی جێ هێشت و چوونە بەغدا و لە جاریان دا کە ئەو کوردەی لە کێوانە و لەگەڵ دەوڵەتا شەریانە کۆنە پەرست و سەهیۆنین. نیشانەشمان بەو نیشانە کە خۆمان بە چەکی سانتۆ فیشەکی ئەمریکاییمان بە دەوڵەتی سوسیاڵ بەعسیانەوە ناوە. دوانیان ناونران وەزیر و لە مووچە پێدان بەولاوە کەس چی بەکلاو نەدەپێوان. بە پفی بەعسی فوودران و مل بە چەکی سووک و گران. دژی ئێمەی کە پێشو تێشوومان داون و لە سای ئێمە پارێزراون، دەگەڵ جاشی مامجەلال و فیئوداڵان و کجوکی خاڵندی وەلیدی عارەب هاتنە شەرِمان بۆ تاڵان و بێ ناموسی و بێ شەرمانەش دەیان نووسی ئێمە چونکە مارەبراوی مەسکەوین پێمان مەڵێن جاش، پێشرِەوین. لەو بارەوە ئەم دەمەتەقەم داناوە و لە ژمارەیەکی خەباتدا چاپکراوە:

***

### دەمەتەقەی پیرۆت و بایز

**هەمیشە پێشرِەو**

پ: ئا وەرە بایز ئەمە تۆ چیت کرد!
لە شوعەتیەکەت بۆچ وازت هاورد!
ب: بێژم چە پیرۆت، سەرم لێ شێوا
وە هەزار ربە و گەزیان ئەپێوا
ئەو ساڵە وتیان ئێمە ئوممەمین
گشکیان یەک تیرەن خەڵک سەر زەمین*

---

* ئوممەمی: بین المللی.

دژ چەوسێنەر و دۆستی چەوساوین
ئاوی بێ نان و نانی بێ ئاوین
وتم ئومەمی وە کوردی چییە؟
وتیان بێ دەنگ بە، کورد ئۆمەت نییە
پ: دوور لە ڕووت، خۆتیان کردە گوێرەکە؟
ب: پیرۆت لە قسەما دلۆپە مەکە
هەتا پەنج شەش ساڵ ئەمەیان جاوی
ڕۆژێ جاڕیان دا وەتەنگەتاوی
کوردیش ئۆمەتە و مافی ژینی هەس
یارمەتی ئەدەین زیاتر لە هەر کەس
ئەشێ کوردستان مەزن دروس کەین
ئەشێ داگیرکەر کوردستان وس کەین
پ: ئەمەیان لە چی و ئەویان لە چی بوو!
ب: من ئێژمی گشتی لە بار کەچی بوو
هەتا دەهۆڵیان دەنگی ئەداوە
وە کوردیان ئەوت بچۆ بەولاوە
هەر دەهۆڵ دڕیا کردیانمە کاکە
پ: وتیان چەرمە کورد بۆ دەهۆڵ چاکە
ب: بەسیەسی پیرۆت، چەن چەنە بازی
پ: بۆیە کورد ئێژن بۆز وە لاوازی
ب: دەسا بیبوڕەوە
پ: بەڵێ، دەی فەرموو
نایەژم نەحلەت لە بوک و پەردوو

ب: ئیتر لەو ساوە بووم، وە وشکەڕن
ئەوان لە بان پەت، هەڵپەڕکێ لە من
وەبژی بژی، وە چەپڵەڕێزان
هۆشیشم بڕیا لە ماڵ و خێزان
وەگیان تۆ نەنان، نەئاوم بۆ ما
ببووم وە چەوێک لە تەهی گۆما
پ: پاشان؟
ب: پاشان چی؟ کۆدەتا کریا
کێ سوور بوو کوژیا، دادڕیا، بریا
کەوڵیان ئەفرۆشیا، وەک کەوڵی دەڵەک
لەگش ئاقارێ لاش کریان کەڵەک
پ: بایز وەک ئێژی ڕاوە وەراز بوو
جا لەم سوورکوژیە، کەسیان دەرواز بوو؟
ب: بەڵێ لە سۆنگەی منی خێرەومەند
زۆریان دەرچوون و خۆمیان کردە پەند
وەپلە پرووزێ کێ هاتە لامان
لە مردن خەلست لەسای پەنامان
وە نان و ئاوم زینگوو بوونەوە
تێریان خوارد، ئێستە تێ هەڵچوونەوە
چوگنە بان کورسی و پێم پێ ئەخەنن
هاتوون تۆڵ دیزە لە جام ئەسەنن
وەبڕنە و خۆمان خۆمان ئەپێکن
پ: ناوێرم بێژم عەجە و خەرێکن

ئاخر فامینێ، ئاوەزێ، بیرێ
ناترسن دیسان تێیان بگیرێ!
وە بلوێر فێڵباز کەفتگنە سەما
چی ئەکەن، ئەگەر دەنگ بلوێر نەما!
ب: پیرۆت چۆن ئێژی کار خەراو ئەکەن!
وەم شەڕە کوردە ڕەنگ تەواو ئەکەن
ئەمانە ناشێ بێکار دانیشن
سمێڵیان سووزیا، هەڵوەدای ڕیشن
جاشیەل ئەقطاعی سم خڕ و شینەن
جاش خالیدەکان بۆرەڵووکینەن*
جاش تەقەددومی ڕوو زەردن تۆزێ*
لەم لاو لەولاش هەن چەن جاشە بۆزێ
ئەمانە گەرچی سووری کاڵیشن
پاشماوەی جاڕی ئاش بەتاڵیشن
لە ناو جاشگەلدا جاشی سوور ئەون
وە گفتی خۆشیان دایم پێشڕەون
پ: ئێ مام بایزۆکە، ئاخری خێربێ
دوور نییە ئەم چەشتەش وەدەمیان سوێربێ

***

* جاشکە عەرەبەکان ناویان نرابوو خالیدی کوڕی وەلید.
* مامجەلال و جاشەکانی هاوکورتانی بەخۆیان دەگوت «تقدمی» واتا: پێشکەوتنخواز.

ساڵی حەفتا بەعسی عێراق بانگاوازی خودموختاریی کوردەواریی لە ڕووی ناچاری ڕاگەیاند و زۆربەی خوێندەواری کوردیان کێشا شار و مووچە و کاریان بۆ دیاری کرد. لە ساڵی حەفتا و یەکا منی هەژار بەسەرۆکی دەستەی نووسەرانی کوردی عیراق هەڵبژێرام. لە پاش چەرمەسەرێکی زۆر، دەستووری بڵاوکردنی گۆوارێکمان لە ژێر ناوی «نووسەری کورد» لە دەوڵەتی بەعسی وەرگرت. من لام وابوو ئەو مافەی بە کوردیان داوە تا سەر نابێ و بەعسی ملهوڕ هەر بینا پاشگەز بوونەوە و بیانوێکمان بۆ ئەدۆزنەوە و ڕیسە باش بانەدراوەکەمان لێ دەکەنەوە بە لۆکە. بەو خەیاڵە ئەم پەخشان و شیعرەم لە یەکەمین ژمارەی گۆوارەکەدا نووسیوە:

## لە دەمی نەهەنگا

مارس ١٩٧١- دەڵێن ئەگەر وردە گۆشت و بەرماو لە کەلێنە کەلّپی نەهەنگدا شەوێک بمێنێتەوە لێی دەبێتە ژەهر و دەیکوژێ، جا لە دوای خواردنی نێچیر دەم دەکاتەوە و مەلێکی بچووک دەچێتە ناو زاریەوە و ددانەکانی داژنێتەوە و بەو بەرماوە دەژی:

مەلم مەلێکی بچووکم
بێ هێزن باڵ و دەنووکم
بێ ناوم لە ناو مەلاندا
ئاوارە لە چیا و تەلاندا
ئەگەر هەوا گەرمە، سەردە
جێگەم تەڕاش و بن بەردە
کەس بەسەرم ناکاتەوە
کەس ئاوڕم لێ ناداتەوە
وەکو پووشێکم لەدەم با
شەماڵ دامنێ، زریان دەمبا
باشوو نەمخوا، باز دەمگرێ
ڕێگەم پڕ لە کۆسپە و گرێ
لە ژیانمدا خۆشی نەدیو
لانە شێواوم بێ بژیو

به ناهومێدی سووڕ ئەخۆم
نازانم بەرەو کوێ ئەڕۆم!

***

دامەزراوم لەلای نەهەنگ
چینە و دانم کەوتۆتە چەنگ
دەمی بۆم داچەقاندووە
گەوی لیچی ڕەواندووە
پێک هاتووین ددان ئاژن بم
لە ناو کەڵپان بەرماو چن بم
من نەبم، دەمی بۆن دەگرێ
من یاریدەی نەدەم، دەمرێ
جێم باشە خوا نەیشێوێنێ
بەڵام تاکەی وا دەمێنێ
نەهەنگی ئاغام زۆرخۆرە
بێ بەزەیە، خاوەن زۆرە
ئەگەر جارێک لەم چینەمدا
مچوڕکێکی هات بە دەمدا
ئەگەر گەرم داهات گیانی
گۆشت مەلی بە دەرمان زانی
ئەگەر لە جوابی پرسیارێک
دەمی بە یەکادا جارێک
منی کلۆڵ چ بێ چارەم!
ئای کە هەژار و بێ چارەم

***

وەک باس کرا ساڵی حەفتا بە بەڵێنی خودموختاریی کوردەواری لە عێراقدا دەگەڵ بەعس ئاشت بووینەوە، بە کوردی لەشەڕ چووینەوە. ماموستاکان چوونە بەغداو بوونە وەزیر و مودیر و ئەستاندار و دەست ئەندەرکار. بەشی زۆریان لە ڕێگەی چەوریی پێخۆریان، لەبەر مەستیی پارە و کورسی، تێر ئاگای لەبرسی نەما، دەس کرا بە خانوو کرین و ترۆمبیلی جوان لێخورین. پێشمەرگە ڕەمەکییەکانیش کە ئەوان شەریان بردەوە، رژانە ناوشارانەوە و چوونە ناو ریزی بێکاران و لە بیرزلان برانەوە. بەم شیعرانە تۆزێ گلەم لەو خۆبویرانەی خۆمان کرد و ناوم لێ نا «حەللەق، مەللەق» چیرۆکنووسی بەناوبانگ «مەم» سەرپەرستی گۆواری «هەولێر»ی ئەودەم بۆمی چاپ کرد. منیش بۆ بەڵاگێڕیی ئەم دووبەیتی ئاخریەکەم کە تێر و خەست و خۆڵتربوون دەراویشت و خاڵمان لە جێی بەتاڵ دانا.

هەر شیعر لەچاپ هاتەدەر، هەرچی، هەرچی و پەرچی کار لەمست و هەلپەرست و بەناوی کوردایەتییەوە بۆ کورد فرۆشتن چەرچی بوون، وەک زەردەواڵەی هارووژاو هورووژمیان کرد. شیعری ئابڕووبەریان دڕی، مەم یان لەسەر کار وەلابرد، هەزار شکایەتیان پتر لەلای بارزانی لەمن کرد. وتیان هەژار دژی کوردە و خاین دەبێ سزا بدرێ، کە بارزانی ئەمەی پێ زانی خواستمی و شیعرەکانم بۆ خوێندەوە. لەجیاتی سزا سەد ئافەرینی لێ کردم و فەرمووی دەستم دەگەڵ دەستی تۆیە. ئیتر لەدەست ئەو گورگانەی وا کەوڵە مەریان پۆشیبوو پاراستمی، مەمیش لە ئازار رزگاربوو. شیاوی باسە عارەب و کوردی عێراقی هەڵبەستی تازە بابەتی پەت پساویان کە بەلاوە زۆر پەسەندە ناو لێ ناوە شیعری «حوڕڕ» واتا ئازاد.

***

مانگی پێنجەمی ساڵی ١٩٧١- هەژار بۆگاڵتە شیعری حوڕڕی نووسیوە:

## حەللەق مەللەق

مـــامـــە گـــیـــان ســـلاوی بـۆندار

پـیـــرۆز بـێ قـــەفـــە و کـــورسـی

گـــەر لە پـچـــووکی خـــۆت ئەپـرسی

مـــــــــــاوم بـــەڵام بـــەلارە لار

نـەگـــۆڕاوم، هـەروەک پـێـــشـــووم

وەک زوو دیـــوتم هـــەر بـــێـــکـــارم

هـــەر نـــەدار و نـــالـــەبـــارم

بـێ نـان و بـێ بـەرگ و تـێـــشـــووم

مـــامـــە گـــیـــان ئەوکـــاتە لە چیـــا

پێکەوە دەژیاین لە ئەشکەوت
ڕانک شڕۆڵ و کەڵاش چەوت
لە هیچ شت لێک نەبووین جیا
برای یەکتر بووین ئەو ڕۆژە
دەت فەرموو ئەگەر ئازاد بین!
لە سووچێک بەمافێک شاد بین!
دەتکەمە دەرزیی بەرکۆژە
بەناو ئازادیمان وەرگرت
تۆ هاتیە شار و ئەفەندیت
کەس نازانێ چۆنی و چەندیت
خانووی شەش حەو قاتت سەرگرت
یانسیبت بردۆتەوە
قاسەت لە پارە ئاخنیوە
زۆربەی زێڕە و کەمی زیوە
منیشت لەبیر چۆتەوە
عەریزەم نووسی بۆ خانوو
چونکە خانوویان سووتاندووم
لە زەوی دەریان پەڕاندووم
بێ جێن مناڵ و کەیبانوو
لەسەرت نووسی ناتکەوێ
زەوی و خانوو لە کوێ بێنم!
چۆن سەری حوکمات دێشێنم!
بۆخۆت بژی لێر و لەوێ
گوتم بێ جلکم، بێ تینم

مەدرەسەی دەویٚ زاۆکم

فەرمووت: دە بەردە بەرۆکم

نابیٚ جارێتر بتبینم

دەردی تازەت پیٚ دامەوە

پاش ئەو هەموو دەردەی چێشتم

بە مارسیدس بەجیٚت هێشتم

پاپەتیو پیادە مامەوە

بیٚ ئەمەگ، بە خوێنی ئاڵم

کورسی بەرزم بۆ تۆ کڕی

تۆش چڵمی خۆت بە من سڕی

تۆ سازی و من ژیان تاڵم

با وا بیٚ مامە با وا بیٚ

باخوێن بەهای من فیرۆ بیٚ

هەرچی من کردم بۆ تۆ بیٚ

با ئەو قەرزەی من فەوتا بیٚ

................................................

................................................

................................................

................................................

***

سالّی ١٩٧١وەک دەستەی نووسەران پێک هات، فەرهەنگستانی کوردانیش بەناوی «کۆڕی زانیاری» دامەزرێنرا، لەوێش بەئەندامی کارا وەریان گرتم. لە لیژنەی کتێبی دەرسیش بۆ منالّی کورد بەشداربووم، بۆ کۆوار و ڕۆژنامانیش وتار و شیعرم نووسیوە، جاروبارەش بەئارەزوو یان ڕوو لێ نانی هەوالّان تاکو تەرا هۆنراوم هۆنیوەتەوە، بەشی زۆریان بەعسی وێڕای تالاّن کردنی مالّەکەم لەناویان دان. ئەو تۆزەی کە بۆم خەلساون ئەوانەن کە لەمەودوا دێن:

## مەتەلّ

بۆ کتێبی سەرەتایی

دەبزانە چییە؟ خۆشە مەتەلّم
بیری لێ بکەوە مەلّێ تەنبەلّم
گیان لەبەرێکە مەلەوانی گۆم
زۆرجاران دیوتە لە ڕووبار و چۆم
بێ قاچ و دەستە، بێ چرپە و هەستە
لەشەپۆل برین وەکو مقەستە
بالّیشی هەیە و پێیان نافڕێ
زاریشی هەیە و هەرگیز ناقڕێ
نیوە لە ناوی دەی لەچل کەمە
مای بۆ بنووسە و بیخۆ سێ ژەمە
ئەگەر پێت نەکرا هێشتا بیناسی!
دەتخەمە ناو ئاو دەتکەم بە ماسی

***

## دایک و باب

بە ڕەنجی دایک بەخێو کراوم
باوک ماندوو بوو بۆ نان و ئاوم
دایکی دلّسۆزم پەروەردەی کردم

ئەگـــــــەر ئەو نەبا زۆر زوو دەمـــــــردم
دایک زۆر لە خـــۆی خـــۆشـــتـــری دەوێم
ئەو بەرگم دەشـــوا، ئەو ڕادەخـــا جـــێم
پـێـــــــــــلاوی دایـک لـە بـانـی چـاوم
بـاوکم خـــــــۆش دەوێ هەتـا مـن مـــــاوم

***

## یاری

تـۆپـی یـاریم زۆر خـــــــــــــــۆش دەوێ
یـاریم لـەبـەرچـاو نـاکـــــــــــــــــەوێ
پـیـــــــــاو بـەوەرزش بەهـێـــــــــز دەبێ
لای مـــــــــــەردم خــــــــــاوەن ڕێز دەبێ
وەرزش مـــــــــــــــرۆ ئـازا دەکـــــــــــــا
ئـــازا وڵات ئـــاوا دەکــــــــــــــــــــــا
مـــــن لـــــــە وەرزش پـــــــاڵـــــــەوانم
ڕۆڵـەی ئـازای کــــــــوردســـــــتـــــــانم

***

## سەعات

چـک چکی ســەعــات دەڵێ: وشــیـــار بە
تەوەزەل مـــــەبە، خـــــەریکی کـــــار بە
وەک مـن تێـکۆشـــــە بەڕۆژ و بـەشـــــەو
هیـچ پەیـدا نابێ بە تەنبـــــەڵی و خـــــەو
مـــــاندوو بوون و کــــار مـــــایەی ژیـانە
بـــێـــکـــار ڕابـــواردن ڕەنج و زیـــانـــە

گـــەر مـن کـــارنـەکـــەم لەشم ژەنگ دێنێ
دەچمـــە ســـەر وەســـتـــا هەڵم وەشـــێنێ
مـــرۆڤ کـــار نـەکـــا ، کـــاری زۆر لـەنگە
ژەنـگـی بـێـکاری شـــــوورەیـی و نـەنـگـە

**بەهار**

زســـــتـــــان نـەمــــــا بـەهـار هـات
خــــــۆشی بـۆ گـــــونـد و شـــــار هـات
بـولـبــــــول گـــــــەیـی بـەمــــــرادی
دەخـــــــــــــوێـنـێ بــەئــازادی
پــــەپــــوولـــــە لـــــە چـــڵ بـــۆ چـــڵ
دەچـن بـۆ ســـــــــەیـرانـی گـــــــوڵ
جـــــوانە ئـەم چـیـــــاو دەشـــــتـــــە
کـــــوردســـــتـــــان وەک بەهەشـــــتـــــە

***

**سروود**

کـوردســتــانی جـوان ئەی نیـشـتـمـانم
ڕوونـاکـی چـاوم، ئـارامـی گـــــیـــــانم
لــەدەســت بـێـگـانــە دەرت دەهـێـنـم
پێـشـمـەرگـەی تـۆم و تـۆڵـەت دەسـتـێنم
.....
ســــــــاوا بـووم چـاوم بـەتـۆ هـەڵـێـنـا
لـەپـێـش بـابـەدا نـاوی تـۆم هـێـنـا
هەتا دەشـــــرم هەر تۆی ڕووگـــەی من

ڕزگـــــارت دەکـــــەم لەدەســــــتی دوژمن

.....

کــورد بۆ ســەربەســتی خــوێنی دەبەخــشێ

ئـاڵای ئازادی بـەخـــــوێـن دەنـەخــــــشێ

خـــوێن دەدەم، گـــیــــانمت لە پێناو دەنێم

لەســـــەر خـــــاکی خـــۆم دوژمن ڕاودەنێم

.....

کــوردســـتــانی جـوان گــیــانی شــیــرینم

بــەقـــــــــــوربـانـت بـن ژیــان و ژیـنـم

***

## سروود

پێــشــمـــەرگـەم و بۆ ڕزگـاری نیــشــتــمــانم لە خـەباتم

دوژمن هەرچەند بەهێــــزیش بێ دەبێ دەرچێ لە وڵاتم

گـولله تۆپ و بۆمـبـا و ئاگـر کـار لە بیـر و بڕوا ناکـەن

مـاڵ و سەر و خـوێن و گـیـانم قـوربانی ئەم ئاو و خـاکەن

ڕۆڵەی ئازای کـــوردســـتـــانم، دوژمنی داگـــیـــرکــەرانم

بۆ ســەربەخـۆبوونی گـەلم، بەخـتی دەکـەم مـاڵ و گـیـانم

زۆر لەمـێـژە کـورد ئەکـوژرێ، لە مـەیداندا خـوێنی دەڕژێ

شـار و گوندی وێران دەکرێ، مێشکی کیـژ و لاوی دەپژێ

بەڵام لاوی کـــورد لە مـــردن سڵ ناکـــات و خـــۆ ڕاگـــرە

بیـــر و بڕوای کـــوردایەتی بۆ گـــیـــانی دوژمن ئاگـــرە

ڕۆڵەی ئازای کـــوردســـتـــانم، دوژمنی داگـــیـــرکــەرانم

بۆ ســەربەخـۆ بوونی گـەلم، بەخـتی دەکـەم مـاڵ و گـیـانم

سوێندمان بە خوێنی شەهیدان، تۆڵە لە دوژمن دەستێنین
داگیرکەرانی کوردستان لەڕەگو ڕیشە دەردێنین
سوێندمان بە خاکی کوردستان دەبێ کوردستان ئازاد کەین
داگیرکەر لە خاکمان دەرکەین، گیانی شەهیدانمان شاد کەین

***

## سروود

کوردین ڕۆڵەی کوردستانین، بەدڵ ئازادیمان دەوێ
هەتا لەسەر دنیا زیندووین سەرمان بۆ دوژمن نانەوێ

***

لە ڕێگای ئەم نیشتمانە سەر و ماڵمان لا هەرزانە
کوردستان دینە، ئیمانە، کوردستان ژینە، ژیانە

***

سەربەخۆ بوون و ئازادی، ئاواتی هەموو کوردێکە
لەبەرانبەر داگیرکەران، هەموو کوردێک نەبەردێکە

***

چیتر کورد ناژێ بەدیلی، بە داگیرکەران ناخورێ
بڕوامان کێوی پۆڵایە، بەهیچ هێزێک لانادرێ

***

بەخەباتی خوێناویمان، ڕێگەی ئازادی تەخت ئەکەین
بۆ مافی چارەنووسی کورد، خوێن و سەروماڵ بەخت ئەکەین

***

هەتا کوردستانی ڕەنگین، لە دوژمن پاک نەکەینەوە
بیر لە خۆمان ناکەینەوە، ئاوڕ بۆ دوا نادەینەوە

***

لە ڕووی داگیرکەری وڵات، شێری شەڕ پڵنگی جەنگین
تۆڵای پۆڵا و شوورەی سەنگین، لە دەریای خوێندا نەهەنگین

***

کاک بەدیعی بابەجانی گەورەتر ڕەسامی ئەمڕۆی کورد، ڕووی لێ نام کە باسی ژیانی بنیادەمی هەر لە دەمی ساواییییەوە هەتا دوایی بە شیعر بۆ بهۆنمەوە، ئەویش بەوێنەی کوردانە بی نەخشێنێ و چاپی بکا. من بۆم نووسی، بەداخەوە مەودا نەما پرۆژەکەمان پێک بێنین:

## قۆناغەکانی ژیان

ئادەمی بەرهەمی کەمێ قوڕ و ئاو
دایکە وای کردە جێ گەرا بۆ پیاو
دەوری ساوایەتیی شل و خاوی
خەمڕەوێنی دڵی و لەبەر چاوی
تا دە ساڵی بزۆز و چالاکی
بێ گزی و ڕاست و دەست و دڵ پاکی
لە دە تا بیست بەهاری ژین دادێ
باوی یارگرتن و ئەوین دادێ
بیست و سی ئەرکی ماڵ و منداڵە
خۆش و شیرین و جاروبار تاڵە
هەڕەمەی هێز و بەرهەمە تا چل
پێت گەیاندوون نەمامی شەنگ و شل
چل و پەنجا نەوەت بە باوەشەوە
تاڵی چەرمووگ لکان بەمووی ڕەشەوە
پوخت و پاراوی ژین لە پەنجایە
دێتە ڕوو ڕەنج و سوود و سەرمایە

له پلەی شێست بەتەجرەبە و ژیری
پلەیەک دابەزی بەرەو پیری
چوویە حەفتا بە کۆخە کۆخ، تووڕە
دەست و ئەژنۆ دەلەرزێ، پشت کووڕە
سواری هەشتای، هەناسەشت سوارە
لار دەڕۆی لاقی سێهەمت لارە
لە نەوەد مەرگە پێی دەڵێن ژینە
بەفری بەر سوورەتاوی هاوینە
پاشی سەد وەک منالّی یەک سالّی
شیرەخۆرەی بەڵام بە خوێنتالّی
باوەشی گەرمی گۆڕ کراوەتەوە
هەرچی خاک داویە بۆی گەڕاوەتەوە
***

## مادە تاریخم بۆ عەبدوڵڵای برای کاک بەدیع نووسیوە کە لە سەرکێلەکەی هەڵکەنن:

دڵ بەدنیا مەبەستە بێ بارە، کەمە خۆشی و خەمە سەرەنجامی
بابەجانی گوڵن لە کوردستان، هونەری جوانە بگری هەرکامی
خزمەتی گەل دەکەن بە دڵسۆزی، خێوی ناون پزیشک و ڕەسامی
(گوڵی ئەو خانەدانە عەبدوڵڵا، داخەکەم هەڵوەری بەناکامی)
شیعری ناوکەوانە ئەگەر لامی عبدالله بەیەک حساب بکرێ بە ئەبجەدی دەبێتە ١٩٧١
***

دامودەزگایەکی تازە بۆ کۆڕی زانیاری کرا، مادە تاریخم بۆ نووسیوە و لە کۆواری کۆڕدا چاپکراوە:

## کۆڕی زانیاری کورد

ئەم کـــۆڕە ژ کـــوردارا جـــەوهەر بە خـــەڵات دێنێ
تـیـــــــــرێـژی هـونـەر لـەورا تـاریـکـی دەتـارێـنـێ
وێژە و کـەلەپووری کـۆن، فـەرهەنگ و زمـان وانی
زانـیـــاری بە هۆزانی خـــۆی لە گـــرەوە دەنوێنێ
کـرمـانج و لوڕ و سـۆران، زازاو مـوکـوری و گـۆران
وەل یەکـــتـری داخـێـون، کـەس نـینە کـو دامـێنێ
ئەو رووگـــەیە پیـــرۆزە ئاواتی گـــەلی کـــوردە

پێک هاتووە بۆ مێژووی «خۆشتر لەهەموو شوێنێ» ١٩٧٣- بە حیسابی ئەبجەد.

***

قانعی شاعیر پێش جەژنێک هەڵی پێچام دوو بەیتی جێژنە پیرۆزەی بۆ بنووسم تا لە کارتێکدا چاپی کا و بیفرۆشێ، منیش ئەم دوو بەیتەم نووسی:

جـــەژنت پیـــرۆزبێ کـــوردی زگ قـــوپاو
دەرخـــــــۆنە لاچێ، دەرکــــــەوێ پـلاو
هێند تامەزرۆ بووین ئێـمەی دوورە چێشت
هێـشــتـا نـەکـولابـوو دەنکمـان نەهێـشت

***

ساڵی ١٩٧٤ بەعسی، گوایە بەڵێنێ خودموختاری دان بە کوردستان ئەباتە سەر بێ پرسی بارزانی و پارتی ، شـێست کـەسی پەست و ناکـەسی چڵکاوخۆری خـۆی هەڵبـژارد بۆچاو بەسـتنی ڕای گـشـتی. خودموختاری هەر بە ناو و پووچەڵ و بێ ئیختیاری پێ سپاردن. لەو بارەوە ئەم دەمەتەقەیەم نووسی:

## دەمەتەقەی باپیر و پیرۆت

ب ـ مام پیرۆت ڕۆژباش
پ ـ ئەی بان سەرەکەم

ب ـ خێره؟ بۆ گرژی؟
پ ـ لەداخ کەرەکەم
ب ـ کەرەکەت؟
پ ـ بەڵێ
ب ـ کامە؟ سوورەکە؟
ئەو پەل قەویەکەی ملەستوورەکە؟
پ ـ دەم خۆش، خۆیەسی
ب ـ نەخۆش کەوتووە؟
پ ـ نا وەگیانی تۆ، وا دوو حەوتووە
مانی گرتووە و دەم لە کا نادا
وەدەوری دادێم هەرگوێش بانادا
تۆ ئێژی چەی بێ؟ چۆن بیکەم چارە؟
ب ـ وە قسەی من ئەکەی بیبە ئەو خوارە
پ ـ باپیر چە ئێژی؟ خواررووی بۆ چییە؟
ب ـ دیارە هیچ ئاگات لەدنیا نییە
ڕادیۆ ئەبیسی؟
پ ـ گوێم لێ گرتووە
ب ـ سا کەرەکەی تۆش ئەمەی بیستووە
شێست کەر لە بەغدا هەڵبژێراون
بۆ حوکمی زاتی ناودێر کراون
کەرەسووری تۆ لە وان پیرترە
ـ بێ چاوێنی بێ زۆریش ژیرترە
ئەمان زۆربەیان جاشولکەی شینن

ــ کەرە سووری تۆ بەعسی بی بیێن
هەر بە تەزکییە ئەیکەن بە ڕەئیس
ڕزگاری ئەبێ لە پەت و گوریس
ــ ئەوسا لە مەجلیس خۆی تێر جۆ ئەکا
ئەگەر تۆش گیریای تکات بۆ ئەکا
پ ـ بیسمیلا باپیر ئەوە تۆ شێت بووی!
ــ لە کەرێ گەڕێ، ئەتوو لۆ خۆت کووی؟
کەرەسووری من چۆن ئەبێ بە جاش!
کوو جزمەی تازە ئەبێ بە کەڵاش!
بەوخوایەکەمە، ئەمە بزانێ!
ئیتر وەک دوژمن لە تۆش دەڕوانێ
ـ کوو کەرەسووری ئاوا بە نامووس
دەچێتە بەغدا و دەبێتە مەبعووس!
ب ـ پیرۆت ببوورە، تۆبە، یاغنیشم
پ ـ باشە لێت خۆش بووین خۆم و کەریشم
* * *

# بەشی دووهەم

لە هەر باغێ چومێ چڵێکم ڕنی
لە خەرمانی هەرکەس گوڵێکم چنی

* * *

ئەم شیعرانە کە لەمەودوا دێن تەرجەمەیەکە لە ئەدەبیاتی بێگانە کە بەشی زۆریانم لە عەرەبی و فارسییەوە وەرگرتووە و لە هێندێکانیشا دەسکاریم کردووە، هەروەها چەند فۆلکلۆرێکی ناو کوردەواریی خۆشمانم لە پەخشانەوە کردۆتە هەڵبەست بۆ ئەوە منالانی کورد ڕۆژێک لە ڕۆژان لە فێرگەکانا بیخوێنن و بەهرەی لێ وەرگرن، ئەگەر جاروبارە گاڵتە و گەپێکی تێدایە بۆ زاخاوی مێشکە و داوای لێ بووردن ئەکەم.

* * *

## کەر و گا

شەوێ گا وتی بە کەر:
وەرە بمکە چارەسەر
بێ وچان و سانەوەم
پەیتا لە چرووسانەوەم
هەر وەرد و شێو بڕینە
جەرگی زەمین دڕینە
سێ گاسنە و چاندنە
ئەمجا دەبمە گای بنە
خۆ لەبەر تۆزی گێرە
چاوم پڕووش و کوێرە.
کەر وتی: خۆ نەخۆش کە
خۆت کروشمە و پەرۆش کە

ئەگەر خێو هاتە گەوەڕ
دەمت مەبە بۆ لەوەڕ

***

خێو دیتی گا ناسازە
نالەوەڕێ و لاوازە
تێگەیی فیکی کەرە
بۆ تەنبەڵی ڕێبەرە
کەری کێشایە بەر نیر
با ماندووبێ کەری پیر
تا ئێوارە بە تێلا
زەوی ڕەقیان پێ کێلا
هاتەوە شل و شەکەت
ها ئێستا ببێ سەکەت
گا پرسی: چۆنی کاکە؟
وتی: دڵم خەمناکە
ئەمڕۆ ئاغا دەیفەرموو
ئەگەر گا هەر نەخۆش بوو
ناچارم سەری ببڕم
گاجووتێ دیکە بکڕم
گا ڕاپەڕی زۆر لە گوڕ
ماشتی قەسەڵی ئاخوڕ
پرزە و گزرە و کا گشتی
کلکی نایە سەر پشتی

چـــاپـــک لـــە ڕەوت و بـــازا
ســــــاغ تـر لـە گــــــوێـزی ئـازا
گـــــایـان دەردەکـــــــردە چـۆڵ
ورتـەی بـوو کـــەر لـە ســـەرمـــۆڵ
لـەو هـەڵـەوەڕیـەم گــــــــەڕێـم
دەش نـــووم و دەش لـــەوەڕێـــم
گـــا دەیـگوت لە هێـــڵـی شـــێـــو
چەنـد بەنرخــــە وتەی خـــێـــو
ژیـان بـۆ کـــــــارکــــــــردنـە
تـەنـبـــــەڵ بەشـی مـــــــردنـە
***

## کەری کوڵ

کــــــەرێـکـی بـێ کـلـک و کــــــوڵ
زۆر پـەژارەی کـــــــــــەوتـە دڵ
ڕووی نـــەبـــوو لـــە هـــیـــچ دەران
بچــــتـــە ناو کـــۆڕی کـــەران
کــــــەری دێـز و کـــــــەری شـین
قــــاقـــا پێـی پێ دەکــــەنـین
گـــــــرتـی ڕێـگـای دەشـت و چـۆڵ
بـە زەڕەزەڕ بـەســـــــــــمـکـۆڵ
هـەرگـــــــــیــــــــز نـەدەلـەوەڕا
هـەر بـۆ کـلـکێـک ئـەگـــــــــەڕا
ڕێـگـای کـــــــەوتـە بـەر پـاڵـێـک

کەوتبووە سەر خەیاڵێک
دەیگوت بەڵکو لەو ناوە
شەتڵە کلک چەقاوە
دەیڕوانی و بۆنی دەکرد
هەر بیری کلکی دەبرد
خاوەن زەوی پێی زانی
دەست بە تێلای گاوانی
کەری کوتا خوری شۆر
لەخوێن سووربوو ملی بۆر
سەر بەرەژێر لێی خوڕی
دوو گوێی لە بندا بڕی
کەری بێچارەی زەبوون
کلک نەبوو گوێشی چوون

***

## زەنگی مشکان

کۆوەبوون مشکی مالان
لە نەنک و مام و خالان
کلک باریک و چاوزیت
لمبۆز درێژ و گوێ قیت
بیریان گەڕ و گزی بوو
زەنگۆڵێکیان دزی بوو
گوتیان بێ هەست و چرپە
دەیخەینە کلکی گورپە

هەرکاتێ دەرچێ بۆ ڕاو
زەنگوڵە دەیکا بە قاو
بە خۆشاردنەوە فێرین
گورجێ خۆمان وەشێرین
لەبەر ئەو دەنگە زەنگە
مام گورپە کاری لەنگە
ناتوانێ مشکێ بگرێ
بۆ خۆی لە برسان دەمرێ
ئیتر دەژین وەک پاشا
لە کەندووی نیسک و ماشا
هەڵمەت ئەبەین وەک شێران
بۆ بژیوی جووتێران
هەمبانان دەدڕێنین
کەشک و نان دەقرتێنین
ئەگەر نەما پشیلە
مشکان تلی لی لی لە

***

مشکێ چاویلکە لە چاو
زۆر جیهان دیدە و گەڕاو
سمێڵی سپی و درێژ
وریا و زۆرزان و کەم بێژ
دار گۆچانێ لە دەستا
هەستا لە کۆڕ هەڵوەستا

وتی: ئەی برا و خوشکان
پیر و ڕیش سپیی مشکان
مێشک و کۆن و ڕزیوە
بۆ ئەو زەنگەو دزیوە؟
ئێستا کێ وا ئازایە
خۆ باوێتە بەڵایە
بیخاتە کلکی پسیک
ئیتر نە خرتە و نە جیک
مشکان کردیان بڵاوە
زەنگیش لەو ناوە ماوە
کەوتە دەستی منداڵان
گوتیان: تاڵان هەی تاڵان
هەرکارێ دەست پێ دەکرێ
بیری دوارۆژی نەبرێ
وەک زەنگی مشکی لێ دێ
داخوا بەهرەی بۆ کێ بێ!

***

## کەوە شەلە

سەرداری بۆکان عەزیز
خانی سەربەرز و بەڕیز
دیتی کەوێک دەفرۆشن
کڕیاری زۆر لە جۆشن
پرسی: چۆنە ئەو کەوە؟

وا لـــــه دەوری هـــــەو هـــــەوە؟
گـــــوتیـــــان: کـــــەوێکی ڕاوە
کــــــــــــەوی بـــڕی لـەو نــاوە
کـــــەوەشــــــەلەی بەنـاوبـانـگ
نـرخی بـۆکـــــانە شـــــەش دانـگ
هەرگـــــیــــز بینـی تەنـگ نابـێ
لە قـــاســـپـــە بێ دەنـگ نـابێ
وتـی نـامـــــــــــــە بـە پـەلـە
بـۆم بـکـڕن کـــــــەوە شــــــەلە
چـل زێـڕیـان لـەســــــــــەر بـژارد
کـــەویان بەســـەردار ســـپـــارد
خـــان هەڵـیـــپـــســـاند ســـەری
ڕووی کــــــــــــردە دەوروبــەری
گـــــوتـی: کـێ هـاوڕەگـــــەزی
بـداتـە دەسـت نـاحــــــــــەزی
پـاداشـی ســــــــــــەربـڕیـنـە
نـەک وا بـەزێـڕ کــــــــــڕیـنـە
هـۆشـت بـێ، کـــــــوردی هـەژار
گـــــەلـت مــــەدە دەست نـەیـار
***

## هەویری بەموو

ڕێویەکی پیـــــری بەفــــــێڵ
وتی بە یـەکی جـــــحـــــێڵ

تـاژیـەک هـەیـە ئـاشـنـامـــــــــە
وا بـۆم نـووســـــیـــــوە نـامـــــە
بیـــــــبـــــــە و وەلامـی بێـنـە
ســــەد کــــەوم لێ بســــتــــێنە
جــــــــــوانـە ڕێـوی پـێـکـەنـی
گــــــــــوتـی بـەڵـێ ئـەزبـەنـی
هەویرت بێ مــــوو نیـــــیـــــە
چەقـــاڵـتـــەت بێ لوو نیـــیـــە
کـــــرێی زۆر و کــــاری کــــەم
مـن خـــــــۆم دەبـێ تـێی بـگـەم
تۆ گــــۆشـت کــــەو نادەی بـەمن
گـــــۆشـــــــتم دەدەی بـە دوژمـن
***

## ڕێوی بەفیشاڵ

ســــــــــەر لـەبـەیـان تـاو هـەڵات
مــــــام ڕێـوی لـە کــــون دەرهـات
لـە ســـێـــبـــــەری خـــۆی ڕوانـی
بـــە درێـــژایـــی و بـــە پـــانـــی
خــــــــــۆی ئـازا هـاتـە بـەر چـاو
دەســــــتـی کـــــرد بـە چـاووڕاو
گــــــــــوتـی: وا بـۆ ڕاو ئـەڕۆم
هیـچ نـەبێـت شـــێـــرێک ئەخـــۆم
گـــــەلێ کـــــردی مـــــڵـــــومـــــۆ

تا ڕۆژ هاتە نیوەڕۆ

سێبەر گەییە بەرسنگی

هیچی نەکەوتە چنگی

دیتی زۆری برسییە

دەیگوت: تەماح باش نییە

هەر مشکێکم دەس کەوێ

بەسمە و زگم دەسرەوێ

خەیاڵ جێی نان ناگرێ

شێر بە ڕێوی ناخورێ

***

## ملی درێژ مێژووە

گا و وشتر و بەرانێک

تووش بوون لەڕێ بەنانێک

لەناویان بوو بە کێشە

بۆ خواردن کێ لە پێشە؟

پێک هاتن کێ زۆر ژیاوە

خوا ئەو نانەی بەو داوە

بەران گوتی: من پیرم

لەگەڵ بەرخێک هاوشیرم

خوا ناردی بۆ ئیبراهیم

وا ئەو مرد و من ئەژیم

گاجووت وتی: قاوەقاو

لە دەمتایە شیری خاو

من زۆر چەنەی لێ نادەم
زەویم کێڵا بۆ ئادەم
وشتر سەری دانەواند
بە گازێک نانی ڕفاند
گوتی: مێژوو نازانم
ئاواتە خوازی نانم
ئازان؟ مێژوو بخوێنن
پارووم لەدەم دەرێنن

***

## داوەڵ

لە داوەڵێکم پرسی:
بۆچ دەنوێنی مەترسی؟
چوێلەکان هەڵدەفڕێنی
چ سوودێک وەگیر دێنی؟
گوتی: هەرکەس وەکو من
پەڕۆ و پاڵە سەر و بن
مێشک و دڵی کڵۆشە
ترساندنی پێ خۆشە

***

دیمەوە ساڵی دوایی
لەو چۆڵە بە تەنیایی
پشتی بەخەم چەمابوو
فیشاڵی لا نەمابوو
تیتاڵ بڵاو گێلانە

بۆ قـــــەل ببـــــوە هێـــــلانە
ڕادەژا و دەلـــــــــــــــــەراوە
ورتـــــەی بـــوو بــــە دەم بــــاوە:
خـــــۆم بەخــــتـــــەوەر دەزانم
پـەنــاگـــــــــــــای هـــەژارانم
***

## دەرسی بەچەپۆک

مـــام گـــورگ و شـــێـــر و ڕێوی
ڕاویـان دەکـــــرد لە کـــــێــــوی
سێ کـــەروێشـکیـــان ڕاوکــــردن
بۆ لانەی شــــــێــــــریان بـردن
مـام شـێـر فـەرمـووی: گـورگی پیـر
تۆ لێــمــان بەشکە نێــچــیــر
گـــــــــــورگ وتـی: سێ لاشـن
هەر یەک بۆ یەکـــــمــــان باشن
شـــێـــر تـوڕە بوو کــــەفی چاند
چـەپـۆکـی بـۆ داوەشـــــــــانـد
چـەرمـی پـشـت و نـاوشـــــــانـی
داتـەکــــــانە ســـــــەر ڕانـی
ئەمـــــجـــا ڕووی کـــــردە ڕێوی
وا بـاشــــــە تـۆ بـاخـــــێـــــوی
گـــــوتـی: یەک بەر قلیـــــانت
یەک بۆ شــــێـــوی شــــێـــوانت

یەکێش بۆ سەردەمی خەو
بێ شێو سەر مەنێوە شەو
وتی: ئافەریم ڕێوی
ڕبە و گەز باش دەپێوی
زۆر باشت بەش کردووە
لەکام فێرگەت خوێندووە؟
گوتی شاهم وا نەبووم
پێشوو وا زانا نەبووم
فێربووم بیری ورد و دوور
لەلای مەلای کەوڵ سوور
***

## سواری مار

بێ هێز بووە ماری پیر
نەیتوانی بچێتە نێچیر
سۆمای چاوی نەمابوو
باوی ڕاوی نەمابوو
خشی بە وردە لۆقان
تا گەییە ئاغای بۆقان
دەستی ئاغای ڕامووسی
دایبەستە زمان لوسی:
ئاغای گران و گەورە
کێ وەک تۆ سایە چەورە؟
بۆقی وەک تۆم نەدیوە

جـــیـــــهـــــان بـێ تۆ هەتیــــوە
ئـەز گـــــۆری گـــــەرچی مــــــارم
هـەر بـێ فـــــــەڕی بـوو کــــــارم
بــەڵام لــەمـــــــــــــڕۆ بــەولاوە
گـــــــەزنـدەیـیـم نـەمـــــــاوە
ڕاوی جــــــــانــەوەر نــاکـــــــــەم
بەدڵ بـە نـیـــــــازی چاکـــــــەم
داڵــدەم بـدە لـەلای خـــــــــــۆت
بمخـــــە ژێر خـــاک و پـای خــــۆت
بـیـکـە سـنـدووقـی ســــــــــەرت
بم کــــــــــــە بــە بـارەبــەرت
ســـــــوارم بـە بـۆ ســـــەفـــــەرێ
بـا گــــــــــــونـاهـم هـەڵـوەرێ
***
بۆ قــــــاغــــــــا بەو هەڵـدانە
هەڵمــــســـــــا وەک هەنبـــــانە
بۆ قـــــەتی لەبیـــــر نەمــــــا
لەدڵیــــــا گـــــەڕا ســـــەمـــــا
وتــی: ئـافــــــــــــەریم، زانـای
جــــێم لەلای خــــۆم بۆ دانای
تـۆ مــــــــاری خـــــــانـەدانـی
دام و دەســــــــتــــــوور دەزانـی
چـیـت نـیــــــــــازە بـا وابـێ

ئاغاش با دڵاوابێ
تۆ بێیتە بەر ئاوزەنگیم
ببی بە ئەسپی جەنگیم
ئەبێ هێزت تیا بێ
ئەمەش بێ بژیو نابێ
مووچەت دوو بۆقی قەڵەو
یەکت بۆ ڕۆژ و یەک شەو
***
مار بوو بە ئەسپی ئاغا
بۆ گەشت و گەڕ لە باغا
ڕووی لە هەر شوێنێ ئەکرد
بۆق کڕنووشیان بۆ ئەبرد
بەقیر و هۆڕ لە پێشا
هوڕایان بۆ ئەکێشا :
بۆقاغا سواری مارە
چینی بۆق باری بارە
***
بۆ مار هەڵکەوتبوو هەل
ژینی خۆش، تێر و تەسەل
لەسەر دوو بۆقەی مزی
لەولا و لەم لاش ئەیدزی
هێدی هێدی لێی خوری
تا قڕەی لە بۆق بڕی
ئەوسا وتی: ئاغای خۆم

کەست نەما تۆ ئەخۆم
جیقە و فیقەی پێ ناوێ
ژیان لەدڵ دەراوێ
بۆقاغا تا پێی زانی
مار کەوتبوە قووت دانی
لە مردنا بێچارە
دەیقیراند: مار هەر مارە!

***

## کەری بێگار

کابرایەکی زۆر ترساو
پشووسوار ڕەنگ بزرکاو
بەغار ڕووی کردە ماڵێک
خۆی کوتا بن هەرزاڵێک:
هاوار پەنام هێناوە
زۆر پیسم لێ قەوماوە
بەکەس مەڵێن وام لێرە
خاوەن ماڵ پرسی: خێرە؟
گوتی: دارۆغەی خونکار
کەران دەگرن بە بێگار
من ئەگەر چی پیاویشم
زانا و خاوەن ناویشم
بەڵام لەلای ئاغامان
نە ڕامانە و نە ئامان

هیچی لەبەر چاو نییە
فەرقی کەر و پیاو نییە
دوور نییە دارۆغەی شار
پشتم بخاتە بەر بار
زانا لەلای لاساران
دەبنە کەری بێگاران

* * *

## پەشیمانی پینەیە

ڕانکە شڕێکم هەبوو
لا بوزگوڕێکم هەبوو
کوڵکەی بزنە شینە بوو
پڕی پەڕۆ و پینە بوو
هەموو ڕەنگی تیابوو
کەمتر شینایی مابوو
نێفەک تەنگ و دەلینگ فش
هەر دەجووڵام جڕوخش
قۆشێک لەو دراوێ لەم
سەریەکم نا زۆر و کەم
ڕانکێکی تازەم کڕی
بۆخۆم ئەندازەم بڕی
زۆر تەرز و ڕێک و لەبار
نیوەی چوو ناوی هەژار
بەنیازی چۆغە و کەوا

شـــــەوێـک نوســـــتم، لـەخــــەوا
ڕانــکــی گـــــــــــۆریـن هــاتـه لام
پاشی شـــــەو بـاش و ســــــەلام
وەک قـــــــــەرەچ و ســـــــــازنـده
مـلـی نـا لـه گـــــــــــازنـده:
چـاکـــــــــــەت لـه چـاوا نـەبـوو
کـــــەی کـــاری پـیـــــاوانـه بـوو؟
چەنـد ســـــــاڵێـک هەواڵـت بـووم
یــــــاری ڕۆژی تـــــاڵــــت بـــــووم
بـــا تـــۆزێـــکـــیـــش دڕاو بـــام
با کـــــەمــــــتــــــر لەبەر چاو بام
بــــه پــــیــــنــــه چــــارم هـــەبــــوو
کـــــــــــەڵـکـی هـەژارم هـەبـوو
بـەڵام خـــــــــۆت بـلـەوەز بـووی
لــــــه دروونــــــەوەم وەڕەز بــــــووی
چـوومــــــــــــه لای بـەرگـــــــــدروو
کـــــــونـبـــــــڕ کـــــــرام بـه پـنـوو
بـوومـــــــــــــەوە ڕانـکـی لـه نـوێ
وەســــــــــتــــــــــاژن بـەمـن دەنـوێ
وەرە بــــــەشــــــکـــــــو بمـــــــکـــــــڕی
پـێـم خـــــــــۆشـــــــــه تـۆ بمـدڕی
ئـیـــــتــــر ئەوجــــار وەک پـێـــــشـــــان
نابمه مـــــایەی ســـــەر ئـێــــشـــــان
***

وتم ڕانکی ڕەگەز شین
کۆنە هەواڵی پێشین
تۆش وەک هەواڵی مرۆ
دەستم مەبەستە بە درۆ
یارن بە چەوت و لاری
چالاکن لە بێ باری
وەک تۆ شڕ و کون کونن
سەر دۆستی بن دوژمنن
کە خۆمیان لێ دەبوێرم
هی تازە هەڵدەبژێرم
دێن دەڵێن پەشیمانین
وەک دیوتە ئێستە وانین
واتا پینە کراوین
وەک تازە لەبەر چاوین
***
شڕەی کۆنە هەواڵم
پێت وا نەبێ مناڵم
شڕێ پینە وەردەگرێ
چۆن وەکو ساغ بەر دەگرێ
چی بە پەڕۆ و پینەیە
ماڵی کەس نەبینەیە
پنوو کە چوە سەر بوزوو
لەبیر ناچێ شڕبوو زوو

پینەدار عەیب دارە
ناچار بەرگی هەژارە
***

## بەزمی ڕووتی

دەڵێن هەلاکۆ جارێک
دەچێتە دەوری شارێک
دەڵێ لە چووک و گەورە
هەرکەس پێو وایە چەورە
دە لیرەی لێ بستێنن
دڵی هەژار مەشکێنن.
لە بنەوە ناردی پیاوێک
لەشار بگێڕێ چاوێک
دێتەوە دەڵێ: ئاغام
تەواو بەشارا گەڕام
باجدەر بار لە سەر لێون
هی زۆر زل قوڕ دەپێون
دەڵێ کێ بۆتە حاجی
هەزار لیرەیە باجی
کێ لەوان نەویترن
خۆو ئەندازەی بگرن
نامەوێ چیان بمێنێ
جاسووس خەبەرێ دێنێ:
خەڵک کەمیان وەڕەزن

هەر حـــــاجین تـۆزێـک کـــــزن
دەڵـێ حـــاجـــیـــان تـاڵان کـــەن
جـــــا وەرن بـۆم بـەیـان کـــــەن
جــــاســــــووس دێ بـەپـێـکـەنـین
کـــە ئەی خـــانـی ســـەر زەمـین
بــەزمــــــــــێـکـە بـەڵام بـەزم
کــــــەس نـەمــــــا بـڵـێ ئـەزم
کـــەس ئاگـــای لەکـــەس نـیـــیـــە
فـــەرقی شــێخ و قـــەس نـیـــیـــە
تێـک هەڵدانـە و شــــەڕە شــــەق
چڕە و گـــــــوڕە و چەقـــــە چەق
هەڵـپــــەڕکــێــیـــە سێ جــــڕتی
ســــەرچۆپی حـــاجی گــــرتی
قــــازی گــــۆرانـیـــــان دەڵـێ
مــــەملی مــــەمــــۆ و ســـەوزەڵێ
خـــــانی وشــــیــــــار و زانـا
بڵــــیــــمــــەت لە جــیـــهـــانا
دەڵـێ نـامـــــــە بـا ڕاکــــــەیـن
شــــــارێـکی تر پـەیـا کــــــەیـن
بـەزم بـەزمی ڕووتـیــــــــــیـــــــە
هەڵـپــــەڕکـــێی نـابـووتـیـــــیـــــە
چیــــان نەمـــــا لـێی بتـــــرسن
وا لـە خــــۆشــــیـــــان دەڕەقـــــسن

بێنە سەرمان ئەمانە
ڕووت ئاگری بێ ئەمانە
قەت یەکێکمان ناهێڵن
زووکەن بەجێیان بێڵن
* * *

## کوردستان بەهەشتە

زستان ڕۆیی سەرما نەما
دەرچووین لەناو مژ و تەما
سەری کوێستان خاڵ بەڵەکە
جێژنی مامڕێوی و دەڵەکە
قاو و قیژە لەو بڵندە
بەکۆمەڵ دەفڕن باڵندە
بەبێ وچان، بەبێ وەستان
گشتیان دێنەوە کوردستان
پرسیمان لە قولینگ و قازان
هۆی لالۆی گەڕیدەی چازان
ئێوە زەوی زۆر گەڕاون
لە زۆر جێگادا زۆر ماون
لە هەوار و شار و دێیان
کوێ خۆشترە لەگشت جێیان؟
پێیان گوتین کەسی خالان
شەکەت بووین لە لاق و بالان
جیهانمان گشت پشکنیوە

وەک کــــوردســـــتــــانمان نـەدیوە

جێ نین خـۆشـتـر لە نیـشـتـمـان

کــوردســـتـــانە بەهەشـــتـــمـــان

***

## دەمی نایگاتێ

هێـــــــشـــــــووی ترێ بـەدارەوە

ڕێـوی دەیـدی لـە خــــــــــوارەوە

دەیــزانــی دەمــی نــایــگــاتــێ

ئـــارەزوو تـــرێـــی نـــاداتـــێ

پێ هەڵـچـــوونـیش بۆی ناکـــرێ

دەیگوت: زۆر ترشـــە نـاخــــورێ

***

## هەر تیرەیەکن

گـــۆڕهەڵکەن و کـــفـن فـــرۆش

لە مــەیخــانە هەرتک ســەرخـۆش

دەیـان گـــــوت بـەدەم پـێـکـەنـین

بەیـانیش گـــــۆڕ هەڵدەکـــــەنین

جـــــاویش بۆ کــــفـن دا ئەدڕین

مـــــەزە و بـادەی تریش ئەکـــــڕین

ژنـی خــــاوەنـی مــــەیخــــانـە

دەیگوت: چەنـد باشـن ئـەمـــانە

یـاخـــــوا بازاڕیـان گــــەرم بێ

گـــۆڕســـتـــان هەر پڕ تەرم بێ

مـــیـــوانی وام زۆر بێـــتـــە لا

کـــــورپێژگـــــەم ئەکـــــەم بە مــــەلا
هەریەکن کـــا و چەت و کــڵـــۆش
بێ جـــیـــــاوازین بۆ خـــاوەن هۆش
* * *

## درۆ بە درۆ

ئـاغــــــــا دەتگـوت کـــــــــۆڵـەوەژە
خــــوار و ڕەش و بەگـــــرێ و تەژە
دەســــــــــتـی ڕژد و نـان نـەدەر بـوو
مـــیـــــوان بۆ ئەو دەردی ســـەر بوو
بـاتـووی کـــــەر و بـاینـجــــــانـی
لـــە نـــەزانـــی یـــەک ئـــەزانـــی
شـــاعـــیـــر شـــیـــعـــری بۆ دانابوو
بـــــەرەو ئـــاوەژووی ڕانـــــابـــوو:
مـــانگ لە جـــوانیت شـــەرمـــەزارە
نـانـخـــــــــــــۆرت هـەزار هەژارە
بـەژن و بـاڵات ســــــــــەوڵـی تـازە
چاوت چاوی ســــــەقـــــر و بـازە
کــــەس لێــــتـــان وریاتر نیـــیـــە
زیـرەک و زانـاتـر نـیــــــــــیـــە
ئاغـــا زۆر لێی خـــۆش هات ئەمـــە
کـــەوتە بەزم و گـــەپ و گـــەمـــە
وتی: فـــەرمـــوودەت دڵ گـــیـــرە
دەم خـــــۆشـــــانـەت هەزار لیـــــرە
* * *

شـــاعـــيـــر هەر مـــا و پارە نەبوو
هـــاوار نـــەبـــێ چـــارە نـــەبـــوو:
ئاغـــا لـيـــرەكـــان پێم ناگـــەن
فـەرمـووی پێم سـەيرە تێم ناگـەن؟
تـۆ دڵخـــــۆشـت كـــــردم بـە درۆ
مـنـيـش لەو مـــــــاڵە دام بـە تـۆ
درۆمــــــــــــــان بــە زۆران داوە
دراو بـــــێ نـــــاوە لـــــەو نـــــاوە
نـــــرخـــــی درۆ هـــــەر درۆيـــــە
وەرامی گـــڵـــمـــەت كـــڵـــۆيە
***

## بەلاف پێک نايە

پووشێ كـەوتە سـەر مـيـزی كـەر
مـــێـــشـــوولـەيەكی پەڕيە ســـەر
دەيـوزاند: گـــەمـــيـــوان خـــۆمم
مـــــــەلـەوانی هـەزار گـــــــۆمم
لـە دەريـای بـێ بـن دەگـــــــەڕێـم
نـاتـرسم گـــــەرداو بێـــــتـــــە ڕێم
كـوا (مـاجـەلان) و (دێ جـامـا)؟
كـێ ئـازايـە بـێ بـەلامــــــــــــا
(كـــريســـتـــۆڤـــەر) شـــاگـــردم بوو
گـــەمـــيـــەكـــەشی دەسكردم بوو
خـــۆی هەڵكێـــشـــا لەبەر خـــۆوە

تا مـــــيــــــزەكـــــەر وشك بۆوە
لـە تـونيـــــــان دەگـــــــەڕا بـێ ئـاو
بلاوەی کـــــرد خـــــەیالـی خــــاو
***
## وێرانەیە یان ماڵە؟
پارسەكێک خۆی کوتایە هەیوانێک
وتی: برســـیم لەڕێی خــودا نانێک
خــاوەنی مــاڵ گــوتی بڕۆ نیـــمــە
وتی: ســا چۆڕە ئاوێ توونیـــمـــە
گــوتی: ئاومـــان نەمـــاوە لاچۆ بڕۆ
وتی: بۆ پینە بزگـــــوڕێک لە پەڕۆ
گوتی نیمە. وتی:کوتێک بەن و داو
گـوتی: بەس بای بدە خـەیالی خـاو
وتی: وام زانی مـــــاڵە ئێـــــرانە
لـێم گـــــــــەڕێ با بـڕیمە وێرانـە
من لەلام وابوو خـــاوەنی مـــالـی!
تۆش لە وێرانە زگ ئەكــەی خــالـی
تـووڕێ هـەڵبـگرە دایـنـێ ئـەم پـۆزە
وەرە وێـکـڕا بـچـــــــینـە دەریـۆزە
***
## هەڵە لە چیدایە؟
یەکێ لای قــازییــەک شکایەتی کـرد
بۆ ســمـێڵ چەوری کـووپە ڕۆنی برد
کــووپە تا مل لە مــشکی ئاخنراو

چنگە ڕۆنێک لەلای سەر و بەرچاو
نیازی پێک هات و نامەیان دایە
قازی لایە و کەسی دەڕۆست نایە
کووپە ڕۆن دەرکەوت، فڕوفێڵە
سەرەوەی ڕۆنی ڕوون و بن لێڵە
ڕایسپارد نامەکەی هەڵەی تێدا
بێنێ پاکی دەکەم پەڵەی تێدا
وتی عەرزی کەن ئەم هەڵە و پەڵەیە
نە لەلای ئێمەیە، لە کووپەڵەیە
هەر زلێکی بە چەوری دەس بڕ بێ
چاکە ورگی لە خۆڵەمێش پڕ بێ
***

## سەرچاوە سوێرە

میری کۆر دیتی جل شڕێ دژوێن
میری گرتۆتە بەر بە تووک و جوێن
خوایە دەور و دووکانی وەرگێڕی
چی لەدەس نایە میری وا خوێڕی
کوڕی دارۆغەیێکی لێی داوم
خوا هەڵێنەگری زۆری لێ کراوم
پرسی: جا مووچەخۆر بە میری چی؟
دۆ تراوە و ترش بە شیری چی؟
لە وەرام ئەو هەژارە دڵ ژیرە
وتی: زنجیرەیە و لەیەک گیرە

دەست و پێ جۆیە، مـیـرە سـەرچاوە
تامـی ئاو هـەر یـەکـــــە لـە هەرلاوە
ئاوی کـانی کـە شـیـرن و خـۆشـە
گـەر لە ناوجـۆشـە خـۆشـە بینۆشـە
ئاوی جـــۆ تاڵ و بۆگـــەن و ســـوێرە
دیارە سـەرچاوە پیس و بێ خـێـرە
مـیـر تکاندی لە چاوی ئاوی سـوێر
مەرجە فەرمووی نەمێنێ میری کوێر
***

## هاواری لەسەرە

کـــاروانێک شــەوێک لە چۆڵێکا
بنەیان خـست لە شـیــو و دۆڵێکا
شـەکـەتی ڕێگە بوون دەبوو بخـەون
ترسی زۆریش بوو بەر دزی بکەون
بوو لەگـەڵیـان یەکـێکی پیـری هەژار
گـوتی: هەر چاروێدار و خـاوەن بار
یەکی زێـڕێک بدا بەمـن بخــــەوێ
پاسـەوانتـــان دەبم تەواوی شـەوێ
دز کـە هات دەیکەمـە هەرا و هاوار
مەرجی من هەر هەرا و لە ئێوەش کار
نیـــوەشـەو دز گـەیشت و مـاڵی برد
تاو هەڵات مـامـە پیـرە بانگی کـرد:
مـــاڵو وێران بێ مـــاڵ نەمـــا ڕابن

چۆن دەزانن ئەوەند لە خـــەودابن؟

***

کـــــــە دەبیـنن هـەچی بـوو دزراوە
پیـرەیان گـرت بلّێ: چە قـەومـاوە؟
وتی: هیچ نەبووە! نیـوەشـەو سێ دز
زرتەبۆز و ســــمـــێڵ فش و چاوبز
یەک جوان، یەک نێوان، یەکێکی پیر
دەس بە ڕمب و کەوان بە تیر و شیر
گەینە سەر سەرم و گرتیان مشتم
گەر نقەم لێ دەهات دەیان کوشتم
مـاڵەکـەم دانێ خـۆم بکەم ڕزگـار
وا قـــەرزداری ئێـــوەشم: هاوار
شەو لە ترسان کە نەم بوو هاوارێک
فەرموو ئێستا هەزار لە جێی جارێک
قوولە قوولی لەپاش گورگ ئەمەیە
پەژیوانی دەمی مـەرگ گـەمـەیە

***

## دزی جادوو

خـــاوەنی مـــاڵ وتی بە کـــەیبـــانوو
هەست ئەکـــەم وا دزە و لەبان خـــانوو
وەرە با ڕێک بخـــــەین تەڵە و داوێک
بەشکو مـــامـــدز بخـــەینە گـــەرداوێک
ژن بەدەنـگی بەرز کـــــــە دز ئەژنەوت
پرسی: ئەم گەنج و زێڕە چۆن دەس کەوت؟

وتـی: نـازانـی مـن دزی جـــــــــادووم؟
بۆ دزی مــــــانـگەشــــەو نەبا نەئـەچووم
دوای ئـەوەی نـاوی شــــــــــەولـم هـێـنـا
بـاوەشی خــــــۆم لە تـیـــــشـکە وەردێنا
بـەو ترێـفـــــە ئـەچوومــــــە ژێر بـۆ ژوور
گـــــورجـێ دەم ئاخنـی چ تێـــــڕ و چ توور
دوو هەلـیش شـــەولم ئەگـــوت لەوســـەر
تیـشکی مـانگ سـەریەخـسـتـمـەوە بۆ دەر
دزە لای وابـوو خــــێــــوی مـــاڵ خـــەوتن
کــــەوتە ئامـــــادەبوون لە ڕێی کــــەوتن
شــەولی گــوت لە تیــشکی مــانگ هاڵا
پشــتی کــێــشــا بە تەخــتی ناو مــاڵا
دوانـی تێـــــڵا بـەدەس لە ڕاست لە چەپ
کـــوێندەرێت دێشی دەیکوتن تەپ و ڕەپ
دزی بـێ نووزە خــــــوێـن وەبان دمــــــەوە
خـــەونی خــــۆشی ئەدین بە شــــەولەوە
کــــــــــــار و زانـین نـەبـێ لـە ئـارادا
ســــــەد نـزا و جــــــادوو بەهـرەیەک نـادا
***

## باوکی

دوێنێ گــوێم لـێ بوو ئـەحـمـەقێ ئەیگوت:
بـاوەگـــــەورەم وەزیری خــــــان بـووگــــــە
گـــەرچی پێم وابـوو زۆر درۆی فــــەرمــــوو

با فـــــەرز کـــــەیـن درێژ و پان بـووگـــــە
هیـچ کـــەست دیوە گـــوو بنێـــتـــە دەمی
بێـــژێ ڕۆژێ ئەمـــیـــچـــە نـان بـووگـــە
***

## لە مەرد ئەگەڕێ

فـــــەیلەســـــــووفێ هەبوو لە یۆنانا
ڕۆژ چرای هەڵ دەگـــــرت بە کـــــۆلانا
دەگــــــەڕا درز و قــــــوژبـنـی عــــــەرزی
وەک یەکـــێک ون بکا بە شــــەو دەرزی
تازە لاوێک بە گـــاڵتـــــە پرسی لێی
مـــامـــە بە چرا و بە ڕۆژ لە چی دەگـــەڕێی
گـــوتی: ڕۆڵەم بە خـــۆم و بە چراکــــەم
دەگــــەڕێم بەشکە مــــەردێ پەیداکــــەم
***

## ژن و سەماوەر

ژنەکی کـــــۆر لە گـــــوندی لـۆلان بوو
دووره دیده و هەتا بڵـــێی جـــوان بوو
ســـۆفـیـــیـــەکی شـێخ ڕەشـیـدی لۆلانی
ڕۆژێ لای شـــــێخ بە دەرفـــــەتی زانی
وتی: گــــەرمن لە خـــۆمی مـــارە بکەم
ســـوێند ئەخـــۆم دەردی چاوی چارە بکەم
ســـیـــســـە ســـۆفی ژنەی لە باری برد
نە بژیشکێکی دی و نە چاری کـــــرد
شـێخ وتی: ســـوێندی ســـۆفی بە درۆ بوو

گـــوتی: ســـــووچی ســـــەمـــــاوەری تۆ بوو
ئاگــری کــۆر ببـــوو نە خــوست و نە هەست
چاپەزت هاتە پێش و شـــیـــشی بە دەست
لـینگی ڕاکـــرد و خـــۆشی ڕاکـــێـــشـــا
لە کـــونی خـــوارەوەی پیـــا کـــێـــشـــا
چاوەکــــانی گـــــەشــــاوە هاتەوە دەنگ
ڕەژوە ڕەش بوونەوە بە ســـــــوورە پەرەنگ
مـن وتم ژن ســــــەمـــــــاوەرە و کـــــــوێرە
چاپەزی پێ دەوێ و بە شـــیـش فـــێـــرە
هێند خـەریک بووم تیـا چەمـا شـیـشم
وەخــــتــــە کــــوێـرایـیی دایە چاویشم
* * *

## ئەوینی گەورە

چی زۆر بە نـرخـــــە و مـن شکـی ئەبەم
نیـــشـــتـــمـــان بە دڵ پێشکەشــتی ئەکـەم
مـن ئەویـنـی وام بـۆت کــــــــەوتـۆتە دڵ
ئاواڵمـــــە کــــاتێ دەشکەومــــە بن گڵ
ئەوینێ هەرگـــیـــــز ناکـــا پرســـیــــار
تاقی کـــەرەوە جـــارێک نا ســـەد جـــار
ئـەویـنـێ هەرچی تـۆ بـڵــــــێی دەوێرێ
زۆر ئـامـــــــادەیە نرخـی بژمـــــێـــــرێ
ئـەویـنـێک هەرچی هەسی زۆر و کـــــەم
دەڵێ ئـامـــــادەم قـــــوربـانـتی دەکـــــەم
* * *

## چاکە لەگەڵ خراپان

ڕۆژێ دووپشکێ کـــــەوتبــــووە نـاو ئاو
بێ هێـــــز و دامـــــاو وەک نیــــوە خنکاو
ڕەقـــــێکی ئاوێ بـەزەی پـێـــــدا هـات
ویســــــتی لە مـــــردن ڕزگــــاری بـکات
ســـواری پشـــتی کـــرد چوونە ئیــشکانی
دووپشــک هـەلـی بـه دەرفـــــــەت زانـی
گـــوتی: لە مـــــردن کــــردت ڕزگـــارم
تـا دەمـــــــرم بـۆ تـۆ ســـــوپاسگوزارم
کـلکی درێژ کـــــرد نـایە نـاو دەســــتی
گـــوایا بۆ ســـوپاس دەربـبــــڕێ هەســــتی
ڕەقــەش بە پەنجــەی ســەر کلکی کـوشی
بـە پـێــــــــــوەدانـێـک داتـۆڵا لـەشـی
چزووی ژەهراوی هەر گـــەیشــــتــــە لەش
ڕۆژی ڕووناکـی لـێ بـوو بـە شــــــــەوڕەش
وڕێنەی دەکـــــــرد لـە گـــــیــــــانـەڵا وا
بۆ پیـــــاوەتیم کـــرد لەگـــەڵ ناپیـــاوا؟

***

## مشک و مێروو

مـــشکێ وامی کـــرد گـــەنم لە مـــێـــروو
زســـــتـــــانی ڕابرد تـێـــــر و بە ئێـــــروو
هاوین کـــە مـــێـــروو چوو داوای لێ کــرد
ســـەد جـــوێنی پێ دا هەروا وای پێ کــرد

وتی: باریکی ســـــەرزلی قـــــون خــــڕ
بێم  بە گـــــازێکم بتکەم شـــــڕ و وڕ؟
چ ڕێت دەکـــــەوێ گـــــەنمت لای من بێ
من کـەی وام لێ هات مـێـروو تای من بێ؟
مـێـرووی بەسـتـەزمـان چوە لای گـورپەبۆر
گـوتـی خـاوەن زۆر گـورپەی مـشـک خـۆر
پیـــــاوەتیـم لەگـــــەڵ پێ نەزانان کـــــرد
ســووک باریم لەڕووی گــران جـانان کــرد
پشـــیلە فـــەرمـــووی من لە گـــەڵتـــا دێم
تێی دەگـــەیێنم ئەو کـــێـــیـــە و من کـــێم؟
مـــێـــروو لای مـــشـک دایکوتا ســـڵاو
مـــشـک تووڕە بوو، پشی گـــوتی مـــیـــاو
وتی: ئەز گـــــوری، دەســـــەرت گـــــەڕێم
وا چەند لەمـــــێـــــژە لە ڕبە ئەگـــــەڕێم
بۆ خـــــۆم بە کـــــۆڵم بۆت ئەهێنمـــــەوە
قـــورســـە پارســـەنگت بۆ ئەخـــوێنمـــەوە
نەرمی تێنـاگـــا ســـپـــڵـــەی بێ ئەمـــەک
دەبێ نـەرمی کـــــەی بە زۆری کـــــوتەک
***

## کرمی ناوخۆ

چڵـــێک مـــالۆچە لە دار بی هاڵا
ڕۆژێک لە گـەڵیـا دەی کـرد سکاڵا
ئاواڵ! بۆ کـــــزی بۆ ڕەنگت زەردە؟

نه تینووی ئاوی، نه جـێگەت بەردە
بیــــور نـاتبـــڕێ له چی دەپرسی
له کـــڕووســـینەوەی بزن ئەترسی؟
بەرز و ئەســـتـــووری ڕەگت کـوتاوە
دژی و کــــەنەفـــتـی بنێـــرە لاوە
بـڕوانـه مـنـی بـاریـک و بـێ تـێن
هەروا هەڵدەچم گـــەڵا تورت و شێن
ڕێگەی پایزی مـــەرگم له پێـــشـــه
هێـشـتـا وەکـو تو نیـمـه ئەندێشـه
***
به هەناســەیەک ســەری دار لەری
قرچەی له دڵ هات چەند گەڵای وەری
گوتی: ئاودەنگی شۆخ و شەنگی من
لاوێـنـەرەوەی دڵـی تـەنـگـی مـن
ژانم گـــــرانه و نـاســـــۆرم زۆرە
دار کــــه دەقـــەڵشێ له دارە هۆرە
کـرمم تێ دایه و ئەویش له خـۆمـه
له کـــــرتاندنی ڕاهێڵ و پۆمــــه
هەر دارێ کـــرمی لەناو خـــۆی دایه
دەشکێ و دەکـەوێ به سـووکـه بایه
***

## پشوو درێژ

کەرێکی نەخۆش خەریک بوو دەمرد
بەشـــدار له دیاری چاوێری دەکـــرد

دەیگوت بتۆپی گۆشتەکەی دەخۆم
سەگ دەیگرنەوە ئەگەر من بڕۆم!
لە کەر گران هات دیمەنی گەماڵ
وتی: چوارپێ بەگ تۆ بچۆوە ماڵ
من تیرەی کەرم زۆر گیان لە سنگم
فریوت نەدا هەناسەی تەنگم
هێشتا بۆ مردن دوو مانگم ماوە
سەگ زۆر لە سەرخۆ وەرامی داوە:
منیش نەتەوەی پشوو درێژم
وا لێرەم هەتا گۆشتت ئەچێژم
***

## جێ ژووان

ڕاوکەر لە ڕاوا لە دەشت و دەردا
دوو ڕێویان هەستاند تاژیان تێ بەردا
مێ بە نێری گوت: با جوێ بینەوە
جێگایەک دانێ تۆ بمبینەوە
وتی بە سەرچاو، منیش پێم خۆشە
جێ ژووانمان دەزگای کەوڵ فرۆشە
***

## ئایەتی گۆپاڵ

بۆ سەفەر ئەچوو مەلای مەزمووره
دەشیگوت ڕێگام گوندێکی دووره
ژنەکەی وتی ئایەتەل کورسی

بۆ تۆ زۆر باشــه له ســەگ دەترسی
ئەگــەر بۆت هاتن بۆیان بخــوێنه
گــوتی: عــافــرەتێ بەسم بدوێنه
ســەگــەلی لادێ نەخــوێندەواره
له قــورعــان ناگــا چاره هەر داره
سوورەی گۆپاڵیان لەسەر دەخوێنم
ئەگەر تێم نەگەن دەمیان دەشکێنم
***

## بایەک

یەکێ له برســان نەک فــێڵ بازانه
له جــێــیــەک دزی مــســتێ ڕازانه
خــاوەن ڕازانه بە کــاریان زانی
بە دار و قــامــچی بەربوونه گــیــانی
کابرا شل و کوت بەسەد کەوت و ڕەوت
ژان لەلەش، لەزگ خۆی کوتا مزگەوت
ناڵه و هاواری خــســتــه هەر لایه
بژیشکێ گــوتی: دەرمــانت بایه
ڕازانه بایه بە با دەر کــــــردن
ڕزگــاریت دەبێ له چنگی مــردن
نەخــــۆش دەتلاوه بە ئاوات باوه
تا فــــەرداهی ڕۆژ هەر دەپاڕاوه
نــزای نــاڕەوا بــای دەر نــەهــێــنــا
بە ناهومــێــدی ســەری هەڵێنا

گــوتی: خــودایه وا دیاره دەمـــرم
بـۆ ئـاواتـێ تـر داوێـنـت دەگـــــــرم
له پاش مـــــردنم بـەهەشـــتم دەرێ
هۆری و هەنگوین و ئاوی کەوسەرێ!
یەکێ ئەمـەی بیـست لێی هاته وتار
گـوتی: هەی گـێـژی زۆر بێـژی لاسـار
لێی پاڕایەوە ســەر لەبەر شــەوێ
تری نەدایـەی بە هەشـــتت دەوێ؟
کــەسێ بۆ بایەک دەنگت نەیگاتێ
هۆری و هـەنـگوینت چلـۆن دەداتێ؟
***

## ڕێوی و کەڵەشێر

ڕێوییـــەک دەگـــەڕا مـــڵـــومـــۆی دەکــرد
هەر چاوەنـۆڕی ڕۆزیـی خــــۆی دەکـــــرد
کــەڵەشـــێــری ســوور دوور هاتە بەرچاو
پاش چاک و چۆنی و ڕۆژباش و ســـــڵاو
پـێی وت: بـەهەشـــــتی باوکت برام بـوو
یـان مـن لای ئـەو بـووم یـان ئـەو لـە لام بـوو
دەنـگ خـۆشی وەک ئەو کــوا دەبێـــتـــەوە
هیچ کـــەڵەبابێک جـــێی ناگـــرێتـــەوە
کــــەڵەشــــێــــر وتی: ڕێوی چە ئێـــژی
خــۆت هەڵە ئەکـەی یان گـێل و گـێـژی؟
ئاواز خــــۆشـــــتــــرم گـــــەلێ لە باوە

ناوبانگی دەنگم گەیوەتە لاوە
چاوی قووچاند و باڵی پێکادا
ڕێوی بە قەپێک کڕکڕەی بادا
بردی و قیڕاندی و پێی زانی خێوی
سەگەلی بەردا شوێن پیرە ڕێوی
کەڵەشێر وتی: ئەگەر دەتەوێ
چیدی گەماڵ گەل وەدووت نەکەوێ
بێژە وەخێوم با دڵنیا بێ
بۆخۆی پێی خۆشە لەگەڵ منا بێ
ڕێوی بۆ وتار دەمی کەوتە کار
کەڵەشێر بەغار پەڕیە مازودار
ڕێوی بانگی کرد: بەڵام لە زارێ
بە بێ کات جارێ هاتە وتارێ
کەڵەباب گوتی: با کوێر بێ چاوێک
لە ڕووی دوژمنان لێک نرێ تاوێک
***

## ڕەقە و مراوی

جووتێک مراوی ساڵێ لە چۆڵێک
هێلانەیان بوو لە نزیک گۆلێک
ڕەقێک بۆیان بوو بە دراوسێ ماڵ
زۆری پێ نەچوو زۆر بوون بە هاواڵ
کاسە جیرانیان بۆ یەکتر ئەبرد
شەو و ڕۆژ یاریی یەکتریان ئەکرد

ئەوان لەسەر باڵ دەیانکرد سەیران
ڕەقە لەبەرماڵ دەبووە پاسەوان
زستان خۆی نواند بەڕووی تاڵ و مۆن
باڵدار ناچار بوون بۆ گەرمێن بڕۆن
ڕەقە دەستی کرد بە شین و گریان
جەرگی ئاسنی بۆ دەبوو بریان:
سەر سەوزی ڕەنگین بورچینی نەشمیل
لە دەوری ئێوە دەگرم دیق و سیل
وەک باوکی وسوو مەمکەن پیر و کوێر
منیش هەڵگرن دێمە گەرمەسێر
ڕەقە گازی گرت لە دارێکی سووک
هەردوو سەریان گرت باڵدار بە دندووک
فڕین لە دەشتان لە چیا و نوالان
چاویان پێ کەوتن ژن و منالان
وتیان: مراوی چەند بە فریوە
ڕەقەی هەژاریان بەدار دزیوە
ڕەقەی ڕق هەستاو لەم گفتوگۆیە
زاری کردەوە و گوتی: درۆیە
ئیتر سەرەوژێر بۆی هاتە خوارێ
کەوتە نزارێ ناو بەرد و دارێ
خوێنت هەڵ نەچێ بەگفتی بەدکار
نهێنیی دڵت مەهێنە سەرزار

***

## مێشک و دڵی نییە

شــێــرێک نەخــۆش بوو ژان لەدڵ و ســەر
وتیــان دەرمــانن مــێــشک و دڵی کــەر
وتی بە ڕێوی: کــــەرێک پەیداکــــە
بەشم مــێــشک و دڵ بەشت کــەلاکــە
ڕێوی چووە لای کــەر گــوتی: کــەری ژیر
وەرە بۆ لای شـــێـــر دەتکا بە وەزیر
کــەوتە دووی ڕێوی دڵخــۆش دەیزەڕاند
شــێــر لێی ڕاپەڕی ملی تێک شکاند.
گــوتی: من دەڕۆم دەست و پەل دەشــۆم
چاوەنۆڕی تۆم مــێــشک و دڵ بخــۆم.
ڕێوی بە هەڵپــێک مــێشک و دڵی خــوارد
خۆی لە شێرە بوارد تا شێر لە دووی نارد
کــوانێ مــێشک و دڵ؟ خــۆ نەیبــو پاشــا!
ســەیرە و تەمــاشــا! خــۆم دیم لە لاشــا
پاشــام ئەگــەر کــەر مــێشک و دڵی با
دەبوو فــــیکی خــــۆی زوو بزانیــــبـــا
کــەر و وەزیری؟ کێ بیـــســـتـــوویەتی؟
من ئێــــژم نەیبـــوو، ئێـــژی بوویەتی!
شــێر فــەرمــووی: کــەرێک بەخۆی نەزانێ
ڕێوی ڕاست ئەکــا مــێشک و دڵ کــوانێ؟
***

## قەل و کەو

کەو قنەی دەکرد لەو بەر پەسارە
لەقەل شیرن هات ئەو لەنجەولارە
بێ خۆراک و خەو بە ڕۆژ و بە شەو
دەکەوتە شوێن کەو فێربێ ڕەوتی ئەو
وەک کەو فێر نەبوو چی کرد و کۆشی
لە بیری چۆوە ڕەوتەکەی خۆشی
زۆر کەس لە ئێمەش بۆ لاسای لاوە
وەک ئەو قالاّوە دژ و داماوە

***

## کەر بۆ سەر زەماوەند

کەریان بانگ دەکرد بێتە سەر شایی
کەر هاواری کرد: مالّی وێرانم
وا هەڵ ناپەڕم سەرچۆپیم دەنێ
گۆرانی خۆشیش کەمتر دەزانم
بەخوا دەترسم بمکەن بە ئاوکێش
یان باراشی باش بێتە سەرشانم

***

## خیگە بەری نادا

دوو ڕاوکەر لەچەم دیتیان خیگەیەک
یەک خۆی تێ هاویشت تا دەری بێنێ
خیگە ورچێک بوو کابرای ڕێک گوشی
خەریک بوو بە زۆر پشتی بشکێنێ
ئەمیان بانگی کرد: برا بەری دە

خـــــیگە دۆشــــاوێک هێندە ناهێنێ
گـــــوتی: من هەر زوو خـــــیگەم بەرداوە
ئەو من بەرنادا وا دەمـــــــخنکێنێ
***
## گورگ و بەرخ
گـــــورگێ خـــــوێناوی پەل دەشـــــواتەوە
بەرخـــــێک لەبەر ئەو ئاو دەخـــــواتەوە
گـورگ بانگی کـرد: لێم شلوێ مـەکـە
تووڕەم لەو فـــیـــزەت زۆریم لێ مـــەکــە
وتی: گــورگــاغــا تۆی لەســەرووی من
لێـــخناوی تۆبە دێتـــە گـــەرووی من
گـــــوتی: دەردەکـــــەی پێـــــرار بەهارە
ئێـــســـتـــاش لە شـــاخت لەشم زامـــارە
وتی: من ئەمـــســـاڵ زاوم لە مـــەڕێک
تۆ لە بەهانەی پێم بکەی گـــــەڕێک
گـــــوتی: جـــوێن دەدەی کـــۆنە دوژمنم
دیـــارە پـــێـــت وایـــە مـــن درۆزنم
تۆ تاوانبـــــاری گـــــۆڕت خـــــواردنە
بەهرەت بۆ نادا ئەم خـــــــۆ بواردنە
لەچەنگی گــــــورگـــــا بەرخ هەڵدڕا
ئاوی چەم دەیگوت لەگـــەڵ خـــوڕخـــوڕا:
کـــەی دەبڕێتـــەوە بیـــانووی زۆرداران!
کـــێـــیـــە وەدەنگ بێ لەســـەر هەژاران!
***

## کەر و کەوڵەشێر

کەرێک لەناو پووش لە لێژ و زەنوێر
توشی بوو بە تووش کەوڵی شێری نێر
کەوڵی کردە بەر هاتەوە مالآن
چۆڵیان گرتە بەر ژن و منالآن
کەس نەما لە گوند هەر یەک بە لایە
ڕادەکەن بە توند شێرە و بەلآیە
کەر کەوتە گەشکە گوتی سامەوە
کوا تێر و ڕەشکە بێن بەلامەوە
دەیان دڕێنم دەیان چڕێنم
چنگاڵ بە خوێنم مرۆ گوڕێنم
کەڵ دەترسێنم ڕەنگم ڕەنگی شێر
با بشنەڕێنم بەو دەنگی دلێر
لەسەر سم سەما بە جیفرک دان
بە یادی کەما دایگرتە بەندان
شیو و دۆڵ و دەر دەنگی دایەوە
زەڕەی شینەکەر زوو ناسرایەوە
کەوڵەشێر کرا لوڕ و جل و بەڕ
سەر پشتی خرا باراشی زمهەڕ
دەیکرد وتوویژ لەو سەر ڕێبازە
کە نابێ بەشێر بە بەرگی تازە

* * *

## قەل و بولبول

جارێک بولبولێک لەگەڵ قەلی ڕەش
لەناو ڕکەیەک کرانە هاوبەش
بولبول دەگریا بە بانگ و هاوار
چۆن بوومە یاری هاوسای نالەبار!
بولبول لەگەڵ قەل چۆن ڕێک ئەکەوێ
من گوڵ پەرستم ئەو لاکی دەوێ
جێی من دەبوایە لەناو چیمەن با
بەرچاوم جوانتر چاوگە و دیمەن با
لەگەڵ بولبولان لەسایەی چڵان
بمانخوێندایە بەرەو ڕووی گوڵان
چاوبڕکێنەم با دەگەڵ گوڵی ئاڵ
کەی دەهاتە بیر ئەم ژیانی تاڵ؟
چاوم هەڵدێنم ڕووڕەش دیمەنە
چۆنی بدوێنم دەمی بۆگەنە
گەردوون کردوتم لە ژین هەراسان
دەسا بمدەیە مەرگێ بەهاسان

***

قالاّ و لە بولبول پتر پەشێو بوو
لە بەر چاوی ئەو بولبول دزێو بوو
دەیوت خودایە گوناهم چی بوو
گۆشتی کەرەکەی عیسام دزیبوو؟
کەوتوومە زیندان لەگەڵ ئەم چووکە

ئەو چەقەسرۆیە ئەو هەرزە و سووکە
لەو چەنەبازە، لەو هەڵەوەڕە
مێشک و سەر گێژە گوێم کپ و کەڕە
دڵداری گوڵە کڕیاری بۆنە
زامی پشتی کەر نازانێ چۆنە
چارەم ڕەش بووە وەک پەڕوباڵم
لەو ساوە بولبول بۆتە هەواڵم
ئاخ بۆ ئەو ڕۆژەی منی شۆخ و شەنگ
لەگەڵ چەند قەلی هاودەنگ و هاوڕەنگ
لەناو دێبەران لە دەشت و دەران
قڕقڕمان دەکرد لە دەوری کەران
چارەم لە چارەی بولبولان نایە
زۆر پیس پێوەبووم، مەرگێک خودایە
سەیرە لەو دنیا پان و بەرینە
هەرکەس کاری خۆی لەلا شیرینە

***

## گریان نەک نان

سەگێ لە چۆڵێ خەریک بوو دەمرد
خێوی بە ڕۆڕۆ شیوەنی دەکرد
ڕێبواری پرسی: گریان و بۆ سەگ؟
گوتی مەڵێ سەگ، برای بە ئەمەگ
بڕبڕەی پشت و یاری گیانیم بوو
مایەی دڵخۆشی و کامرانیم بوو

پاسداری ڕەز و پارێزگاری ڕەز
خۆش بەز و بەلەز دەم گەرم و بەگەز
گورگ لە ڕووی ئەو وەک کەوی کولێو
بۆ ورچ ئەچوو وەک گورپە بۆ پیو
ئێستا دەبینم لە برسا دەمرێ
دڵ بەبێ گریان چۆن ئۆقرە دەگرێ؟
پرسی: چیت پێیە کۆڵت گرانە؟
وتی: تێشووم و هەنبانە نانە
گوتی: ناوت نا برای هاوپشتت
نان بە کۆڵتەوە و لە برسان کوشتت؟
گوتی: دۆستیمان هەرچەند بە هێزە
گەرمە و بەکێشە و بەپشت و پێزە
بەڵام تا ئەوجێ نەوینە هاواڵ
لەتۆشەی خۆشم بەشدار بێ گەماڵ
بۆ گریان و شین گەلێ ئامادەم
بێتە باری نان تیکەیەک نادەم

***

## بیخە زمانم

سوارێک ڕادەبرد لەکوێرە دێیەک
پیسکەیەک گوتی: ببە میوانم
گورجێ دابەزی و پرسی: ئەسپەکەم
لەکوێ وەبەستم: ماڵت نازانم

گوتی نەمزانی گوێت هێندە سووکە
من پەشیمانم، بیخە زمانم
***

## لە بەهاری نەهاتوو

لاوە دۆمێک بوو مێردی دووژنە
یەک ناوی: نارێ، ئەویتر: شنە
زستان بوو، دەیگوت: ئەمساڵ بەهارێ
دوو کەوان دەگرم بۆ شنە و نارێ
بوو بە شەڕەژن لەسەر کەوی نێر
ئەو دەیگوت بۆ من ئەم ئەیوت نەخێر
یەکتریان شێلا بە پێلەقە و پێ
هاواریان دەکرد زار و زیچی دێ:
نە بەهار هەیە و نە کەو گیراوە
قژی دۆمەژن گشتی ڕناوە!
زۆر لاوە کوردیش وەک ژنی لاوە
شەڕیانە و هێشتا کەو بە چیاوە
***

## تووتیی کەچەڵ

تووتییەکی هەبوو وردە فرۆشێک
چلۆن پیتۆڵێک؟ چۆن قسە خۆشێک؟
لەبەر گەپجاڕی و گاڵتەی ئەو مەلە
کڕیار کۆمەڵ و کابرا بە پەلە
ڕێی دەستی نەبوو سەری بوخرێنێ
دراو بستێنێ و فرۆشراو بێنێ

ڕۆژێ مام دەروێش چوو بۆ مزگەوت
گورپەیەک ڕێگەی لە دووکان کەوت
کەڵپی چیڕ کردن لە تووتی خواردن
تووتی ڕاپەڕی بۆ خۆ وەشاردن
باز لە پشیلە و لە تووتی فڕە
ڕژایە سەریەک شاتاڵ و شڕە
شووشە ڕۆن بادام داکەوت و پژا
ڕۆن بادام بەسەر گرار دا ڕژا
خاوەن هاتەوە سەر ماڵی وێران
پەل و پلاری داوێشت وەک کوێران
چەپۆکێکی دا لەسەری تووتی
تووکی لێ وەری و سەر، ما بەڕووتی
مات و کڕ وکپ دەمی پێکادا
کۆمای کڕیاریش لە کابرای لادا
ئەهاتن تا گوێ لە قسەی خۆش بگرن
ئێستا بۆچیانە دەروێشی ورگن
خێو کە تووشی هات بازاڕی کەساد
پەژیوان بوو کەوتە خوداداد
دەپاڕایەوە بەناڵە و ڕۆڕۆ
بەڵکو مەل دیسان بێتە گفتوگۆ
هیچ بەهرەی نەما نزای زمانی
ناچار گایەکی کردە قوربانی
بەناو باژێڕدا گەڕا و بانگی هێشت:

هەرکەس هەژارە بابێتە سەر چێشت
کۆبۆوە گەلێک تەنبەڵ و ڕووتەڵ
تووتییەکی دیت وەکو خۆی کەچەڵ
بانگی کرد خاڵۆ کێ لێی دای بەمشت
تۆش دیارە وەک من ڕۆن بادامت ڕشت
تووتی کەوتەوە وتار وەک جاران
ئەمەش بوو بە پەند لە جەرگەی یاران:
هەربیر لە خۆبە هەرکەس داخێوێ
لە هەنبانەی خۆی گوێزان دەپێوێ

***

## ورچی نەکوژراو مەفرۆشە

دوو کەسی ڕاوکەر چووبوونە جەنگەڵ
یەکێ ترسەنۆک، یەکێکی تەنبەڵ
ترسەنۆک وتی: ورچێ ڕاو ئەکەین
های کەوڵی ورچ لە شار قاو ئەکەین
بە نرخی ورچە زۆر کوتاڵ ئەکڕم
بۆ تۆش کراسێک لە جاو دائەدڕم!
ورچێک دەرکەوت لە سای نزارێ
ترسەنۆک ڕای کرد پەڕیە سەر دارێ
تەنبەڵ لێی کەوت وات ئەزانی مرد
ورچەی هاتەسەر بۆنی پێوە کرد
بە مردووی زانی و هێشتی بێ گێچەڵ
کابرای لە سەردار گوتی بە تەنبەڵ:

ورچە چی ئەگوت؟ بەخوا زۆر ترسام
وتی: دوو پەندی زۆر باشی دادام
لەگەڵ ترسەنۆک مەبە بە هاوکار
تۆ بەجێ دێڵێ و خۆی دەچێتە سەر دار
دۆشت پێ خۆش بێ بەران مەدۆشە
ورچی نەکوژراو پێستی مەفرۆشە
***

## دۆستی نەزان

باغەوانێکی پیری کۆنەساڵ
لەگەڵ ورچێکا ببوونە هاواڵ
دۆستی یەکتر بوون بەدڵ و بەگیان
هیچ سات و کاتێ بێ یەک نەدەژیان
لە گوێز لە ترێ لە دانە و هێشوو
بۆ مام ورچ بوو نۆبەرەی پێشوو
ورچەش زۆر بەدڵ خزمەتی دەکرد
هەرکارێک هەبا بەڕێوەی دەبرد
داری دەتەکاند ترێی ئەچنی
چنگاڵی چەک بوون لە ڕووی دوژمنی
بە ڕۆژ کارکەر و پاسەوان بەشەو
باخەوان بێ خەم چاوی ئەچوە خەو
***
ڕۆژێکی هاوین باخەوانی پیر
خەوتبوو لە بن دارێکی هەنجیر
ورچە لە تەکیا هەڵتروشکا بوو

مێش دەرکرانی پێ سپێرابوو
ئەو ڕۆژە وای کرد هروژمی مێشان
بۆ ورچە ببووە مایەی سەرئێشان
ویستی بە جارێک قڕیان تێ کەوێ
تا دۆستی بەڕێز خەوی لێ کەوێ
گاشێکی هەڵگرت بەهەموو توانا
بە بێ سێ و دوو دای بە مێشانا
لەگەڵ مێش کوشتن کابراشی جنی
دۆستایەتیەکەی بوو بە دوژمنی
دۆستت نەزان بێ لە بەری هەڵێ
ڕووڕەشی لەدووە ماچی مەنجەڵێ

***

## کەر بە لاحەول ناژی

دەروێشی شڕ و کەرێکی لاواز
شەکەت لە نشێو، ماندوو لە هەوراز
شەو داهات لای دا لە خانەقایەک
لە سۆفی پرسی: بۆ کەر جێگایەک
گوتی: ماشەڵڵا دەروێش چ ژیری!
لە بیرت نەچێ میوانی پیری
زۆرزۆر خۆشهاتی جێگات لەسەرسەر
بێ خەم، لە سەر من دابین بوونی کەر
وتی: سا توخوا بیبە سەر ئاوێ
ئەی سوبحانەڵڵا دەروێش پێی ناوێ
سۆفی گیان کاشی بۆ دانێ کەمێ

ئەستەغفیروڵڵا جۆشی ئەدەمێ
پەینی وشکیشی بەرپێ ئەڕێژی؟
لاحەولەوەلا، دەروێش چ گێژی!
خانەقای شێخە و جێگەی ئیللەڵڵا
تاقەتی ئەکەم، مەیکە بەهەڵڵا

* * *

دەروێش پڕخەی بوو بەدرێژایی شەو
سۆفی و کەر و کا و جۆی دەهاتە خەو
بەیانی دیتی: کەر هەر بەجلە
سەر تا پای نوقمی ڕیخاوی شلە
لە برسان سنگ و گوریس ئەجاوێ
نە سۆفی دیوە و نە کا و نە ئاوێ!
کەری وەدەرنا بە پاڵەپەستۆ
جار بەپاش دادێ جار بەسەر ئەستۆ
گوتیان: مام دەروێش کەر چی بەلایە
وتی: بێ هێزی سوبحانەڵلایە
درێژاییی شەو هەر ئیلەڵلای خوارد
سۆفی سەوەیەک ماشەڵلای بۆ نارد
کەرێ هەموو شەو لاحەولێ بادا
پێو سەیر نەبێ گەر بێ بەلادا

* * *

## ئەگەر

ئەگەر گورپەبۆر باڵی لێ بڕوێ
دەنگی بولبولمان نایەتە بەر گوێ

گەر بدرێ بە کەر دوو شاخی گامێش
هیچ کەس ناتوانێ لێی بچێتە پێش
***

## ژوانێکی دوور

شـێـخـۆنادۆ ناو، زورنا ژەنی پیـر
جـەفـەنگبـاز و ژیر دەژیا لە جـزیر
شێخێک پێی دەڵێ: زورنا بەس لێدە
لە سـەر مـردنی گـاڵتـە فـڕێدە
وەرە تەکـیـەکـەم ڕیشت بەردەوە
پەژیوان بەوە لە گـشت کـردەوە
من شێخم مەلام سەیدم حەجم هەشت
ناڵێم پێم دەکرێ بت بەمە بەهەشت
بە بێ تۆش ناچم. شێخۆ پێ کەنی
ڕووی کردە شێخ و گوتی: ئەزبەنی
من شـێـخـۆنادۆم نە ڕۆژوو، نە نوێژ
جارجار زورناژەن، گا گۆرانی بێژ
وەک خۆم حەنەک چی کەسی دیکەنین
مردووی گۆڕستان دێنمە پێکەنین
ژیان شـیـرینە جـیـهان زۆر خـۆشـە
بە پووش و کلـۆش خـۆت دامەپۆشە
گەر بەمن دەکەی شاڵەکەت باوێ
ڕێشت بتـاشـە داوت پێ ناوێ
لە دەروێش گرتن پەشیمان بەوە

زورنایەک بکڕە و ڕەگـەڵ من کـەوە
فـــێـــرە زورنابە لای لەتۆی کـــوڕم
ئەو ڕاسـتـە کـوڕمـە تۆش دەبیـە زڕم
ناڵـێم پێم دەکـرێ دەوڵەمـەندت کـەم
بـەڵام بـڕیـاربـێ هـەتـا ئـەمـن هـەم
بـۆ هـیـچ ئـاهـەنـگـێ بـەبێ تـۆ نـاڕۆم
لە دراوی شاباش بەشداربە وەک خۆم
ژوانی گـفـتـی تۆ سـەد هەزار سـاڵە
زورنای من ئێـسـتـا لەسـەر هەرزاڵە
***

## ورگە مەڕ

شێخۆ، لە شێخێک دەپرسێ: مامە
بۆ دەف ڕەوایە و دەهۆڵ حـــەرامـــە؟
پێـسـتی هەردوکـیـان هەر ورگە مـەڕە
هین دەهۆڵ قـــەڵەو هی دەفـــە لەڕە
شـــێخ گـــوتـی: چونکو دەفـــە بڵاوە
دەهۆڵ گـــیـــــراوە، پیس و گـــڵاوە!
وتی: ئەی چۆنی بۆ شـووتی و کـفـتـە
گـفـتت چ تفـتـە؟ نان خـۆری مـفـتـە!
***

## هەڵەی زمان

ساڵێک لە دێیـەک کۆلکە فـەقێیـەک
لەناو کـتـێـبـێک دیتی لە جـێیـەک:
دەڵێ شـێخ فـەرمـووی هەتا هەتایە

پێستی سەگ پیسە و دەباغی نایە
ئەمەی هەژ نۆ جار پاتە کردەوە
پاش ڕەوان کردن ئاوای خوێندەوە:
سەگ فەرموویەتی هەتا هەتایە
پێستی پیسی شێخ دەباغی نایە
***

## شۆربا و پشکەڵ

دەروێش لای مەلا وتی پیس قەوما
شۆربا و پشکەڵم دەخوارد لە خەوما
دابۆم بڕوانە و بۆم لێک دەرەوە
ئەو خەونی ناخۆش چی بە بەرەوە؟
گوتی: بیست قۆشەم دەیە پێت دەڵێم
وتی ڕێم بەردە لە بەرت هەڵێم
چۆن بوویتە مەلا بەومێشکی وشکەڵ
من دراوم با چم بوو لە پشکەڵ
پشکەڵ خۆر نەبووم قۆشە وا زۆربا
مشتە ماشێکم دەکردە شۆربا
***

## لەچەر و تاژی

سەیرە لەچەری ڕژدی دەس قووچاو
دراو کۆدەکا و نایخوا تا دەمرێ
لێم بۆتە تاژی بۆخۆی برسییە
کەچی کەروێشک بۆ خەڵکی ئەگرێ
***

## له دڵی نەداوە

شێـخـێک بۆ ژنان ئامـۆژگـاری بێـژ
هەرای بوو لە مەڕ دروستیی دەسنوێژ
دەیگوت: تووکەبەر ون کا دەنکەجۆ
لەش پیسە و نوێژتان دەڕوا بە فیڕۆ
لاوێکی بێ موو چووبووە قوژبنێک
بەرگی وەک ژن بوو، پرسی لە ژنێک:
دەستێکت بێنە بۆ سەر بەرگەدەم
بزانە چۆنە دەگەڵ گفتی ئەم؟
ژن هاتە دەستی ڕەقێ لەو ناوە
هاواری کرد و دڵی بووراوە
شێخ فەرمووی: پەندم بەهێز و پێزە
وا دای لە دڵی ئەم خۆ پارێزە
لاو گوتی: یاشێخ هەڵی دەبەستی
نەگەیی بەدڵ گەیشتە دەستی
پەندی ڕەقی تۆ کار لە دڵ ناکەن
دەبێ ڕەپوڕاست لە دەستت ڕاکەن

* * *

## کونە کۆتر

یەک هەڵی قوڕاند ماستاو لە خوڕێنی
تنۆکە ماستێک پەڕیە ڕدێنی
هاتە دیوەخان گوتی ئەمڕۆ زوو
بەر قلیانەکەم بێچوە کۆتر بوو
گوتیان ڕاست ئەکەی دەم کونە کۆتر

نەمـــان دی لەخـۆت کـەس بێ درۆتر
دیارە لە دەمــتـــا کـۆتر نیـــشـــتـــەوە
جـیـقنەی یەکـێکیـان وا بە ڕیشـتـەوە

* * *

## کێ زاناترە؟

شـــوانە کـــوردێکی زۆر بلوێرهەنگێـــو
ڕۆژێـک بلـوێری لێ ئەدا لە کـــێـــو
بیـسـتی جووکـەیەک دەسنوێژ هەڵوەشێن
لە لێـدان کـەوت لەبەر دەنگ و بێن
نەینا بە کونەکـەی باکـەی لێ دەرچوو
فەرمووی:تۆ باشتر لێ دەدەی فەرموو

* * *

## کەمی لەبیرە

کوڕ بە دایکی گوت: بێجگە لە باوە
چەند شـوی ترت بوون، وەرامی داوە:
نۆ مــێــرد لەو هۆزی نـۆیان لـەم هۆزی
دوو نـۆش لـە هۆزی نـەورۆزە قـــــۆزی
نـۆ هەر لـەبەر تـاو خـــــۆیان ئەدۆزی
نۆشیـان نیـوەی ساڵ دەژیان بێ ڕۆزی
شەشە و شـەشان و شەشێکی تریش
ورچەی ئـامـــان و ڕەشـــێـکی تـریش
بەخـــوا ڕۆڵە گــیـــان دەس بە هەویرم
وردە مــێـــردەکـــان کـــەم دێنە بیـــرم!

* * *

## ڕاست و درۆ

یەک لە خـــەوا دی لە شکێـــرێکا
کــــووپەڵە زێرێک لە ناو تێـــرێکا
لە خــۆی شــەتەک دا لە ڕژد و چیــا
هێندە شــەکــەت بوو بە خــۆدا ڕیا
ڕاپەڕی نـەیدیت نەتێـــــڕ نـە زێڕێ
بەڵام سل هەبوون هێندی بان گـێـڕێ
***

## دلۆ بەدەهۆڵ

ژن بێـیــەک گـوتی بە شـێـخـۆنادۆ
نە زوڕنا خـۆشـە و نە لێ لێ و لۆ لۆ
ئـەگـــــــەر تـۆ ئـازای زوڕنـا بـاوێـژە
هـەر بـەو دەهۆڵـەت دلـۆیـە بێـــــــژە
وتـی: تـۆ بـایەک بـە پێـــشت بەردە
مـنـیـش دەبـیـنـم چـاری ئـەم دەردە
***

## ڕیش هەڵ تەکێنە

سـوڵـتـان مـەحـمـودی شـای بەدەنگ و ناو
شــــەوێک ئەگـــــەڕا بە بەرگی گـــــۆڕاو
لـە کـــــەلاوێـکـا کـــــۆمـــــەڵـێکی دی
لای دایە لایـان گــــوتیـــــان: ئەتـۆ چی؟
گـــــوتی: مـن دزم شـــــەوگـــــەردە نـاوم
لە دەســتــەی هاوڕێ ئەمــشــەو جێ مــاوم
گـوتیـان: هەریەکـمـان فـێـڵـێک دەزانین

بە فیڵ سەرتۆپی کۆمای دزانین
یەک لە دوور ئەکا بۆنی زێڕ و زێو
یەک بە فوو ئەبڕێ دیوارە یا کێو
یەکمان تێ ئەگا لە حەپەی گەماڵ
ئەزانێ چۆنە خەوی خاوەن ماڵ
وەک ڕۆژ ئەبینێ یەک بە شەوی ڕەش
تۆ چی ئەزانی بتکەینە هاوبەش؟
گوتی: پێشترم زۆر لەم پیشەدا
ژیان و مردن ها لەم ڕیشەدا
هەزار دز بەرن بۆ پای قەنارە
ڕیش هەڵتەکێنم گشتی ڕزگارە
وتیان تۆ باوکی هەموو دزانی
نیوەی بۆ تۆبێ هەرچیمان هانی

***

تولەیەک وەڕی، گەماڵێ گرتی
زمانی سەگزان کەوتە دڵ خورتی
تولە گوتی دز، گەماڵ گوتی وست
خێوماڵ دەنگ ناکا تۆ بۆ خۆت تێخست؟
شا وتی ئەمیش هەر ئیشی ڕیشە
جادووی ڕدێنم داوی سەگیشە

***

بە بۆن بۆنی کرد گەنجینەی خونکار
بە فوو کون کرا لایەک لە دیوار
تێر پڕ بوون لە زێڕ گیرفان لە گەوهەر

گـــــەسکی لێ دریا و بریا و چوونە دەر
مـــاڵ شـــاردراوە و خـــۆی لێ وەشـــاردن
ئەو شـــەوە هەمـــووی بە بەند ســـپـــاردن
بە ڕۆژ هەڵخـــــران ســـــێـــــدارە بۆ دز
دز لەپای دارا خـــەمـــبـــار و ســـەرکـــز
چاوڕوونی شـــەوبێن کـــردی تەمـــاشـــا
وتی دزەی شــــەو چۆن بوو بە پاشـــا ؟
کـــاری خـــۆمـــان کـــرد مـــەمـــانخـــاپێنە
ســـــا نۆرەی تۆبە ڕیش هەڵ تەکـــێنە
شـــا گـــوتی: ئێـــوەش مـــەرجێ بەرنە ســـەر
نیـــوەی خـــۆم دەنێ و لێـــرە بچنە دەر
نەجـــوولێ ڕیشی خـــاوەن دەســـتـــەڵات
زۆریش بزانی نـاگـــــــەی بە ئـاوات
***

## گۆڕە یان ماڵە

تەرمی هەژارێک دەچوو بەرەو گــــــۆڕ
کـــــوڕ بۆی ئەگـــریا هاوار و گـــابۆڕ:
باوەگـــیـــان دەتبـــەن بۆ کـــونێکی تەڕ
نە چرای لێـــیـــە و نە حـــەســـیـــر نە بەڕ
نـە نـان و نـە ئـاو نـە هـاودەم نـە یـار
تەنگ و تاریک و پڕ لە مـــشک و مـــار
منالێک بیـــــســـــتی و بەهەڵەداوە
ڕایکردە مــــاڵ و بانگی کـــرد: باوە

سەرباری دەرد و ژیانی تاڵمان
کەلاکە مردووش ئەهێننەماڵمان!
***

## چ دەبارێ

خۆی کردە زانا دەروێش پشیلە
پەندی دائەدا بۆ قەوم و قیلە
دەیفەرموو ئەگەر پاکو بەنوێژبن
تووکی بەر، کلک و چەنە درێژبن
شەوی زۆر تاریک بە دەنگێکی خاو
حەوجار بڵێن میاو حەفتا جار مرمیاو
لەژوور وەک ڕێژنەی هەوری بەهارێ
بۆ هۆزی گورپان مشک ئەبارێ
کوچەکی چەرموو بیستی ئەمانە
تورەبوو فەرمووی: ئای چەند نەزانە
چی تێ نەگەیوە لە خوێندنی کۆن
هەرچی ئەیبێژێ هەڵبەستە و درۆن
نزا میاو نییە حەپەیە و عەوعەو
سەت و یەکجاران بلوورێی بەشەو
لە نیمەی شەوێک لە ساڵێ جارێ
لە عاسمانی ساو ئێسک ئەبارێ
هەرکەس دەیبینێ لەم جیهانەدا
تلاوتلیەتی لەم خەوانەدا
***

## ئێستر باج نادا

گورگ باجگر بوو لەسەر ڕێی گاران
ددانی دەسوون بۆ نەرمەی لاران
بە ئێستری گوت: پیتاکت بێنە
وتی لەوبارە ئێستر مەدوێنە
لە ژێر ناڵمدا نامەی خونکاری
وەرە وەیخوێنە گەر خوێندەواری
گور هاتە پشتی نامە وەخوێنێ
یاخۆ دەم تەڕ کا بە گۆڵمە خوێنێ
لوشکێ داوەشاو ددانی شکاند
بەڵگەی سمی ڕەق گورگی تێ گەیاند:
کێ خاوەن هێز و ناڵ و بزمارە
جاوینی گۆشتی گەلێک دژوارە

***

## گزی هێزە

شێر پشیلەی دی واقی وڕ مابوو
لە بیچم و تەرزا وەکو خۆی وابوو
پرسی وەک منی بەڵام زۆر وردی
لێم ڕوونە زل بووی کێ وای لێ کردی؟
وتی: بنیادەم بە گزی و گەڕە
جانەوەرێکی دووپێی بەدفەڕە
وتەی زۆر خۆشی خەتە و سندانە
بەشم ڕۆژ و شەو بە دار لێدانە

گـــوتی: مـــەترســـە، بە گـــۆڕی بابم
تـۆڵـەت نـەســـــێنم ئـاســـــوودە نـابم
کـــوانـێ بنیـــادەم؟ شـــانم دە جـــارێ
کــتـک شــێــری برد بۆلای جـــووتیـــارێ
شــــێـــر تێی ڕاخـــوری وەرە مـــەیدانم
شـــــێـــــرم گـــــورپـە نـیـم، دەردت ئـەزانم
پــێـی وت چـەکـی تـۆ چـنـگ و ددانـە
چەکی بنیـــادەم شـــیـــر و قـــەڵغـــانە
جــــــەنگی وا دوورە لە مــــــەردایەتی
یـەکێ بێ چەکـــــــە و یـەکێ لایـەتی
گـــوتی: چەک بێنە لێت ڕادەوەســـــتم
وتـی: دەتـرسم ڕاکــــەی لـە دەســــــتم
بێنە بتــبـەســتم، شـێـر گـوتی: خـاسـە
کـەژو پێـچی کـرد، کـێـشـای قـەیاسـە
جـــا وەرە بوکـــتـــە خـــوری شـــۆر بەدار
شـــێـــر بانگی ئەکـــرد بە زیڕە و هاوار:
پـشـی بـڕوانـە بـە ژێـر و ســـــــــــەردا
کــــەی وەک تۆم لێ دێ دەســـتم لێ بەردا

* * *

## فیل لە تاریکی

شـــەو لە پشـــتـــیـــرێک فـــیل داکـــرابوو
تـاریک و تـنـوک نـە مـــــــۆم نـە چـرا بـوو
چـەنـد لاوێـک بـە دزی چـوونـە تـەویـلـە
دابـزانـن داخـــــــۆ چۆنە ئـەم فـــــــیـلـە

هەریەک لە لایەک بەدەس کوتانێ
لای وابوو زۆرباش لە فیل ئەزانێ
یەک دەستی کوتا لەسەر پشتی پان
ئەیوت: فیل خۆشە وەک تەختی ڕەوان
گوێ گرتوو ئەیگوت: بەس بنەڕێنە
من باشترم دیت فیل باوەشێنە
ئەوەی هەر دەستی لە لووتی داوە
وتی: فیل وەکو لوساوکی ئاوە
لاقگر ئەیقیژاند دەک مردووت مرێ
فیل کۆلەکەیە و لووس و بێ گرێ
دەس لەکلکدەر کەوتبووە دواوە
وتی سوێند ئەخۆم پەتکە و پساوە

***

گاڵتەی پێ دەهات مامەی فیلەوان
ئەیوت مەچنە شەڕ بێ تیر و کەوان
بەخەیاڵ کەمتان لە زۆر زانیوە
شەڕ لەسەر فیلە و فیلتان نەدیوە
گەر چرا هەبا یان ڕۆژێکی ڕوون
لێتان ڕوون ئەبوو ڕێگە لێ ون بوون
کار تا نەیخەیتە بنج و بناوان
دەمی تێ وەردەی گوناهە و تاوان

***

کێ بەزەی دابێ بەگورگی بەدکار
زوڵمی زۆری کرد لە بەرخی هەژار

کـــویرەمـــار بکوژە مـــەڵێ بێـــچـــووی هەن
نـەک ڕۆژێ لـەپڕ بـە قـــــــاچتـــــــەوە دەن

***

ســوارێک بەرخـێکی لە گـورگـێک ســتـاند
خـــۆی ســـەری بڕی گـــۆشـــتـــەکـــەی برژاند
چزەی گـــــۆشت ئەیگوت بە بـانـگ و هاوار
ئەگـــەر هەر بمخـــۆن چ گـــورگ و چ ســـوار

***

نـامـــــــــەوێ بـۆ مـن ببـــــــــارێ هەورێ
گش زەوی و زاری خـــــەڵکی دانەگـــــرێ

***

لە - یحیی عبدالعظیمی لحام - ەوە کە دوای شاعیری بووە بە قەسساب

دەڵێن شـاعـیـر بووی بۆ بوویتـە قـەســســاب
لە تانـەی نەزان جـــــەرگم کــــون کــــونە
جـــاران من چاوم لە دەســـتی ســـەگ بوو
ئێـــســـتـــا ســـەگ چاویان لە دەســـتی منە

***

## لە سراج الدینەوە

زانیـــــوتە مـــــیــــوە بۆچی شــــیــــرینە
شـــەکـــرلێـــو نووســـتـــون لەو ژێر زەمـــینە
هەواکـــەی خـــۆشـــە مـــەڵبـــەندی نەبوون
هەمـوو کـەس بەتای کـراسـێک نووسـتـوون

***

## له مەلا ئەبو بەکرەوە

ئەوســــەر چاوانەی لەســـەر هەردانن
فرمێسکی چاوی جوانە مەرگانن
نەرگسی چاوکاڵ دەمەو بەهاران
کە ئەڕۆین لەلای دەشت و کۆساران
چاوی جوانانە کەوتوونە بن گڵ
نیشانمان ئەدا گەردوون لە سەر چڵ
***

## له کێلی قەبری ئەبو عەلای مەعەڕڕی نووسراوە

گوناهی بابم لەسەر منەو بەس
بۆ خۆم گوناهم نەکرد لەگەڵ کەس
***

## له عەرەبییەوە

نەرگس لای وابوو وەک چاوی تۆیە
له خۆشییان کردیە فیشاڵ و بافیش
سروە ددانی تێک شکاند بۆیە
ئاو ئەخواتەوە بە لوولەی قامیش
***

له شاعیری زەنگیی ئەمریکایی: ماک کریاوە، وەرگیراوە

## هاواری زۆرلێکراو

من کێم؟ چۆن ژیام؟ بۆچ ئەمڕۆ دەژیم؟
ڕەشم وەک دیزەم، ڕەشم وەک ڕەژیم
ڕەشم وەک لەعنەت وەک قورمی دووکەڵ
ڕەشم وەک بەختی بێکاری تەنبەڵ

ڕەشم وەک مـــــردن بە ڕۆژی جـــــێـــــژن
کـــــەس لـە برودوای چاکـــــەم نـابـێـــــژن
دۆســــــتم یەک یەکـــــە و هـەزاران دوژمـن
هەمــوو کـەس بە ســووک دەڕوانێــتــە مـن
وەکـــو دەڕواننە کـــرمی ســـەر عـــەرزی
ئەســتــێــرەکــانی عــاســمــان لە بەرزی
دووریان خـســتـمـەوە و ناهەق کـوشـتـمـیـان
پێم پێ دەکـەنین کـاتێ ناشـتـمـیـان
دەیان گـــوت ئەی ڕەش گـــڵی گڵ مـــەنزڵ
تەنیـــا هەر بۆخـــۆت دەچیـــەوە ناو گڵ
***
پـیـــــاوەتـیـم لایـان بـێ قـــــەدر و بـاوە
یـاســـــاو دیـن بـەشی مـنـیـــــان نـەداوە
هـیـچ بـاوەڕ نـاکـــــــەن من هـیـچ بـزانم
لـە دڵ ڕەشی وان من ســــەرگـــــەردانم
شـەو و ڕۆژ وەک سەگ کـێـشکچی مـاڵم
وەکـو گـەسک و بێڵ مـاڵیـان دەمـاڵم
منـاڵ ژیرکـــەرم، چێـــشکەم، پشـــیلەم
ئەســپــابێن چ خـــۆم چ قـــەوم و قـــیلەم
بۆ قـــەیســـەر بەشـــەو بەزمم ئەدا ســـاز
بـە ڕۆژ پردی بـووم لـە کـــــورتی ڕێ بـاز
کـە نەشـمـان کـۆیلە و قـەیسـەری ڕمـا
ئێـــمـــە مـــیـــراتی ئەوانمان بۆ مـــا

به ڕۆژ قــــەســـــابم، کـــــێـــــردم، بەرازم
بەشــەو گـــۆرانیم، هەڵـپــەڕکـــێم، جـــازم
***
ناخــــــۆشـــــیـــــان ئەویم، بۆچی؟ نازانم
هەژار، بەســـتــەزمــان، بەســود، بێ زیانم
دڵـیـــان دەلەرزێ نەک خـــوێنی گـــەشـیـــان
تێکەڵ بە ڕەش بێ و بچــێـتــە لەشـیـــان
خــــوا نەکـــا تەبیـــات زۆرم بۆ بێنێ
ژنێکی ســــــپی دڵم بســــــتـــــێنێ!
خـــــرکـــــە بەش ناکـــا بۆ پێـــدادانم
گـــــــــرێـوە بـاسـکـە بـۆ زوو خـنـکـانم
بە هیچ لە دەســـتـــیـــان نایە ڕزگـــاریم
هۆردوو بەش نـاکــــــا بۆ پارێزگـــــاریم
ناوێرم چ بڵـــــێم، لەبەر خـــــۆمــــەوە
ئاخ هەڵدەکـــێـــشم پیش دەخــــۆمـــەوە
گـــــــۆرانی دەڵـێم دنبـــــــەگ لێ دەدەم
زۆر ســـەرخـــۆش دەبم ســـەمـــایە دەکـــەم
دەڵـێـم لـە بـیـــــــــرم بـچـێ مـن ڕەشـم
لـە هـۆز بـێـگـانـە و لـە ژیـن بـێ بـەشـم
بـەڵام لـە بـیــــــــریـش بـچـێ: زلـلـەیـان
شـەقـیـان، بەڵغـەمـیـان، داریان، گـوللەیان
زوو دەمـــهـــێننەوە ســـەر ڕێی وشـــیـــاری
بۆ هەســـتی پەســـتی و ســـووکی و هەژاری

ئەو هەمووە بۆچی؟ هەر چونکە ڕەشم
کەمتر لە سەگ و دز و چەتەشم
ڕەشایی ڕەشیان لە بەرچاو زۆرە
گورگە، کێوییە، بنیادەم خۆرە
نازانن کە شەو ڕەشە و هەر دەشبێ
کێ لە جوانی شەو دەکرێ بێ بەش بێ
شەو ڕەشە و ئەگەر بڵێن شەو نەبێ
یانی سانەوە، یانی خەو نەبێ
ڕەش بووم هەر ڕەشیش دەبم تا زیندووم
لەلای فیرعەون ڕۆژێک بەندە بووم
بولهەوڵ و ئەهرام دەسکاری منن
شاهیدی دەرد و ئازاری منن
ڕێسمە و شیپانەی قەیسەرم ماڵی
بێ پارە و بێ نان بوومە حەنبالی
لە کۆنگۆی بلژیک دەستیان پەڕاندووم
دەمێک بۆیەچی جۆرج واشنتۆن بووم

***

بەڵام گەر زەویش گەرام تەواوی
بڕیم ئەو ڕێگەی دوور و خوێناوی
فێربووم لەو نیلەی بە میسرا دەهات
باوەڕی بەخۆ و بێ دەنگی و سبات
کە «میسیسیپی» بە من پێکەنی
پاشان بۆم گریا، هۆشم ڕاچەنی

گیانم پیر بووە و ئێستا زۆرزانە
کەندالّ گوشادە وەک ئەو چۆمانە
ئێستا ئینسانم دەبێ ئینسان بم
ڕەشیش بم دەبێ وەک سپیەکان بم
فەرقی شەو و ڕۆژ لای خودا نییە
شەو بۆ ڕۆژ وەکو چاوەی کانییە
ڕەشی شەو شەپۆل ئەدا و ناسرەوێ
تا ڕۆژی سپی لێ دەردەکەوێ

***

خزمەتکاری تۆن جوانی و جەوانی
گیانە شاهەنشای تاجدارانی
جوانی تەختی خۆی دانا لێم پرسی
کێ دەچێتە سەر؟ بۆ تۆی ڕوانی
سروە تا باسی جوانتر شت بکا
هەر بە باسی تۆ فێرە زمانی
خوێندنی بولبول بەستەی ئەوینە
بە تۆی هەڵ دەڵێ بەری بەیانی
باغچۆڵەی گوڵان مەست بوو لە هۆش چوو
کە با بۆی سینگ و مەمکی تۆی هانی
گوڵ لە داخانت خۆی کوشت خوێنەکەی
خستە سەر کولمت تۆی کردە جانی
لە گوڵ وەڕەز بوو پەپوولە وەختێ
نەقڵی لێوی تۆی لە سروە زانی

زانیت ئێمە چین کەوتووین لەبەر پێت؟
دڵدار لەبەر پای خواوەندی جوانی
***

## ژوان

لێم گەڕێ بمرم تا لێت نەبڕاوم
نامەوێ بێ تۆ ببینێ چاوم
ئافەریم شەوێ پێکی ڕۆگرتن
سنگی نەرمی تۆ دڵی گەرمی من
وا لێک چەسپاوین ئاو نادەڵێنین
کوڵ و کۆی خۆمان بە خەم دەمرێنین
***

## کەرستەی ژن

خوای گەورە جارێک سەردەمی بەهار
لە کارگەی ژیان دەستی کرد بە کار
لە کۆتر قنە و خەت و خاڵ لە کەو
سرتە لە شنە و هێمنی لە شەو
لە باڵداری چووک نەرمی پەڕی مل
گمین لە کۆتر ئاواز لە بولبول
هاڕە لە تاڤگە و ناڵە لە بلوێر
ترسی کەروێشک و ئازایەتی شێر
ئاونگ لە بەیان ئاوڕی ئاسکی سڵ
گرژی لە خونچە و پێکەنین لە گوڵ
لە کارمامز باز لە باز تیژی چنگ
فیز لە تاوس و جوانی لە پرشنگ

بـــاريـــن لـــه هـــەور و لـــه بـــا وازوازی
له ڕێوی و مـــەیموون فـــێـــڵـــبـــازی و بازی
مـــــــــەنـدی لـه زەوی و ڕەوانـی لـه ئـاو
ڕەشـی لـه شــــــــەوه و ڕوونـاكـی لـه تـاو
تـاڵـی له كـــەكـــره و تام و بۆی هەنگوین
له بەفـــر ســـەردی و له جـــەهەننەم تین
ڕەقـی لـه ئەڵـمـــــاس تـورتـی لـه پـەنـیــــر
له لافـــاو لێـــڵی و بێ گـــەردی له شـــیــر
هێـنای و شـــــێـــــلای لـێكـی دان تەواو
كـــــردی به ژنێک بۆ ئـاوەدنگیی پیـــــاو
***
چەپ گـەردی گـەردوون گـەڕان كـوشـــتـمی
نـەزان پـەرســـــتی بۆ نـان كـــــوشـــــتـمی
هەر چـەوســـــانـەوەی بێ حـــــەســــانـەوە
ئـەی مــردن له كـــوێی؟ ژیـان كـــوشـــتـمی
***
## بۆق و گامێش
به گـــامـــێـــشی دەگـــوت بۆقـــێـک له ئاوا
چیـــیـــه گـــامـــێش هەتا من بم له ناوا
بهـــــۆقـــــێـنه و منـیـش ئەقـــــڕم بزانین
له قـــیـــــڕین كـــامـــەمـــانین پاڵەوانین
كــــه وەرزێر ڕێـز له تـۆ ئەگـــــرێ نـەزانه
هەمـــووی ڕێكەوته كـــاری ئەم جـــیـــهـــانه
***

وتی گـــــامـــــێش بەڵـێ دەنگت زوڵاڵە
بەڵام خـۆ چەرمـــەکــەت ناکــرێتــە کـاڵە
وەکـــو مـن نـی کـــە شـــیـــرت لێ بدۆشن
ئەگـــەر بەهرەت هەبێ بۆت تێ ئەکـــۆشن
ئەمن پەڵخ و کەرەم هەس تۆش قـرەت هەس
قـــڕەی بێ کـــردەوەی تۆ نـاکـــڕێ کـــەس
***

## مێزەری مەلا

مـــەلایەک مـــیـــزەرێکی بـوو چ مـــێـــزەر
دەبـوو ســەیری بکەی دەینـایە ســـەر ســـەر
هەڵی دوریبـــوو بۆ بەرچاو گـــەزێک شـــاڵ
تـژی نـاوئـاخـنـی کـــــــۆنـەی پەڕۆ و پاڵ
ڕواڵـەت جـــــوان و هێـــــژا بـوو لە چاوا
بـەڵام تـابـێـــــــــــژێ وێـران بـوو لـە نـاوا
دزێک هەر لێی دەخـــەفـــتـــا تا ڕفـــانی
مـــەلا قـــیـــڕانی: نـایبـــەی گـــەر بزانی
وەکـــو خـــۆمـــە لە بەرچاو شـــەنگ و ڕێکم
چزانێ کـــەس چ گـــەند و بن شـــڕێکم؟
ڕواڵەت بینە هەرکــەس لەم جـیـــهـــانەس
هـەزاران ڕیـشـــــــــــــــوو داو و دانـەس
***

## دەبوو بیزانیبا

دەڵـێـن جـــارێ لە گـــونـدێ ڕێبـــــوارێ
ببـــوو مـــیـــوان لە مـــاڵی جـــووتیـــارێ

شەوێ شێو شۆربە ماشی شۆر و شل بوو
کەبانووی ماڵ هەڵیلووشی تەغارێ
کە هەڵسا دەفر و ئامانان وەکۆکا
جرێک هات هەر وەکو داتاشی دارێ
دەڵێن میوان دەواری خانەخوێیە
وەکو نەیبیستبێ خۆی دا کەنارێ
شەوێ جێیان لەبەر دەرگاوە چاکرد
کرا ڕێبازی نێو ژوور و حەسارێ
کەبانوو نیوەشە و گوو تاوی دابوو
هەڵات بۆ دەر بەبارێ پێی بچارێ
نەگەییە جێ و لەسەر میوان هەڵی ڕشت
وەکو گامێش لەسەر شینکەی بەهارێ
وتی میوان: کڵۆڵی هۆشی خۆمم
چما گوێی ئاو نەدام زرمەی پلارێ
کە چەخماغەی دەدا کونگت سەری شەو
دەبوو بمزانیا باران دەبارێ
***
کە مرد لەیلا خەبەریان دا بەمەجنوون
ئیتر دنیا لەبەر چاوی نەما ڕوون
یەخەی لەت کرد بە ڕۆڕۆ و داد و هاوار
بە شیوەن ڕۆیی بۆ لای مەقبەرەی یار
لە گۆڕستان مناڵێکی بەدی کرد
بە چاوی سوورەوە پرسی بەوی کرد
گوتی لەیلا لەناو کام گۆڕە مەدفوون

وتی هێشتا لە عیشقا کاڵی مەجنوون
لەسەر هەر گۆڕێ تۆزێ گڵ جیاکە
بەیادی عیشقەوە بۆنی پیاکە
لەهەر خاکێ کە بۆنی مەیلی لێ هات
وەسەرکە خاک و خۆڵ ئەو جێیە جێگات

***

## ڕەنج و گەنج

یەکێ پیری جووتێر نەخۆش بوو دەمرد
کوڕ و کاڵی ئامۆژگاریی دەکرد
زەویوزاری خۆتان لەدەس خۆمەدەن
نەکەن من بمرم و بە پەندم نەکەن
لە باوکم شنەفتگمە لەم بارەدا
کە گەنجێ هەیە لەم زەویوزارەدا
بگەڕێن بە شوێنیا ئەدۆزرێتەوە
لە ڕووتان دەرووی شادی ئەکرێتەوە

***

لە پاش ئەو لە لای کورگەلی مەرد و ڕەند
بە ئاواتی گەنج ڕاوەشا پیل و زەند
بە بێڵ و بە گاسن، بە تەشوێ و بە پاچ
لە گش لایە دەبزووتەوە دەست و قاچ
زەویوزار گەلێ جار سەروژێر کرا
گڵی کێڵگە گشتی لە بێژنگ درا
کە پەیدا نەبوو کووپەڵەی زێڕ و زێو
وەکو پێشوو داچێندرا وەرد و شێو

وەها لێک درابوو زەوی گــشت لە گــشت

لـە وەرزی ترا یـەک بـە ســـــەد بـوو بڕشت

کـــوڕان تێ گـــەیین کـــاکـــڵی پەندی پیـــر

لە ڕەنجی فـــرە گـــەنجی زۆر دێتـــە گـــیـــر

***

## دەرمانی دەباغ

لە بازاڕی بۆنخـــۆش فـــرۆشـــانی شـــار

دەســـــووڕایەوە مـــــامی پیـــــری هەژار

بە بەر لووتیـــدا چوو گـــەلێ بۆنی خـــۆش

نەخۆش کەوت و تاسا و گلا و چوو لە هۆش

یەک ئەیوت دڵـی ســـست و بێ هێـــز بووە

دە دەیگوت دڵ ســــســـتـــیی چی؟ مـــردووە

بـژیـشـکێ لـەوێ ڕادەبـرد لـەو دەمـــــــە

دەســـتی گـــرت و پرسی چ کـــارەس ئەمـــە؟

کـــە پێی زانی پێـــســـتـــان دەنێـــتـــە هەلاڵ

وەکـــۆی کـــرد قـــولێ جـــیـــقنە و زبـڵ و زاڵ

بە بۆگـــــەن دەم و لـووتی کـــــابرای هەنوو

دەم و دەس وەخـــــۆ هاتـەوە و دای پشـــــوو

لـەناو بـۆگـــــەنیـــــدا تـەمـــــەن ڕابـرێ

نە ســـەیرە بەبۆی خـــۆش مـــرۆ بش مـــرێ

***

## تاوانی میرە

وەرزێـر کــــــەرەکــــــەی بـەرەو لەوەڕ نـارد

خـۆی خـەوت و لەپڕ گــورگ کـەری خـوارد

ڕووی کـــــردە تەلاری مـــــیــــــری کـــۆرە
کــــــــــــــارت وەبــێ، نــاڕەوایــە زۆرە
کـــوانێ کـــەرەکـــەم لە تۆ گـــەرەکـــمـــە
بێ بارەبەرم بە جــــارێ پەکــــــمــــــە
مــیـــر پێکەنی: خـــۆت هەڵە و پەشـــێـــوی
چۆن خـــۆت ئەخـــەویت و کـــەر لە کـــێـــوی؟
کـــــابرا وتی ڕاست ئەکـــــــەی نەزانم
پڕ ژانە لە دەســــــــتی خـــــــــۆم ژیانم
پێم وابوو کــــە تۆ بەخـــــێـــــو دەکــــەم من
پاسم دەگــــــــری لە حـــــــــاندی دوژمن
وەمـــــزانی کـــــە چاوی من چووە خـــــەو
بێـــــداری لە دەوری من هەمــــــوو شـــــەو
نانی مــــە هەمـــــووی فـــــڕی بە فـــــیـــــڕۆ
گـــــورگی زلە بۆمـــــە مـــــیــــــری وەک تۆ
چاوم چووە خـــــەو لە خـــۆت کــــە خـــەوتی
دەبوایە لە خــــۆت نەنووم، کـــــە چەوتی!
مـــــیــــــــر بەرزەوە بوو گـــــــوڕی لە یاران
کــــوا شـــــیــــــر و ڕم و گــــــرووی ســـــواران
لەم ڕۆکـــەوە ســـــوێند بە نانی جـــــووتێـــر
ئەونانە کـــــە مـــــەزن و مـــیـــــر دەکـــا تێـــر
تا گــــــــورگێ لە کـــــــوردەواری مـــــــابێ
خــــــــەو نابێ بەدەوری دیدەمــــــــــا بێ
وا ڕاوە لە شـــــــــار و کــــــــەژ، دەر و دێ

چوارپێ کـــەمـــە زۆرە گـــورگی دوو پێ
هەر چەندی هەژار و شـــوان و گـــاوان
زیـانـی دی لـە مـن بســـــــێـنـێ تـاوان

* * *

## فرشته

بۆ کـورِ جنێـو ئەبارێـن مـەلا دەبێـژێ پارێن
تاژی مـەهێنە مـالّم فـرشـتـە لێم دەتارێن
ڕۆژێکی کورِ بەتاژی کەروێشکی شینی هێنا
تا دایکی کێردی تێ نا مەلا گۆشتاوی لێنا
دووگـردی نوێژی تا ڕۆژ بە شـانی تاژیدا دا
کوروشـمە بوو لە دەوری نەوەک لەشانی لادا
بـەیـان بـەدەم نـزاوە بـەتـاو ئـەپـاڕایـەوە
بەڕەوت و دەم گەرم بی بەڕاستی هۆت دایەوە
ئەو گۆشتاوە و بڕشتە لە تۆن خەم ڕەوێنەکەم
دەردت لەسـەد فـرشـتـە تامـەزرۆ شکێنەکەم
فرشتە بێ، بە بێ گۆشت لە مالّی ئێمە ناژی
کـەروێشـکێ بێنێ بۆ من فـرشـتـەیێکە تاژی

* * *

## هەژار هەر هەژارە

مـێـشـــولەیێکی لاواز، لە بەخت و ژین نەڕازی
ڕووی کـردە لای سلێـمـان بە نیـازی دادخـوازی
هاوار و داد لەدەس با، مـــەودا بە ئێـــمـــە نادا
زۆرداره پێی بفـــەرمـــوو با لا لە ئێـــمـــە لادا

فـەرمـووی گلەی بەتەنیـا لای ئێـمـە سـوودی نـابێ
پێــویســـتــە هەردوو لا بێ بڵێ بە با کــە با بێ
مـێشـووله چوو له دووی با ، با هات و پێـشی ڕادا
بە ویـزەویز ئـەناڵی لـه کــــاتی گـــــیــــــانەڵادا
بـێ زۆر لـه ڕاســــــــتی زۆردار ڕەواشی نـاڕەوایـه
هەتا جـیـهــان جـیـهــانە مـێـشـووله دیلی بایە
***
بـەرداشی هەڵ نەبەســتــوو بە تەوەرە و بســتــەوە
بەشـدار بەئارەزووی ئارد لێی نیشت و دەیلســتـەوە
ئـەو ســەگــەش تولێکی تر دەیلســـتــەوە لە دواوە
دەیـگوت هەر بێــرە دادێ چی بەخــەیاڵ خـــوراوە
قـــازی چاو ئەقـــوچێنێ یان کـــوێرە و چی نەدیـوە
جـێـژنی دزی پێی وایه جـێـژنیش مـاڵی هەتیـوە
***

## کەروێشکاوا

**لە ئەحمەد شەوقییەوە**

پارچە زەوییــــەک هەبوو کــــەروێشکاوا
گـــشـــتی پۆشـــرابوو لە شـــینکە و ئاوا
ژیـانیــــان خـــۆش و بـەمنداڵ و بـەمــــاڵ
بێ ترس بوون لە گـــەمـــاڵ و لە تـەمـــاڵ
فــــیلی زۆردار دڵی خـــۆی لێ ڕەش کـــرد
زەوییــەکـەی لەت بەلەت و بەش بەش کـرد
هەبوو کـــەروێشکێ جـــهـــاندیدە و پیـــر
خـــاوەنی بیـــر و بە تەگــــبـــیـــر و ژیر

بانگی کـــرد هۆ گـــەلی کـــەروێشکاوا
مـــــــردنو خـــــــۆشـــــــە نـە ژینـی ئـاوا
نەبنە یەک کـــاری هەمـــووتان گـــەندە
ڕەگی ســەربەســتی بە یەکـبــوون بەندە
لە هەمـــوو لایەکـــەوە لێک کـــۆ بوون
کـــەتنە ڕاوێـژەوە بۆ ســـەرخـــۆ بوون
هەڵبـــژێران لە نێـــواندا سێ کـــەس
چـاو لـە پـایـە نـەبـوو زانـا بـا و بـەس
تاکـــو پیـــلانێ وەها ڕێک بخـــرێ
فــــــــیـلـی زۆردار لـە زەوی دەربـکـرێ
یـەک وتـی: کـــــارەکـــــە زۆر دژوارە
بـار بکـەیـن بـاشــــتــــرە چـار هەربـارە
گـــشـــتی واتن کـــپی کـــەن ئەم دەنگە
مــەرگــمــان خــۆشــتــرە نەک ئەم نەنگە
وتی دووهەم کـــە لەتیـــرەی کـــێـــوی
کـــەس گـــزی زان نیـــیـــە هێندەی ڕێوی
هەیە پێـــــویســـــتی بە ڕاوێـژی ئەو
مــزی بیــریشی دوو کــەروێشکی قــەڵەو
ئەمـــــە وتیـــــان وتـەیە بێ ســـــەروبن
بێ فــــــەڕن دوژمـن و بیـــــــری دوژمـن
ســێــهــەمین ڕاســتــەوە بوو بۆ گــوفــتــار
وتی خـــزمـــینە بەگـــەل دەســـدەنە کـــار
دەســـتی گـــەل هێـــزە بەگـــەل با پکۆشین

بـوودرێـک هـەڵ بـکـەنـین دای پـۆشـین
فـیل شـەوێ یان لە ڕەوێ تێ دەکـەوێ
زۆر بە شـانازی دەڵێن لێـر و لەوێ
چونکە دەسـمـان بەدەسی یەک ئەسـپارد
یەکـیـەتیی ئێـمـە سـەری فـیلی خـوارد
هەرچی کـەروێشکە بە گـفـتی شـاد بوون
فـیلە کـەوت و، کـەوتی و ئازاد بوون
هاتنە کن سـێـهـەم و گـوتیـان شـامـان
تـۆی و بـۆ تـۆیـە ژیان و سـامـان
وتی: نا، ئێـوە هەڵەن، ئەو جـێـیـە
پێـو بڵـێم شـایەنی شـانی کـێـیـە؟
ئەو کـەسـەی پێـشی لە تین و تاوا
بانگی کـرد: هۆگـەلی کـەروێشکاوا

***

## هەڵۆ هەر بەرزە

پـایـزە دار و دەوەن ڕەنـگ زەردە
با تـەز و سـەردە بە تـۆز و گـەردە
دیارە لای شـەخـتـەیە ناخـۆش خـەوەرێ
دارە خـۆی دەڕنـی خـەزەڵ هەڵدەوەرێ
هەورە ڕەشـپـۆش و بە گـریە و ناڵە
سـەرەتای شـیـوەنی مـەرگی سـاڵە
بە گـژەی سـەردی هەناسـەی کـەژ و کـۆ
ژینی خـۆی هاتەوە بیـر پیـرە هەڵۆ:

داخەکەم بۆ گوڕ و تینی جوانیم
ئەو دەمەی چۆن و چبووم، بۆ وانیم؟
هێز و سۆمای نییە باڵ و چاوم
مامەوە گردەنشین بێ ڕاوم
دووره گۆشت پۆڕ و کەوم، وەردەکەوم
گۆشتە نێچیرێ مەگەر بێتە خەوم
پیرییە پایزی وەرزی ژیانە
وردە هەنگاوی بەرەو گۆڕنانە
وا هەڵۆی مردنە ڕاوی کردم
ڕاوبەتاڵی منە هاکا مردم!
مردنیش هێندە نە سووکە و سانا
سەری لێ گێژە هەزاران زانا
چم بەسەر دێ کە نەمام و مردم
پەڕی بەربایەک و خۆڵی وردم
گیان بەرەو کوێ دەفڕێ ڕوون نییە بۆم
تۆ بڵێی پچتەوە لای باوە هەڵۆم؟
تۆ بڵێی ڕاوێ هەبێ لەو بەرزە؟
پاش هەموو چەرمەسەرەی ئەم عەرزە
داخم ئەو ڕازە لە بن سەرپۆشە
سەفەری نابەڵەدی ناخۆشە
دڵ و دیدەم کە بە دنیا فێرە
چەندی پێم بکرێ دەمێنم لێرە
ژین گەلێ شیرنە فیزی ناوێ

بۆ مەبەست سەر دەنەوێنم تاوێ
چاری ئەم دەردە لە لای قاڵاوە
گەرچی زۆر پیرە بە لاوی ماوە
دەچمە لای و بەوە چم لێ نایە
ڕەشییە و ئاوی ژیانی لایە
سەر نەوی دای لە شەقەی شاباڵان
هاتە وێرانەیەکی جێ ماڵان
بوو بە میوانی قەلێکی ڕووڕەش
چەپەڵ و ڕژد و لە مەردی بێ بەش
قەل قڕی: لێم مەیە پێش زۆرداری
خوا شوکور زۆر بە کەنەفتی دیاری
زووبە چیت لێم گەرەکە پێم بێژە
دوور لە من بگرە لەشم بە نوێژە
وتی ئەی لالە قەلەی هەر لاوم
پیرم و زۆر لە مەرگ ترساوم
هەمە پرسێک و دەبێ بمبووری
هۆی چییە تۆ کە لە مردن دووری؟
وەک دەڵێن ئێوە بە چڵ ساڵ بارن
تووشی تووش نایەن و کۆسپ و بارن
ڕێ یەکم پێ بڵێ بۆ هەرمانم
تۆی لە لات دەست دەکەوێ دەرمانم
سوێند ئەخۆم پاشی هەتا بشمێنم
هەرکەوێ ڕاوی بکەم بۆت دێنم

* * *

مەترسە لە شێر، لە پای قەنارە

با سەرت ببڕن، بە پاکی بمرە

چی بێ سەربڕین بمرێ مردارە

* * *

ساڵی ١٩٥٣ لە کەرکووک، لە ستودیۆ سۆنا. شاگرد وێنەگر بووم. مەلا شوکور مستەفاش وچانی دانشگای بوو، بەجووتە لەوبەری خاسە لە ژووری ئوتێلێکدا بووین، من دەچوومە کار و شۆرباکە ئەو لێی دەنا، ژیانی ئەو ڕۆژانەم لەو شیعرانەدا خستۆتە ڕوو، کە دەمەلاسکەی مەحویم کردۆتەوە:

## ئەگەر ئاوها نەکەم چ بکەم؟

لە کەرکووکم بەئاب، ئارەق لەبەر گەرما نەکەم چ بکەم؟

کە بەرچایی بە ماستی شل، بە پیاڵێک چا نەکەم چ بکەم؟

هەموو ڕۆژێ سەعاتێ دوان نەبێ، ئاوی ئوتێل دەبڕن

ئەگەر تەرخی دەم و چاو شتن و ئیستینجا نەکەم چ بکەم؟

لە حەوت و نیو دەبێ بۆ کار بچم، ڕێم چارەگێک دوورە

لە حەوت و چارەگێکڕا شانی بۆ پێدا نەکەم چ بکەم؟

لە (دارک ڕووم)ی پڕ هاڵاو و بێن ناخۆش و بێ مەنفەز

ئەگەر چەند تەبع و تەکبیرێکی بۆ (سۆنا) نەکەم چ بکەم؟

لە دوازدەی دێمەوە برسیمە ماندووم قرقری زگمە

کە ورگی لامەزەب تا مل پڕی شۆربا نەکەم چ پکەم؟

بە ماستاوێکی شین و تام نەدار، یان ئاوە بەفری زۆر

بەدوو هێشوو ترێ، یان گرکە بۆرێ با نەکەم چ بکەم؟

ئیتر هەر بانگی تەنزیلاتە یان شەربەت بە دوو فلسە

لە جێگەی خەو جنێودان، داد و واوەیلا نەکەم چ بکەم؟

سەر ئێوارە دووبارە کارە تا شەو کاتی حەوت و نیو

لەباتی سینەما و گەردش بەرەو خەو ڕانەکەم چ بکەم؟

شـــمــــەک هەڵگرتنە بۆ بان و خـــۆدانـە بەعـــەرزیدا
هەتا خەو دوو قسەی قۆڕیش دەگەڵ شوکرا نەکەم چ بکەم؟

***

ساڵی ١٩٥٢ لە مەیخانەیەکی بەغدا شەوانە بە چارەگە دینارێک حیسابی ئارەقی فرۆشراوم دەنووسی و بەو کارەمیان دەگوت بیلمانی. دەگەڵ محەمەد حەسەنی رەشادی چایچی لە ژوورێکدا دەژیاین، ڕۆژێکی هەینی کە وچانی هەردووکمان بوو، بەو شیعرە خەبەرم کردەوە:

## سمێڵ بابڕ

حـەمـە هەسـتـە لەخـەو بمبـینە ئەمـڕۆ
زگی برســـیم بەلرفـــە و تینە ئەمـــڕۆ
دڵم تۆقــیــوە بۆ دوو شــیش فـەشـافـیش
بڕۆ بیـــــهــــێنە بەزمی ژینە ئەمـــڕۆ
ســـمــێــڵی بابڕت دەرخـــە لە لێـــفـــە
ســـمــێــڵت زەرد، لوتت شــینە ئەمـــڕۆ
لە بیلمـــانی شـــەوێوە من خـــەواڵووم
خـومـاری تۆش، سـەرت سـەنگینە ئەمـڕۆ
مـــەڵێ ئاو کـــوانێ؟ جــیـــران چوونە بازاڕ
هەلی چاوشتن و ڕیش تاشـــینە ئەمـــڕۆ
وچانە و چایخـــانە و چوونە جــــادە
مـــەلا شـــوکـــور و عـــەلادین دینە ئەمـــڕۆ

***

شیعرێکە ساڵی ١٩٤٤ لە بۆکان نووسیومە، ساڵی ١٩٤٥ لە «ئاڵەکۆک»دا چاپکراوە:

## لای لایێ

ڕۆڵـە ڕووناکـــــــیی گـلێـنـەی چـاوم
بەندی جــــەرگ و دڵ، هێـــزی هەناوم

ڕێحـانەی بـۆن خـۆش سـوورە گـوڵەکـەم
ئـاوپڕشـکـێـنـی کـــــوڵـی دڵەکــــــەم
چۆڵەمـــەی ئەســـتـــۆم، ڕەگـی حـــەیـاتم
هەنـگـویـن و قــــــەندم نـوغـڵ و نـەباتم
خـــــەوی خـــــێـــــرت بـێ بـنـوە درەنـگـە
تـا کـــــــەڵـەبـابـی بـەیـان بـێ دەنـگـە
هــــەی لای لایـــە ڕۆڵـــە لای لایـــە
ئەمــــشـــــەو بەزەییت بـە منـدا نـایـە
ژێـربـەوە ڕۆڵـەی ژێـر و جــــــــــــوانم
لـە داخـی لانـک دەگــــــــــری، دەزانـم
دەڵێی بۆ حـەپسم، بۆ دەسـتـەبەسـتـەم!
بەو بەند و حەپسە من جەستە خەستەم!
لە نێـــو کـــورد نەبێ دەســـرازە نیـــیـــە
ئەو بەند و قـــفڵ و قـــەرازە چیـــیـــە!
کــــــــوڕم مـن بـیــــــرم لـە تـۆ زیـاتـرە
دەســـــتـــــرازە و لانـک بـتــــبێ چاتـرە
هــــەی لای لایـــە ڕۆڵـــە لای لایـــە
گـــوێگرە پـێت بڵـــێم لە بەر چی وایە
ڕاســـــتـــــە تـۆ نـەوەی شــــێــــری ژیـانـی
نـەتـەوەی پـاکـی گـــــەلـی کـــــوردانـی
بـەڵام چونکە کــورد ئەمـــڕۆ بێ کــەســە
بەشـیـان لە دنیـا کـۆت و مــەحـبـەسـە
بۆیە دەتپــــێـــچم تاخـــووی پێ بگری

نەک تـامـن مـــــــاوم لـە بـەنـدا بمـری
بـۆ چارەڕەشـــــیت نەمـــــاوە تـینـم
هەر پێم خـۆش نیـیـە مـەرگت ببـینم
هـــەی لای لایـــە ڕۆڵـــە لای لایـــە
هـەزار تـێـــــبـــــینـی دوارۆژم لایـە
بـۆت بەخت دەکـــەم عـــومـــری درێژم
ســـەد تاڵ و ســـوێریت لەســـەر دەچێـــژم
نەمـــامی باڵات بەفـــرمـــێـــسکی چاو
شـــەو و نیـــوەشـــەو لێی دەنێم شـــەواو
ســـەد چاک و پیـــرت بۆ دەخـولێـــمـــەوە
لەبن ســـێـــبـــەرت بحـــەســـێـــمـــەوە
هەر ڕەســـــیـــــدە بووی نەتەوێ زاڵم
دەتـبـــــڕێ و بەزەی نـایـە بە حـــــاڵـم
هـــەی لای لایـــە ڕۆڵـــە لای لایـــە
دەک خـــاکم بەســــەر، ڕەنجم بەبـایـە
پەشێـو پێت خۆشە یەخسیر نەمێنی؟
سەربەستیت پێ بڵێم بکەویە شوێنی؟
قـــەڵەم دەست دەیە، ببـــە مـــەکـتـــەبی
وەخت و بێ وەخت لە خـــوێندن نەبی
ئەوکـــاتەی لەگـــەڵ کـــاکت دووبەدوو
بکەن هاواری هەقی لە دەســـــچـــوو
دەس دەنە دەس یـەک بە ڕا و بەتەگـبـیـر
یەکـتـان بە قـەڵەم، یەکو بە شـمـشـیـر

هـــەی لای لایـــە ڕۆڵـــە لای لایـــە
شـــیـــریش جـــەوهەری لەقـــەڵەمـــڕایە

یەک نامـــە ڕەش کـــا بە داد و هاوار
یەک زەوی ســوورکـا لە خـوێنی بەدکـار
یەک لـە قــــوڕنـیــــشێ بڕوا بۆ تـکا
یەکێ قـــــوڕ بەســــەر دوژمن دا بـکا
ئەو پەلەقـــاژەی ئێــســتـــا لەکن من
دەکـــەی بەند لادەی لەدەست و گـــەردن
ئەو تـەقــــەلایەت بـۆ دواڕۆژ بـاشــــە
جـووچک هەوڵێ دە، بێ ڕوحــمــە واشـە

هـــەی لای لایـــە ڕۆڵـــە لای لایـــە
دەس لە دەس، تەوفـــیق لەکن خـــودایە

ڕۆڵە نیـــشـــتـــمـــان چاوی لە ڕێتـــە
دایـکمـــان هەویای دواڕۆژی پێـــتـــە
بۆیە هەندامت وەک مـــینای بێگەرد
خـــاوێن ڕادەگـــرم بەســـەد ڕەنج و دەرد
چاکـــەم دەیەوە، بۆ وەتەن وەک کـــوڕ
تۆش بیگەوزێنی لە ناو خـــوێن و خـــوڕ
پێت بڵـێم ڕۆڵە سـەر سـوودی چیـیـە!
بـۆ بـەردە بـازی ڕێـی ئـازادیـیـــــــە

هـــەی لای لایـــە ڕۆڵـــە لای لایـــە
نیـــشـــتـــمـــان بۆ تۆ دەســـتـــەو دوعـــایە

ڕۆڵە نامـــووست وەک خـــزمـــەکـــانت

نەفــرۆشی بە پوولّ دەســتم دامــانت
شــەرەف گــەوهەرە قــیــمــەتی نایە
دەویت رووڕەشی هەرتک دنیــــایە
ئەوکــەســە پیــاوە بۆ خــاک و ئاوی
ڕۆح دانــێ و بــەچــاک بمــێــنــێ نــاوی
نەتبیــســتــوە واتەی زانای ســەرزەمین:
مــەردانە مــردن نەک حــیــزانە ژین
هــەی لای لایــە ڕۆڵــە لای لایــە
بـخـــــوێنە، نەزان چی لەدەس نـایـە

***

بۆکان، خاکەلێوە ١٩٤٥- لە گۆڤاری هەڵاڵەدا چاپ کراوە:

## لێفە شڕە

منو نینۆکم لەشکرمــان گــردە
لەگـەڵ کـێـچـانمان هەر دەست و بردە
هەمــوو شــەو تا ڕۆژ پارێزێ دێنن
دزی شــمــەک نین، دوژمنی خــوێنن
تـا بەری بـەیان شـــــەڕ و هـەڵڵایـە
هەر کـێـچـە و بۆمن دەس بە تێـلایە
شــەوانە کــاری ســەد هەزار نیــیــە
کـە ڕۆژ ڕووناک بوو یەکێ دیار نییـە
ڕۆژ، تا دەریـان کـەم تەئمین بێ ژینم
هەرچی دەگــــەڕێم یـەکێ نـابینـم!
لێــفــە شــڕێکمــان هەیە پـواوە

بە ســـەر ئادەم و حـــەواش دادراوە
بەری لۆکـــەیە و پشـــتی ڕیتـــاڵە
هێند کۆنە،عاسمان پێی دەڵێ خاڵە
جارجار کە هەستی سەرمایەم دەکرد
بە ناعـــــیـــــلاجی پەنام پێ دەبرد
مەمنا مام لێفە سەر بەگێچەڵە
لەســـەر ئەودایە هەرچی گـــۆنگەڵە
ئەو هەمـــوو کـــێـــچـــە لەوی هاڵاوە
ئەو هەرایە ئەو بنیـــــــاتی ناوە
تومـــەز خـــەریکە ڕیشـــەم دەرێنێ
بۆ ڕەحـــەتی خـــۆی من بفـــەوتێنێ
هەتاکو بەڕۆژ بە حوکمی قانوون
بۆم مەحکووم نەبن پاکی ون کردوون
شەو پێیان دەکا ئەو کارەساتە
بە ڕۆژیش جێگای ئیستیحکاماتە
ڕۆژێ دادەنرێ لەســـــــەر هەرزاڵێ
خۆی لێ کردوومە کەیخودای ماڵێ
زۆر حەق بەجانب بەشەرم و عوزم
ئەگـــەر فـــڕێی دەم بێگانە و خـــزم
دەڵێن ناحەقتە، شەروور و جەردەی
خـــودا چۆن دەرچم لەو بگرەوبەردەی!
من لێـــفـــەشـــڕەی خـــۆمـــە دەیناسم
بە شـــەو بردوویە خـــەوو حـــەواسم

به ڕۆژ نەتوانم فـــڕێی دەمـــە دەر
ئەی منی هەژار کام خۆڵ کەمە سەر
بازیچـەی دەسـتی سـیـاسـەت منم
دۆسـتم دڵ بەخـەم، شـادن دوژمنم
ئەی شـورای مـیلەل ئەگەر راست دەکەن
لەزوڵم و زۆری بازخـواست دەکـەن
شـەرعی من دەگـەڵ لێـفـەشـڕ بکەن
ئەو بسـووتێنن با کـێچ قـڕ بکەن

***

مهاباد - ١٩٤٥:

## غەزەل

ئەرێ ئەی کـیـژە کـوردەی چاو کـەژاڵە
ئەرێ ئەی شـۆخ و شـەنگەی چاردەسـاڵە
ئەتۆ خـۆت کـورد و خـوێنی لاوی کـوردان
بە تورکی چاوی مـەسـتت کـرد حـەواڵە
بە خـوێنی مـەی دەدەی ئاوی مـژۆڵت
بژانگت بۆچی سـەرنێـزەی کـەمـاڵە؟
ڕنووی سەر «ئاگری»ن لاجانگ و کوڵمت
لە خـوێنی نۆجـوانـاندا شـەلاڵە
بڵێی ئێـران و عـارەب بێ دڵی تۆ!
کـە لێی تەئسـیـرێ ناکـا ئاهوناڵە!
مـەگـەر چاڵی چەنەت زیندانی قـەسـرە
کـە ڕزگـار بوونی ئێـمـەی لێ مـحـاڵە!

تـەنـاڧـی زوڵـفـت ئـاوێـزانـی بـاڵات
نـەمـــــانـی هـاونـەژادانت خــــــەیاڵـە
ڕۆحت بـردم بە قـــەندی لێــــوەکـــانت
دەزانـی کـــورد بـە قـــەند وێرانـەمـــاڵـە
قـەباڵەی عـاشـقـیم زۆر مـوعـتـەبەر بوو
چ قـــەومـــا چاوم ئـەمـــڕۆ پێت بەتاڵـە
لە ئاهو ئەشکی بێـــچـــاران بتـــرســـە
وەئـەســـتـــۆ مـــەگـــرە چیـــدی ئەو وەباڵە
مـــەگـــەر ترست نیـــیـــە دەســـتی زەمـــانە
وەرێت بێنێـــــتـــــەوە ئـەم ژینـە تاڵـە؟
کــوڕی شـــێـــران و زۆرزان بووم، لەدەس تۆ
هـەژارێـکـم زمـــــــــانم لـەنـگ و لاڵـە

***

مهاباد – ١٩٤٥:

## دیسان غەزەل

نەســـــرینـی قـــوندیلانـەوو نـازداری نۆجــــوان
چاتر نموونـە، ســـوورەگـــوڵی باغـی کـــوردســـتـــان
کـوڵمت گـەش و بەتینە وەکـو جـەوری مـوسـتـەبیـد
پرچت ڕەش و درێژە وەکــــو ڕۆژی کـــــوردەکـــــان
بەژنت هەقی ژیانی هەمـــوو مـــیللەتی بچـــووک
ئـازادی کـــوردســـانە دەمت لێی نـیـــیـــە نیـــشـــان
دوژمن بەتانـگ لە ســەرتە ئەتۆ تـازە سـازدەکـەی؟
لەم قـەڕنی بیـــســـتـــە تیـری مـژۆڵ و برۆی کـەوان

چاوت هەواڵی بەخــتی منە ڕۆژ و شــەو بەخــەو
نـازت مـــیـــســـالی دەردی منە دەم بەدەم گـــران
ئەگـریجـەکـەت کـە دێتــە نەزەر ڕووتی گـرتووە
دڵ ژان دەکـات و دێتـەوە بیـر وەزعی نیـشـتـمـان
بەم کـیـژییـەش دەزانی کـە هاوخـوێنی خـۆت نەبێ
نـابێ بەیاری بگری، هەژار بەســیــەتی ئەمـــان

***

## تێهەڵکێشی شیعری حافظی شیرازی

الا یا ایها الساقي

لە نیــسکێنە و لە سـاوار پڕکـرا زگــهـا هەتا ملهـا
برنج هەرزان ببــوو ئەووەل ولی افــتــاد مــشـکلهــا
کە دیزەی کەشکەکی هێنا و سەری لاگرت کەبانووی ماڵ
زتاب قــوڵتی هەڵمــینش چخــون افــتــاد در دلهــا
مەلاو شێخ هەرچی فـەرمویان لە باسی خورادنا ڕاستە
کــە ســائل بیــخــبــر نبــود ز راە و رسم منزلهــا
پەتاتە خۆرەکـان با ڕێک کـەوین و چاری زگـمـان کـەین
کـــجـــا دانند حـــال مـــا پلاو خـــوران و زگ زلهـــا
چ مەولوودێکە کردی حاجی سەگباب هێشتە هەر برسیم
تـەرەس فـریاد مــیــدارد کـە بەربەندید مــەنجــەلهــا
لەسـەر یاپراغ زگـیشت هەڵدڕن سنگ بێنە پێش حـافظ
مــتی مــا تلق من تهــوی دع الدنیــا وامــهـلهــا

***

من جرب المجرب

بلّــێن بەو ئاو و گــۆشــتــەی پڕ دوگ و نۆک و تامــە
أنـيّ رأيت دهرا من هجـــرك القـــيـــامـــة
یەکــجــار گــەرم بوو دۆکــلّــیــو ئاوی لە چاوی هێنام
لـيـــست دمـــوع عـــيني هذا لنا العـــلامـــة
چێژتم لە ماست کەبیکرم، بەقالّ قەلّس بوو فەرمووی:
مـن جًـــــرب المجـــــرًب حلًت بـه الندامـــــة
وازم دەچێـــتـــە کـــارگ، دەخـــۆم دەمم دەســـووتێ
في بعـــدها عـــذاب في قـــربهـــا الندامـــة
لام خـۆشـەویسـتـە گـیـپـە و لۆمـەم دەکـەن سـەروپێ
والله مـــــا رأينا حـــبـــاً بلا مـــلامـــة
قـــامکم دە ئەســـپـــەناغ نا زەردێنە هێلکە دەرچوو
كـالشـمس في ضـحـاها تطلع من الغـمـامـة
دۆی ترشی دیوە چاوم ســـــــرەوتی نایە لیــــــچم
حـــتى يذوق منه كـــاســـاً من الكرامـــة

***

## نەی پسێنی

گـــەر هەلّمـــەدوگی دیزە بـلاّو بکەی بە فـــوویی
بە ازانکە تاج شـــاهی و همـــە روزهای و هـویی
چاولێک دەنێم لـە کـــاتێ یاپراغ دەنێــــمـــە زارم
کـــــە نظر دریغ بـاشـــــد بـجنـین لـطیف رویی
پێـــو درۆ نەبێ کـــە بمرم بۆ تۆزێ کـــەنگر و مـــاست
کــە گـذشت عـــمـــر و نامــد خـبــری ز هیچ ســویی

هەر تێر بخۆم لە گۆشت و قبوولی، چش کە دەمرم
بجـــــــــزاین نماندمـــــــــارا هوسی و ئارزویی
دەخـــیل کـە بەن لە گـیـــپـە دەردێنی نەی پسـێنی
کـــە هزار جـــان «حـــافظ» بفـــدای تار مـــویی

* * *

## تێهەڵکێشی ناهیرەی مەلا باب

بێـــتـــو دووبارە چاوی من پێت بکەوێتــــەوە هوڵو
«شـــرح دهم غم ترا نکتــە بە نکتــە مـــو بە مـــو»
هەر وەکو شـێـخی ڕەش گـەڕام بۆ دوو دەنک پلاو منیش
«کـوچە بە کـوچە، در بە در، خـانە بەخـانە کـو بەکـو»
دوێنێ لەسەر کەوڵ کە دیم گیپە، بەغـار هەڵم وەشاند
«ڕشـتـە بەڕشـتـە نخ بە نخ، تار بە تار، مـو بە مـو»
گــەیە پەنا ســەمـــاوەری چا، وەرە تێکە دەو زگــە
«دجلە بە دجلە، یم بە یم، چشمە بە چشمە، جو بە جو»
دەفـتـەری عـومـری خـۆم گـەڕام باسی چلەی نەبێ نەبوو
«صـفـحـە بە صـفـحـە لا بە لا پردە بە پردە تو بە تو»

* * *

## چوارینە

بە دڵ گـــــیـــــــرۆدە بەو پرچی بە چینم
ڕەش و ئـاڵـۆزە وەک ئـەو بـەخـت و ژیـنم
دڵت گــرتم، خــەیاڵی خــۆت تیـــا دی
خـــــەوت بـردم کـــــە لەودا تۆ دەبینم

* * *

گــــــراوی داوی خـــــاوی ســـــەر بڕوام
کـــوژاوی چاوی مـــەســـتی نیـــوە خـــاوم
لە تیـــشکی ڕوومـــەتت ســـەردە هەناســـەم
کــــــــــز و بێ تـیـنـی ئەو بـەژنـی زراوم
***
دڵم تەنگە وەکـــو خـــونچـــەی دەمی تۆ
ســـەرم گـــێـــژە لە گـــێـــژی پەرچەمی تۆ
دڵ و گــــیـــــان و ژیانم دا بە مـــــاچێک
وتت: پێک نـایە، زۆری مـن کــــەمی تۆ
***
هروژمـــیـــان کـــردە دڵ تیـــپی مـــژۆڵت
بەخـــــوێـن پاراو کــــرا جێ ژوانـی چۆڵت
دەسی دڵ بگرە خـــوێنڕێژی هەتا کـــەی؟
بـەزێکت بێ بە دڵداری کــــــڵـــــۆڵت
***
جگـەر لەت لـەت بە ئـەبرۆی تـازە ســـــاوم
لـەپـت ســــــــوورە لە خـــــوێـناوی رژاوم
خـــەیاڵم پەرتە بۆ خـــڕخـــاڵی قـــۆڵت
زرەی لــە رزانــەکـــــــــــــەت بـــردی زراوم
***
ددان مــــــرواریـیــــــە و هـەریـەک لەوانـە
لەنرخـــا گـــەنجی قــــاروون ناتـەوانە
لە ســـووچی لێـــوەکــەت خـــاڵێک دیارە
لە گـــەنجت بێـــچـــوە زەنگی پاســـەوانە
***

له تینی کولمەکەت جەرگ و دڵم سووت
له تاوی چاوی جادوت بوومە هارووت
بەهەشت و کەوسەر و هەنگوین و شیری
بە شاباشی دڵۆپێک ئارەقی ڕووت
* * *
بە گریەم پێکەنی، خەندەت بە شینە
دەڵێی: پاش گریە نۆرەی پێکەنینە
دڵت گەر سەدیەکی سینگت نەرم با
نەرم بووی ئێستە بۆ ماچێک لە سینە
* * *
دڵی شێتم وەها گرتی گڕوو پێت
لە تاوان، پێی دەتاوان بەردی بەر پێت
چ ژین سەختم! چ دڵ سەختی گوڵی من
کزەی دڵ وەک کزەی با دێتە بەر گوێت
* * *
لە قەندی لێوی تۆیە ژینی تاڵم
له سووریی کولمەته به خوێن شەلاڵم
لەدوو مەمکی خڕت بیرم بلاوە
کولاو و کۆڵەواری سێوی کاڵم
* * *
پلاری تۆن کە دڵ چرژاوە ئەمشەو
جخاری تۆن کە خوێن پرژاوە ئەمشەو
مزەم چی بوو لە چاوی مامزی مەست؟
کە جەرگم بۆ مەزەی برژاوە ئەمشەو
* * *

لە چەشنی ئاگــــرن کــــوڵمی گـــەشی تۆ
لە مـــار حـــەســـتـــەم ترن پرچی ڕەشی تۆ
بڵـــێم وەک چی دەچێ؟ هەر گـــوڵ دەزانم
لە گـــــوڵ نـاسکتـــــرە ناسک لەشی تۆ
***
لـە تـاریـکـایـی پـرچـت بـێ ســـــــەرەوەدەر
دڵم گـــــێــــــژ و هـوڕە چەشنـی سکـەندەر
بـەڵام ئـاوی ژیـان لاجــــــــانـگـی تـۆیـە
بەڵام ڕەشـــمـــاری بسکت بوونە لەمـــپـــەر
***
لە گــــــوارەی پڕ پەڕەنـگ دڵ پڕ پەڕەنـگم
چەمـــاوی بەژن و باڵای شـــۆخ شـــەنگم
لە ســەر سـینگی سـپـیت چاوم سـپی بوون
لە تـاوی زەردە لیـــــمـــــۆت زەردە ەڕنـگم
***
لە لـێـــــوت زامـی جــــەرگم پڕ نمەک بـوو
لەسـێـوت خـەم لە ناو سـینەم کـەڵەک بوو
لـە ســــــایەی گــــــەردنـی تۆ بـام وچانـێ
لە ئـەولاش داری تـووبـام نـا گــــــەرەک بـوو
***
دەبێ بە کـوێ بگەی؟ هێـشـتـا نەگـەیوی
لە روخـســـارا بەهەشـتی، ڕۆژی، هەیـوی!
هـەزاران داود و دەنـگـی زەمـــــــــــووری
دەبەر لـێــــوت مـــــرن کــــاتێ دەپـەیوی
***

دەپرسی چۆنە چێژەی خەم دەچێژم؟
لە بەر چی دەرد و زوخاو هەڵدەڕێژم؟
بژانگی تۆ دڵی کردوومە بێژنگ
کوڵ و خوێنی ئەوینێ دادەبێژم!
***
بە داوی کەزیەت دڵ دالەقاوە
بژۆڵت ڕێزە نێزە تێی چەقاوە
وچانێک، لێوی قەندم پێ ببەخشە
جگەر برژاوە گەر پێت خۆشە قاوە
***
زمان بۆ پەسنی ئەو لێوە ئاڵە لاڵە
گلێنەم تانەداری دانە خاڵە
بە پیری چووم بەرەو پیری مناڵێ
دڵی بردووم کچۆڵێک چاردە ساڵە
***
بە چاوی تۆ دڵی ژار و گرفتار
بەدڵ مەرگی دەوێ ڕۆژی هەزار جار
لە رێی ئەم جوانییەت تۆزێک بەزەت بێ
هەژاری تۆم لەمردن مەمکە ڕزگار
***
بەژن شۆڕ و کەزی شۆڕ و خەزێم شۆڕ
سەرەو شۆڕم دەکەن سەرشۆڕ بەرەو گۆڕ
هەژار و خوار و لەش بیمار و دڵدار
دەبا وام لێ بێ، مافی خۆمە هەی گۆڕ!

***

دەمی کۆچ بارەکەت ناچێ لە یادم
دەبێ وەک کوشتمت بش پرسی دادم
«کە بارگەت بۆ هەوار تیک نا، دڵی من»
«شکا ئەستوندەکی تاوڵی مرادم»*

***

دڵم دەیزانی ڕادەبڕی بە سەرما
بەڕێی کرد دووا هەناسێکی لە بەرما
بە چاوم ئاوڕشێنی ڕێگەتم کرد
گیان دەرکەوتە پێشواز و لە دەر ما

لەدەست ئەو چاوە مەستەت نیمە چارە
لە ناخێم ڕادەکەن دەرد و پەژارە
لە کێلی گۆڕەکەم یاران بنووسن:
کوژراوی گەردنی کێلە و هەژارە

***

گوڵی باخان لە شەرمی کوڵمە سوورە
لە رووی ئەو پەلکی گوڵ ئەستوورە، زوورە
گوتم: مردم، نەگەیمە ماچێ، فەرمووی:
هەژار بم بوورە! دوورە ئەو سنوورە

***

بە سەرگەردانی ژێر گەردانەت بم
بەلاگەردانی بالا جوانەکەت بم

* ئەم تاک بەیتە هیی شاعری بەناوبانگی موکریان، هێمنی مەهابادیە.

ئەوا تۆم دی لە سەر کوشتەت دەکەی شین!
بەگۆڕی چاوە پڕ گریانەکەت بم
***
لە گەڵ تۆدا کەسێکی دەم دەمانە
چکارێکی بە خۆشی پاش نەمانە؟
مەی و کەوسەر لە گۆشەی لێوی ئاڵە
بەهەشتی خۆش لە شێوی ناو مەمانە
***
چ خۆشە پاش ئەم تۆرانە سازان
چ شیرینە وتەی ڕاز و نیازان
بەسم بێ جەزرەبەی شەوگاری دووریت
پتر مەی هەنجنە جەرگم بەنازان
***
وەرە تاوێکە گوڵزارت نەدیوە
لە تاوت خونچە سینەی دادڕیوە
وەنەوشە دوور لە باڵات خۆی دەهەش نا
هەڵاڵە زەردە، نیرگز ڕەنگ پەڕیوە!
***
وەرە ئەی بەندی جەرگ و ماکی ژینم
وەرە هەتوانی گش دەرد و بڕینم
شەوی ڕەش ڕۆژی ڕوونی بەختی من بوو
کە لەودا تۆ نزیکی خۆم دەبینم
***
شەوە، دنیا وەکو خاڵت سیاپۆش
وەرە با دەردەدڵ بکرێن فەرامۆش

دەسم دەستۆکە، با بتگرمە باوەش
ئەگەر مردم لە خۆشیان، چاوی تۆ خۆش
***
کش و ماتە جیهان لە ژوانی لە نویَ
گەلاویَژ بۆمە دەڕوانیَ لەسەر سویَ
چریکەی بولبولێک دیَ، وا دەزانم
چپەی ماچی من و تۆی هاتە بەرگویَ!
***
شەوە، ئەستێرە بە زریوەن لە سەرمان
لە مانگی ڕووت هەناسەم بۆتە خەرمان
تکەی ئاونگی کولّمت تەڕ دەکا لێو
گەزۆ باری لە گەرمان و لە شەرمان
***
ژیانم چوو هەژار و دەستەو ئەژنۆ
چلۆن ڕووی داوە دەست و گەردنی تۆ!
ژیانی دووایەشم بۆ تۆ خودای شەو
بەرەو ڕۆ خۆش مەڕۆ، تۆزێک لە سەرخۆ
***
شەوە، لەو سەوزە زارە لەو دەم ئاوە
مەکۆی خەم لاچووە دەمکولّ چ ماوە؟
مەکە و لاچۆ و دەمانبینن بیانوون
بەیانە و دەم بنێ دەم، دەم نەماوە
***
هەتا مردن لە دلّدا سینە ماکە
دلّت چەند چاکە! دلّداریت چ پاکە!

له تاریکایی دۆستی دەست لەناو دەست
کە تیشکیدا چراکە، بوومە کاکە
***
لەلامی، گیان پەپوولێکە لە ڕووتا
ئەگەر لێم دوور دەبی دڵ دێ بەدووتا
لە نێزیکی و لە دووریت خاکە سارم
ئیتر یا دڵ یان گیانە سوتا*
***

## زەردی لیمو

چارەڕەش بووم و لە ڕێی خاڵی ڕەشا بێچارە مام
دەک چ گیان سەختم کە من تا ئێستە هەر لەو بارە مام
(من لەگەڵ مەجنونی هاوڕێ بوم لە ڕێی شێتی و ئەوین)*
(ئەو گەیی بە نیاز و من بێ دڵ و ئاوارە مام)
بۆ هرووژم کەوتە کار شیری برۆ و تیری مژۆڵ
کون کونی دڵ دوور لە هەژمار و جەرگ سەد پارە مام
گوڵ بەدەن ئەمڕۆ لە گوڵزارا گوڵی پشکووتبوو
گوڵ دەپشکووتن لە دەم، سەرسامی ئەو گوڵ زارە مام
بوبولێ لە دیاری گوڵ دڕکی لە قاچی ڕا دەچوو
من بە دڵما چوو لە سەیری ئەو گوڵی بێ خارە مام
شەوڕەشی پرچت دڵی ساوامی وا دێوانە کرد
هەر لە منداڵیمەوە بەو تارەوە پەتیارە مام
پێم لێ ڕەنگ زەردی وەک لیمۆی هەژاری من وتم:

---

* ئەم چوارینە لە خەوا گوتراوە. * ئەم بەیتە لە فارسییەوە وەرگێڕاوە.

ڕەنگ نەمــاوی ئەو نەمــامی بەژنی لیــمــۆ دارە مــام
پیم دەڵێ: رەنگ زەردی وەک لیــمــۆی هەژاری من وتم:
ڕەنگ نەمــاوی ئەو نەمــامی بەژنی لیــمــۆ دارە مــام!

***

## ژوانێک

یارە جــوانەکــەم گــوڵەی شــۆخ و شــەنگ
خــونچــیــلانەکــەم دڵ گــوشــای دەم تەنگ
ســـەر کــوڵمی گــەشت برەو بەری گـــوڵ
خـــوا داویە بەشت گـــشت نیـــازی دڵ
بە قـــــژی زێرینت بە لێـــــوی ئاڵت
بە چاوی شـــــینت بە دانەی خـــــاڵت
زەرد و بێ تینم شـــــەتڵی خــــوێناوم
خـــــەریکی شـــــینم تانە لە چاوم
زانیت دەمـــــــردم بەو بەژنی باریک
ڕزگـــــارت کــــردم لە ژیانی تاریک
ئەمــــشــــەو وەدیارە قــــەدری دڵانە
جــــەنگەی بەهارە مــــانگی گـــولانە
چاو جــــوان دەمـــــێکە ئەویندارى تۆم
زامم گـــــــــەلێکە برینداری تــوم
منێکی بێ هەل هەژاری کـــــڵــــۆڵ
پیـــر و ددان کــــەل وەک داری کـــرمـــۆڵ
کـــز و بیـــمـــارم خــەمــبـــار و ســـەرشـــۆڕ
وا لەســـــەر بارم بۆ گــــــۆڕ چاوەنۆڕ

کەی بیرم دەبرد جوانێکی وەک تۆ
سەد لاو بۆت دەمرد گیانێکی وەک تۆ
تۆی شلک و ناسک، تۆی وا نەرم و نۆل
تۆی سڵ وەک ئاسک تۆی وا خڕ و خۆڵ
وەک تۆ نازدارێک ئەویش وا بەشەو
هامێزم جارێک بکا بە جێ خەو
لەو تاریکایە بەو شەوە خۆشە
هەتا هەتایە دڵ بۆی پەرۆشە!
بە سیلە چاوێک زیندوو بوومەوە
وەک تازە لاوێک تێ هەڵچوومەوە
ئەمە تۆی ئەمشۆ لەناو باوەشم
دیتم لە ئاسۆ ئەستێرەی گەشم
ئەو سینەی نەرمت لە دڵ چەسپاندم
تارمایی شەرمت لە ڕوو تاراندم
دەخشێن لە لێوت لێوی بە بارم
لە کوڵمی سێوت گۆنەی نزارم
لە باغی ساوای پاوانی سینە
پەنجەم سەرگەرمی لیمۆ کوشینە
ئۆخەی وا دیسان خۆشیم دی شەوێک
ئەویش بۆ ژیان لێم بوو بە خەوێک
هەتا بۆ ژێر گڵ گلار بوونەوەم
ناخوازم بە دڵ بێدار بوونەوەم

***

# بەشی چوارەم

ئەوانەی بە دڵ نەخۆشن یان چاو لە ڕاستی دەپۆشن، تێ دەکۆشن: مەلا مستەفا بارزانی بە پیاوی شا و جوولەکە و ئەمریکا دانێن و خۆیان لە چاو ئەو بە کوردی بێ خڵتە و خاڵو ئاڵ ڕانێن. ئەوانەی خراپەی دەڵێن، هەرگیز ناڵێن دوازدە ساڵ لە مۆسکۆ ژیاوە و دەگەڵ پیاوە گەورەکانیاندا هەواڵ بوو. هیچیان ناڵێن لە شۆڕشی دژی بەعسی، ڕووسیاش وەکو ئەمریکا و خێرەومەندانی ئورووپا بەپووڵ و دەرمان و شمەک یاریدەی بارزانی داوە. ئەگەر هێندێکیش نەیزانن؟ ئەوانەی ئێستا لە کاردان. زۆربەیان ئاگایان لێیە و دەزانن قسەکەم ڕاستە. ڕۆڵی شا هەر ئەوەندەبوو دژی بەعسی تەنگەی هورمز و ئەهوازخواز، ڕێگا بدا بە ئێراندا کۆمەگ بە بارزانی بگا. ئەویش چلۆن گەیشتنێک؟ هەرچی هاتۆتە ئەم دیوە؟ هیچ نەبێ نیوەی دزیوە. کاتێ بەعسی دەگەڵ ڕووسان پەیمانی پازدە ساڵەی بەست. لاشیان وابوو نەوت و خەلیجیان کەوتە دەست؟ ویستیان بارزانی ناچارکەن کە شۆڕشەکە دەس بەردا و هەرچی بەعسی ئیملای دەکەن؟ ئیمزای بکا. دەنا دەستی لێ بەردەدەن و بەعسیانیش زۆر بەهێز دەکەن. بەعسیش دەیانگوت کەرکووک و خانەقین و لیوای دیالە و شێخانیش نابێ لەسەر کوردستان بێ، دەشبێ وەک حزبی کمۆنیست بێنەبەر فەرمانمانەوە و ببنە نۆکەری خوێڕیمان. بارزانی زانی مردن و لەناو بردنی شۆڕشی زۆر لەوە بە شەرەفترە کە ئەو مەرجانە قبووڵ کا و سەری بۆ ئەو نەنگە شۆڕکا. ڕووس بەعسی بە هەموو چەکێکی ترسێنەر و ڕووخێنەری خۆی تەیار کرد. ئەمریکاش دی ئەم هەویرە زۆر ئاو دەبا. بە ئێرانی گوت: ڕێ بگرە و دەستی لە کۆمەگمان بەردا. وەک ئێستا کە لە شای بەردا. وەکو خۆم باش ئاگام لێیە، ئەوی ڕاست بێ: ڕووس ئێمەی بە شکاندن دا. دەنا بومدیەن و شایەک نەیاندەکرا بە ماچی سەددامان بدەن. بارزانی زۆرباش دەیزانی دەرۆستی ڕووسیا نایە و ڕووسیش وەک هەموو دەوڵەتێک بۆ قازانج و سوودی خۆیان باوکی خۆیانیش دەفرۆشن. نەشیدەویست هەزاران لاوی کوردی دیش بە خۆڕایی بە قڕ بدا. ناچار ئەویش وەک زۆر لە پاڵەوانانی تاریخ شکا و هومێدی بوو ئەو لاوانە کە دەمێنن دواڕۆژێک هەل وەگیر دێنن و دەبنەوە شۆڕشگێڕی کورد. چاکیشی کرد کە بە قسەی ڕووسانی نەکرد. ئەوا دیمان ئەو سوورانەی بە فەرمانی ڕووس چوونەوە بەردەستی بەعسی. چیان لێ هات و ئێستا لە کوێن؟

ئێمە هاتین بەم دیوەدا و بووینە یەخسیرێکی عەوداڵ، وەک تۆوی گاڵ لە زەوی

کوردستان نەبێ لە هەموو شار و دێهاتی ئێراندا بڵاویان کردین. بە قەولی شا "تا جەزب بین". زۆرمان لە گەرمان، لە سەرمان، بێ جێگە و بێ نان و دەرمان، لە ناو بێگانان لێ مردن و کەس شینێکی بۆ نەکردن. من کە جاری دووهەمم بوو کۆشکی هومێدم دەڕمیا؟ خۆم بە تەنیا دووقات بەقەد هەموو لێقەوماوان خەمگین و سیس و ژاکاو بووم. هەرچەند بە تکای بارزانی نەگیرام و هەر دەگەڵ بارزانی دەژیام، ئەگەر قسەی ڕاستت دەوێ! وەک کەوێ لە تەپکە کەوێ لە فڕە کەوتم. بڕیارم دا پاش ئەو هەموو بەڵایانە. بەلای شیعر و میعرا نەچم. بەڵام کۆچکردنی بارزانی. کوورەی دڵی ساردەوە بووی نێڵ دامەوە و لە بڕیار هەڵگەڕامەوە. لەوساوە کە هاتوومەوە؟ بۆ یەکەم جار بۆ بەڕێ کردنی بارزانی شیعر هاتووە بە لامەوە. ئێستاش ئەوا جاروبارە خاریج لە کاری ئیدارە کاوێژی کۆن دەکەمەوە، ورتە ورتێکم لێوەدێ. بەڵام وەک خۆم تا بڵێی کەم نرخ و بێ بایین.

***

شنۆ، ١٥/ ١٢/ ٥٧

## بارزانی نامرێ

بــارزانــی پــاڵــەوانــی کـــــــــــــــورد
هیـــــوای پیــــر و جـــــەوانـی کـــــورد
خـــــــەبـەریـان پـێ دام تـۆ مـــــــــردووی
بـــە دیمـــەن لـــە بـــەرچـــاو ون بـــووی
مـــن دەزانم تـــۆ نـــامـــــــــــــــــری
تـۆ لـە مـــــــــــردن بـە هـێـــــــــــزتـری

***

ڕۆژێــک لـە نــاو شـــــــــــاخ و چـڕێـک
دێتـــــە ســـــەر ئەم زەویـیـــــە کـــــوڕێـک
نـۆ مـــــــــانـگـە، لـەبـەر مـــــــــەمـکـانـە
دایـکـی یـەخـــــــســــــــیـــــری تـورکــــــانـە
بێـــــشـکـەی کـــــوڕ: زیـنـدانـی ڕەشــــــە

لە ڕۆشنایی بێ بەشە
زڕەی زنجیری دوولایی
بۆتە دەنگی لای لایی
جێ گاگۆڵکە و دارە دارە
گۆشەی زیندانی شەدارە

***

ئەمەن چاردە ساڵە جوانێ
بە دەوری خۆیدا دەڕوانێ
هەرچی دەیبینێ ئەسیرە
وەک دایکی مل بە زنجیرە
کوردگەل مەڕی بێ خودانە
چەقەڵ بێری، گورگ شوانە
لە حیرسان خوێنی دەجۆشێ
ژین بە ئازادی دەفرۆشێ
لێ بڕاوە تۆڵە بستێنێ
بەندی خەنجەر دەترازێنێ
کاڵەی مووین هەڵ دەبەستێ
کێ هەیە ئەو پێی نەوەستێ؟
کوردخۆران قەڵت و بڕ دەکا
کوردستان گران شڕ دەکا
تورک و عەرەب دەبەزێنێ
جەرگی شاهان دەتەزێنێ

دوژمن لە زەبری دەتاسێ
کێ بێ بارزانی نەناسێ؟

***

بەر لە شۆڕشی بارزانی
کەس بە کوردی نەدەزانی
ئەو کوردی بە دنیا ناساند
هاواری بە دنیا گەیاند
لەهەر چوار قوڕنەی دنیادا
لەسەر بەژ، لەناو دەریادا
بە کێ بڵێی کوردستانیم
پێت دەڵێ بڵێ بارزانیم
جاشە دوژمنە کوردەکەش
بە هۆی ئەو بوونە خاوەن بەش
ئەو نانی دەیخۆن هی ئەوە
لە وڕا گرچوویان پتەوە

***

بارزانی شێست ساڵی ڕەبەق
جێ خەوی تاشەبەردی ڕەق
بەشاخ و شکێڕانەوە
بە بەندەن و لێڕانەوە
لە غوربەت و دەربەدەری
غەمخۆر و لە خۆشی بەری
بۆ گەلی کورد چەوسایەوە

قـــــەت تـاوێـک نـەحـــــەســــــایەوە
بـــەرەو ئـــازایـــەتـــیـــی هـــان دایـــن
ڕێگەی پیــــاوەتیی نیـــشـــــان داین
دوژمـنـی بـۆ بێ هـێــــــز کــــــردیـن
تــاریـکــی لـەســــــــــەر لابـردیـن
مــــانگی عـــاســـمــــانی کــــوردانە
بـێ ئـاوابـوون و نـەمـــــــــــــانـە
ئـەوانـەی بـە مـــــــــــانـگ دەوەڕن
لەڕاست لۆمــــەی ویجــــدان کـــــەڕن
***
بـــــارزانــــی بـــــابـــــی هـــــەژاران
هــــەتـــوانــــی دڵ بــــریــــنـــداران
شــــیــــوەن شـــایانی تۆ نیـــیــــە
ئەســـــرین ڕژتن چی بۆ نیـــیـــــە
مـن بـۆ دەربـڕیـنی هـەســــــــــتم
پـەیمـانـت دەگـــــــەڵ دەبـەســــــتم
تـا دەمــــــــرم پـێت وەفـــــــاداربم
چـۆن بـووم هـەرهـەمــــــان هـەژاربم
***
بـارزانـی پـاڵـەوانـی کــــــــــورد
هیــــوای پیــــر و جــــەوانی کــــورد
خـــــەبـەریـان پێ دام تـۆ مـــــــردووی
بـــە دیـــەن لـــەبـــەرچـــاو ون بـــووی

مــن دەزانم تــۆ نــامـــــــــــــــــری
تـۆ لـە مـــــــــــردن بـەهـێـــــــــــزتـری

***

وەک ئەیزانین لەسایەی خوا و گەلانی نەبەزی ئێران بەسەرۆکایەتیی خومەینی ئاگری ستەمی شا و ساواک بە خوێنی ڕژاو کوژاوە، گەلی چەوسێنراو و ژاکاو بەو ڕزگاربوونە بووژاوە. دەشیزانین کورد، ئازەری، بلووچ و تورکومان، عەرەب کە چەند قات ستەمیان دیبوو؟ لەم ڕێگەدا بۆ جوێندان بە شا و بۆ خوێندان لە فارسەکە نەمایەوە. من لەلام خومەینی ئیمام بە ڕاستی بوو کە دەیفەرموو "لە ناو گەلی موسوڵماندا فەرق و جیاوازی نییە"، بەڵام داخم ئەوانەی دەورەیان داوە؟ باوەڕناکەم هەموویان وەک فریشتە بن. بۆ نموونە سەفدرۆکە و خاڵخاڵۆکە و چی چیلۆکەی وا پەیدابوون، بەناوی تەوحید، تەفرەقە و ئاژاوەیان خستە ناوو بوونە مایەی خوێن ڕشتن و براکوشتن لە کۆماری ئیسلامی یەکترگرتوودا. هەر لەو ساوە داوای ڕەوای کوردی موسوڵمانیان دایە دواوە؟ دواییش گەلێک کاری نالەباری بەدوداهات؟ جاروبار لەبەر خۆمەوە هەرچەند لە شیعریش چوومەوە؟ قرتە قرتێکم کردووە. وا لە هەشتێ مشتێک دەخەمە بەرچاو، تا تێ بگەی کە چەند لە شاعری دوورم.

تاران، ١٥/ ٢/ ٥٨:

## دەمەتەقەی قۆیتاس و پیرۆت

ق ـ مەرحەوا پیرۆت. خاسی؟ وەشەنی؟
باســـوخـــواس چەیە؟ وەچی: ئەخـــەنی؟
پ ـ وەخـــوا بێـــژم چە؟ لەگش لا قـــاوە
ئێـــژن تاغـــووتی کـــۆســـتی ڕمـــیـــاوە
ئینقـــیـــــلاو بـووگـــــە، ئێـــران ئازادە،
ڕەژیم بەربادە، مـــــــــەردم دڵشــــــــادە
گش کـــــەس لەم وەرزە دەمـــــاخی بەرزە
کێش ناڕازی وێ مـوفـسـیـد فـیل ئەرزە
ســـــاواک گـــــاگـــــەلن وە بەریان ئەدەن
قـــەســـاو کـــومـــەیتـــە لە ســـەریان ئەدەن
ق ـ کـوچکت لێ واریێ پیـــرۆتـە گـــێـــژە

ئەم فلّتە فلّتەت وەکوردی بێژە
ڕەژیم و تاغووت ماڵ چە شارێکە؟
موفسید فیل ئەرز بەر چە دارێکە؟
پ ـ راس ئێژی ئەشێ بمبووری قۆیتاس
وە کوردی ئەوشم قسیە و دەنگوباس
مەردم وە گشتی یەک ڕەنگ و یەک دەنگ
کەفتنە مەیدان وەچەنگ و وەسەنگ
قەلای زۆرداری ملهوڕیان ڕماند
لەشکریان شکاند، تۆڵەی گەلیان ساند
لەم تێ بەردان و ڕاوە وەرازە
شاو قەوم و قیلەی بوون پەڕەوازە
شاکەی ئەوساکە ئیسە تاغووتە
ڕەژیم چتێ تاڵ وەک ژەقنەمووتە
موفسید فیل ئەرز، واسە دژ مەلا
کەفتۆسە سەریان گش قەزا و بەلا
کومەیتە واسە مناڵ یەل وەچەک
ڕیش وەبان چەنە، دەس لەسەر کوتەک
ق ـ نایژی ئەم جەنگە ئەڕای چە کریا؟
تاغووتی بووچە لە تابووت نریا؟
پ ـ مەلاگەل ئێژن ئەڕای سەربەستی
یەکسان ئەکریەن بلّندی و پەستی
گش مەردم ئێران وەمافیان ئەگەن
ئەشێ چونیەک بن زوڕات و جەگەن

ق ــ ســــــا وەئــێـــــــمـــــــە چە؟

پ ــ جـــــــا ئـەمـــــــە جـــــــــواوە؟

ئێـــمـــە کـــوردگـــەلیش کـــوژیاومـــان داوە

ــ لەم بەش بەشـــێنە کـــوردیشی تیـــایە

ق ــ پیـــرۆت ئەم قـــســـیـــەت بادی هەوایە

مـــەلیـــچک خـــۆی چەس تا شــۆرباوی بێ؟

کـــــورد تـا وا کــــــورتـە ناشێ ناوی بێ

ئێـــمـــە خـــەریکین وەلیـــەک ئەجـــەنگین

تا وابێ ســـەنگین؟ هەر مـــایەی نەنگین

پ ــ ڕاس ئێـژی، ئێـمـە گـەلی خـۆخـۆرین

تاوایش بین، هەر ســـەر لەبەر ســـاتۆرین

***

تاران، ٧/ ٥/ ٥٨: بۆ بیرەوەریی شەهیدبوونی کامران نجات اللهی نووسراوە:

## تاکەی؟

گـــــــــەلی کــــــــورد لـەوەتـا هـەیـە

ئـەم لـەوەتـایـەش تـا کـــــــــــەیـە؟

هەرگـــــیــــز بەخــــتی نەیهـــێناوە

هـــەر ژێـــردەســــــــــــــە و دیـل ژیـاوە

ئـــــازادی بـــــە چـــــاو نــــەدیـــــوە

قــــــەت خــــۆی بـە شت نـەزانیــــوە

هـەر چی کـــــردی، بـۆنامــــۆی کــــرد

لـە ڕای بـێـگـانـە ژیـا و مـــــــــــرد

***

چارده چەرخە لە سۆنگەی دین
نازانین بەرەو کوێ دەچین
کۆیلەی پێخواسی پەت وەسەر
بێ دەرەتان، کز و لەچەر
بەندەی کلاوسوور و ڕەشین
بەخت ڕەش و مل بە هەشین
ئاغامان دەگژ یەک ڕاچن
خۆ بەخۆش یەکتر داپاچن
ئێمەین لە خوێندا شەڵاڵین
لەش حەرام و خوێن حەڵاڵین
بۆ خۆ بەکوژدان یەکەمین
بۆ ژیان تا خوا حەزکا کەمین

***

بوموسلیمی خوراسانی
دنیا دەگرێ، بە هاسانی
دەیدا بە بەچکە هەباسان
ڕەوەدەی ئەمەگ نەناسان
نامەرد چاکەی ئەدەنەوە
نۆکەر بە سەر ئەکەنەوە
بە گزی ئەیکوژن، ئەمجارە
ئێژن بەچکە کورد غەددارە
سەلیبی لە بەر من ڕەوی
من هیندم گرت بۆ غەزنەوی

هەزار و ئەوەندە ساڵە
گۆپاڵێکم لەو بەر پاڵە
پاسداری مەرزی ئێرانم
خوێن ئەدەم، ئەبەخشم گیانم
بۆ شەڕی ئەفغان پێشەنگم
لە ڕوی عوسمانی ئەجەنگم

***

تا هەرا و خۆ بەکوشت دانە
کورد چاوی ڕاستی ئێرانە
بەڵام هەر شەڕ داکوژاوە
وەژێر پا ئەدرێ ئەم چاوە
کوشتەم وەپووش حەساو ئەکەن
ماوەکەش تەنگەتاو ئەکەن
ناوی "مەرزداری غەیوور"
ئەگۆڕێ بە "وەسڵەی ناجوور"
ناشێ وەزمانی خۆم بدوێم
گەرەک لە پێست خۆما بپوێم
ناکرێ داوای نان و ئاو کەم
نابێ پیاوەتی ڕەچاو کەم
برسی و ڕووت بم، گەڕبم، کوێربم
دەبێ شوکرانە بژێر بم
هەر بێژم کورد کوانێ هەقی!
پێم ئێژن کافری موتڵەقی

دەرگای بەزەیی دادەخرێ
حەشاماتم لێ دەنگ ئەدرێ
منالّ و مەزنم دەمرێن
وە ناهەق خوێنم ئەرژێن

***

هیچ دوور نەڕۆین، تازە، تازە
ئەم کوردە سەر پردەبازە
لە ڕووی ملهوڕی ستەمگەر
سینگی ڕووتی کردە سپەر
لە کوردستان لە موکریان
سەدان لاو بەر گوللە دریان
خوێنی کوردی چاو نەترساو
بووبە ئامیانی ئینقلاو
کوشتەم دا لە هەموو شاران
تەنانەت لە شاری تاران
پێشەنگی خۆبەخت کردن
هیچ سلّ نەکردوو لە مردن
دلّ تینووی ئازادیخواهی
(کامران نجات اللهی)
کوردێک بوو مامۆستا و زانا
ئازایەتی کوردی ڕانا
بوو بە سەرمەشقی ئازادان
هەموو ئازای دەرس دادان
لەو فێر بوون خۆبەخت کردن

ڕێگەی دژوار تەخت کردن
کەچی هێشتا خوێنی کوردان
لە سەر هەردان، لە بن بەردان
سوورایی کاڵ نەبۆتەوە
کردەیان لەبیر چۆتەوە
ئەوەی خۆمان بۆ دا بە کوشت
خوێنی دوژمنانمان بۆ ڕشت
وەک نەبای دیبێ و نە بۆران
داویەتە شوێنی گەلخۆران
لە بەشمان چاو دەنوقێنێ
گەرەکیە لە بنەمان بێنێ
خۆڕی و تۆڕی دنە داوە
بە چەخماغ و بە تێلاوە
ڕژانە ناو کوردەواری
دادەپاچن گوندی و شاری
ئۆباڵ وەبۆق مل گای بنە
قەڵتوبڕ ئەخەنە سنە
لە نەغەدە، لەمەریوان
هەروا زیاد ئەکەن هەتیوان
هەروا قۆشەنە و دەبزوێ
گش کەس دەزانێ بەرەو کوێ
بەرەو زێدی کورد و گۆران
بۆ وێزەی کرمانج و سۆران

***

ئێژم چ بوە؟ چی قەوماوە؟
دێر هاتووم؟ کەمم هێناوە؟
من خوێنم لەڕێی ئێوە ڕشت
لەگەڵ ئێوە تاغووتیم کوشت
کەر چییە لەم تێوەدانە؟
چۆن سزای ماچ پێوەدانە؟
چیم کردوە؟ گوناهم؟ سوچم؟
بۆچ لاتان بێ نرخ و پووچم؟
ئێژن: وس... هەر کوردی بەستە
ڕەزات تاڵە، خوێنت خەستە
تۆ داوای گۆشت بۆ لەڕ ئەکەی
لەگەڵ خودادا شەڕ ئەکەی؟

***

ئەی خوایە چەند چارەڕەشین!
چۆن لە هەموو ماف بێبەشین!
کەی لەگەڵ تۆدا جەنگاوین!
فریاکەوە، زۆر تەنگاوین
لابە ئەم زۆریە زۆرەیە
خۆت فەرمووت "هەل بەنۆرەیە"
سواوم هێندەی نۆبەداربم
تاکەی بێکەس و هەژار بم؟

***

١/٣/١٩٨٠- یادی ساڵێک لە کۆچی ڕواڵەتیی بارزانی:

## هەر شەو نابێ

ســـــەر لە ئێـــــوارەیەک درەنگانێک
تاریکان تەنگی نوێژی شـــێـــوانێک
کـــونده بوومـــێک لە کـــاولەکی وێران
گـــازی کـــردە گـــرۆی بەڕۆژ کـــوێران
دەرکـــــەون مـــــوژدە وا ڕۆژ ئاوا بوو
تیـــشکی خـــۆر وەک چوقڵ لە چاوا بوو
ببـــووە وەیشـــوومـــە ڕۆژی ڕوون بۆمـــان
شـــەوی ڕەش خـــۆشـــە خـــۆشی بۆ خـــۆمـــان

***

چەکـــچـــەکی و جـــرج و کـــرمی فـــۆســـفـــۆری
هاتنە دەر بۆ گـــــەڕ و هەوا خـــــۆری
گـــەرمـــە بازاڕی لاف و شـــات و شـــووت
دادەپۆشێ ڕەشـــاییی شـــەو لەشی ڕووت
یـــەک دەڵـــێ ڕۆژ لـــەبـــەر مـــن ئـــاوابـــوو
ئـــەویـــتـــــــــــر بـــۆی لـــەمـــل دەدەن وابـــوو
ئـــەم بـــەدەم ســـــــــــوورە ئـــەو بـــەزار زەردە
تا کش و مـــاتە شـــەو هەمـــووی مـــەردە

***

شنە با خـــــونچـــــەیەکی ڕا دەژەنێ
دەمی خـــونچـــەی خـــەواڵوو پێ دەکـــەنێ
پـــێـــکـــەنـــیـــنـــی بـــەزە بـــە ئـــاوەزیـــان

بە پەلی و کەمبەریی ڕبە و گەزیان
ئەو دەزانێ کە تیشک و تینی هەتاو
لە برەو ناکەوێ بەچاوو ڕاو

***

کاکە بارزانی، تۆش وەکو تاوی
چوویە پێوار، بەڵام نەفەوتاوی
ڕەنجی تۆ دات لەرێی هەژاراندا
مەرد و ڕەندیت لە کۆڕ و مەیداندا
نەعرەتەت گیانی دوژمنانی دەبرد
لە تۆ تۆقیبوو چاوی دوژمنی کورد
زۆر لە داگیرکەرانی کوردستان
بە دەستی تۆ نرانە گۆڕستان
کێیە؟ تاجیکە ترکی تۆرە، عەرەو
گێلە جاشە، تەعالە، گێتە، برەو
ناوی تۆی بیستبێ و نەترسابێ
یان هەناو و زراوی پێ مابێ
لە هەموو کۆ و کەژی وڵاتەکەمان
لێڕو بێ دارو زورک، دەشت و چەمان
خوێنی بەدکاری کوردی لێ ڕژاوە
مۆری ئازایەتیتە لێت داوە
با هەتا وا شەوە فسۆس و چەقەڵ
کلکیان تۆز بکا و بکەن گەنگەڵ
با مشک سەر هەڵێنێ بێژێ من

زۆری پـێ نـاچـێ دەچنـەوە نـاو کــــــــون
مـــێـــــژوو وەک پیـــــرەمـــــامی تۆچێنە
بەپشــــوو، کــــاوەخـــۆ ڕەنێـــــو هێنە
ســـاڵ و مـــانگ گـێـــژەوێ دەکـــا و تەتەڵە
ســـاف دەهێـــڵـــێت و تۆڕ دەدا دەغـــەڵە
دان بـژێـری هەچەن لـەســـــــەرخـــــــۆیە
بێ شـک و ســــــــۆیـە لاگــــــــری تـۆیـە
تۆ لە عـــاســـمـــانی پیـــاوەتی خـــۆری
هەمـــــــوو ئـازا کـــــــەمن ئـەتـۆ زۆری
تیـــــشکی تۆ هەر بینـا ســــەری داوە
نـاوی تـۆ تـا هـەتـایـە هـەر مــــــــاوە

***

١/ ٣/ ١٩٨١- یادی دووەمین ساڵی کۆچی بارزانی:

## ڕۆژی کورد

لـەڕۆژگـــــــــــــــارانـی تـازە و زوو
بـەشــــــایـەتـی دانـی مـــــــێـــــــــژوو
لە عـــــاســـــــمـــــانی کـــــوردەواری
لە گــــۆشــــەی ئاســـۆی خـــوێنبـــاری
زۆر ئـەســــــتـــــــێــــــرە درەوشــــاون
دڵـمــــــان بەیادیان نەخــــــشــــاون
قـــــــارەمــــــانـانی گـــــەل پەرست
چاو نەترســـانی گـــیــــان لەمــــست
دژی لاســـــــاری خـــــوێنمـــــــژ بوون

دۆست لاوێن، داگیرکەر کوژ بوون
ترسێنەری بێگانە بوون
تاکە سوارەی زەمانە بوون
ئالای ئازادی لەسەر شان
بێ وچان بۆمان تێ کۆشان
لەدەردی گەل بوونە دەرمان
ئەمەکیان زۆرە لەسەرمان
با لەبەر چاویش نەمابن
لەچاوی دڵ نەدیو نابن
بۆ ئێمە جێگەی شانازین
مامۆستای ئازادیخوازین
یادگاری زۆر بەمایەن
بۆ مانی کوردستان پایەن
فریشتەی بەختن لەسەرمان
هەر وان لەهەواری هەرمان

***

لەناو کۆی ئەو ئەستێرانە
لەناو جەرگەی ئەو شێرانە
ڕووناکتر و گەشەدارتر
هەڵکەوتە و ئازا و بەکارتر
لەم سەدەیەدا دیاری دا
تیشکی لە کوردەواریی دا
لە ئاسۆی بارزان دەرکەوت

له عاسمانی کورد سەرکەوت
گەلاوێژ و کاروانکوژه
لە حاند ئەو دەورەیان مژه
کاکە مستەفا بارزانی
بە گەڕناسی و بەمێرانی
لەشەوی کورد خۆرەتاوه
هێزی هەناو، سۆمای چاوه
چاوی دڵی کردینەوه
ترسی لەبیر بردینەوه
ئەو شۆڕشگێڕە بێ وێنه
ئەو دۆستە دوژمن شکێنه
پەڕاندی لەمپەر و پەرژین
خستینیە سەر شەقامی ژین
بۆ هەژاران خۆی بەخت کرد
ڕێگەی خەباتی تەخت کرد
بە نەبەزی و بە کردەوه
لە دنیا گرۆی بردەوه
لەناو گش کۆمەڵ و چیندا
لەسەرانسەری زەمیندا
لەسایەی ئەو خەباتەوه
ناوی کورد دەنگ ئەداتەوه
تا هەستی ئازادیخوازی
تا خۆبەخشین و گیانبازی

تـا نـەتـرسـان و بـوێـری
تا مـەردايەتـی و جـوامـێـری
لـەدنيـادا قـەدريـان مـابـێ
نـاوی بـارزانـی ون نـابـێ

***

١/ ٣/ ١٩٨٢- يادی سێيەمين ساڵی كۆچی بارزانی:

## رێبەری نەمر

هـەرچـی لـەئـاخـێ رسـكـاوە
مـەرگـيـشـی بـۆ دانـدراوە
مـرۆ دێتـە سـەر زەمـيـنێ
خـۆشی نـاخـۆشـيـان دەبيـنێ
هـەيـە ژيـوە و هـەڵـوەريـوە
هـاوسـاشـی پـێـی نـەزانـيـوە
هەيـشـە بـەرز دەبـێـتـەوە
نـاوبـانـگـی دەتـەنـێـتـەوە
حـوكـمـی سـەرزەمـين دادەگـرێ
هـەر هـێـنـدە زلـە تـا دەمـرێ
جـەلال و گـەورەيـی و شـكـۆی
بـەر پـێـوار دەبـن لـەگـەڵ خـۆی
زەمـان نـاوی دەسـڕێـتـەوە
لـە يـادی يـاد دەچـێـتـەوە

***

ئـەوی مـەرگ پـێـی نـاوێـرێ
نـاچـارە خـۆی لـێ بـبـوێـرێ

هونەرە، مەردایەتییە
بەخشینە، ئازایەتییە
بەزەیە بە هەژاراندا
وەفایە دەگەڵ یاراندا
دژ وەستانە لە بێدادی
هەوڵدانە بۆ ئازادی
بۆ هەق ڕوو بە مردن چوونە
بۆ زاڵم سەرکز نەبوونە
خێوی هەریەک لەو خدانە
نێوی بە دوور لە نەمانە
هەتا کۆن بێ گەشتر دەبێ
لە ژین خاوەن بەشتر دەبێ
چ جای کە گش لای یەکێ بێ
دەبێ ئەو هەرژیوە کێ بێ

***

دروود بۆ ناوت بارزانی
هەر خۆت خودانی هەمووانی
بۆ مەردایەتی تات نەبووە
لە بەخشیندا ئامپات نەبووە
بۆ هونەری نەیار کوشتن
بۆ خوێنی داگیرکەر ڕشتن
لە هەنگامەی مەیدانداری
ئێستاش هەر خۆت شۆڕەسواری

بۆ بەزە و هەژار پەروەری
تا ئەبەد هەر خۆت ڕێبەری
وات پەیمان دەبردە سەرێ
وەفا کڕنووشت بۆ بەرێ
دەی سا چۆن ئەو گیانە دەمرێ
چۆن مردن خۆی لەبەر دەگرێ

***

بارزانی هەر هەی وەکوو بووی
هەر دەشمێنیت و نەمردووی
گەلت بە یادی تۆ سازە
بەناوی تۆ سەرفیرازە
زۆر سەدە دێن و ڕادەبرن
مەردان دەرست لێ وەردەگرن
هەتا سەر زەوی زەوینە
هەتا ڕۆژ بەتیشک و تینە
ساڵ بە ساڵ یادت نووترە
قەدرو ڕێزت لە ڕووترە
بیرەوەریت میسکی خاوە
بۆن و بەرامەی بڵاوە
تاوەیسوون بۆنی بۆشترە
دەم لە دەم بۆنی خۆشترە

***

١٩٨٣/٣/١- یادی چوارەمینساڵی کۆچی بارزانی:

## نموونەی هونەر

لە پەڕاوی کۆن رامێنین
مێژووی هونەران وەخوێنین
زۆر شت، زۆر کەس، لە زۆر دەران
بوونە نموونەی هونەران
نووسراوە فلان ئازا بوو
نەدەترسا وەک شێر وابوو
وێنەی ڕۆستەمی زەمان بوو
زاڵ بوو، سامی نەریمان بوو
پتەو بوو وەک چیای قەندیل
بە وەفا بوو وەک سمۆیل
بۆ بەخشش و دەست و کەرەم
ببووە ڕکەبەری حەتەم
بۆ زانای بەمشوور و دوورناس
نموونەیە هەیاسی خاس
بۆ کاری خەڵک و خواپەسەند
نموونە هەن زۆر و زەوەند
هەرماون و هەر خاوەن ناو بوون
بەڵام دوور و لێک بڵاوبوون
ئیرادە وا هات لە خوداوە
خڕ ئەو نموونە بڵاوە

لە کوردێکدا کۆکاتەوە
سەر لەنوێ سەر هەڵداتەوە
***
لە مستەفا بارزانیدا
هەرچی چاک بوو نیشانی دا
بەسەر هەڵدانی ئەم ناوە
پەڕێ تازە هەڵدریاوە
هەر کەسێ بارزانیی دیوە
ماوەیەک دەگەڵیا ژیوە
گشت ئەو نموونانەی دیون
سەرچاوەکانی ناسیون
سەد کتێبی بۆ وەخوێنێ
لەهەر بابەتێ بیدوێنێ
لە ناودار بە ئازایەتی
سەربڵندی، مەردایەتی
گیانبەخش لە ڕێی ئازادی
ئاگر لە گیانی بێدادی
وەفا ، شەرەف، خواپەرستی
وەتەن و گەل خۆشەویستی
هەڵکەوتوویی بۆ سەروەری
بەزەیی، هەژار پەروەری
بێوێنەیی لە زەماندا
تاکە سوار لە مەیداندا

لێی پرسە چەندیان دەزانی
دەڵێ گشیان وەک بارزانی

***

بە هەمو هێز وەخۆکەوە
هەمو هونەران کۆکەوە
لێکی دە، پوخت دابێژە
بیخە قاڵب و دایڕێژە
کەسێکی لێ بەرهەم بێنە
لەبەر چاوانی ڕانوێنە
بۆ بەجەوهەری و مێرانی
هەرگیز ناگاتە بارزانی

***

١/٣/١٩٨٤- یادی پێنجەمین ساڵی کۆچی بارزانی:

## بە یادی تۆ دەژی دڵم

بارزانی باوکی شیرینم
ڕۆژی تیشکدەری ژینم
ماوێکە دەڵێن پێنج ساڵە
کە لام هەزار ساڵی تاڵە
دەنگی هەژار لاوێنەوەت
دیمەنی خەم تاوێنەوەت
نایێتە بەر گوێی بێخێرم
نایێتە بەر چاوی کوێرم
تۆ نەناسانی سادەدڵ

دەڵێن بوویتە ئاوێتەی گڵ
دەڵێن نەماو نابێتەوە
تۆش لەبیرت بچێتەوە
هەرگیز ئەم دڵە کڵۆڵەم
پەلکە گیای بەر سەرماوسۆڵەم
بەو قسانە بڕوای نایە
لای بایە بادی هەوایە
ئەوانە گیان و دڵکۆرن
دڵ کۆران لە دنیا زۆرن
با دڵ ڕوونان و دوڕناسان
ئەمکزانان و مێرخاسان
ئەوانەی ژیر و چازانن
بە چاوی دڵیان بڕوانن
دەزانن ئەتۆ هەر ماوی
نافەوتێی و نەفەوتاوی
تۆی نموونەی مەردایەتی
تۆی دروشمی کوردایەتی
وەڕەز بووی لە پێ نەزانان
لە دڵ پووچەڵ و دووزمانان
ڕەوات نەدی ژین لەسەر گڵ
ماڵت گوێزتەوە بۆ ناو دڵ
بۆ ناو دڵی هەرچی مەردە
هەر کەسێ پاک و بێگەردە
تەنانەت دڵی هەژاریش

ساردە کوانووی ڕەنج خەساریش
ئەو دڵە تەنگ و بێپۆیە
شوێنی هەمیشەییی تۆیە
بە یادی تۆ دەژی دڵم
دڵەی سەرشێت و سەرچڵم
هەرچەن تەنگەماڵی تۆیە
پەپوولەی شەماڵی تۆیە
تا چیای بەرزی لێ دیارە
تا گوێی لە خوڕەی ڕووبارە
هیممەتی لە دنیا تاکت
دڵی پاکت، ناوی چاکت
ئاشکرا دێنە بەرچاوی
چۆن باوەڕ بکا نەماوی
تۆ هەر دەمێنی، هەر ماوی
هەڵکەوتەکەی خاوەن ناوی
بۆ من هەر کاکی جارانی
هەر هومێدی هەژارانی

***

١٩٨٥/٣/١: یادی شەشەم ساڵی کۆچی بارزانی

## بە یادی بارزانی

جاروبارە لێرە لەوێ
چپێکم بەر گوێ دەکەوێ
هەناسە سارد دڵ بە ئێشن
ماتن ئاخان هەڵدەکێشن

حەیفێ بارزانی نەماوە
بێ میراوە ئەم دەراوە
من بەزەییم دێ بەوانە
ئەو چاوی دڵ بە خەوانە
کەسێک بارزانیی دیبێ
یان دوور بە دووری ناسیبێ
دیتنیشی نەویستبێ
هەر کردەی ئەوی بیستبێ
چۆن بیری وا بێ فەڕ دەکا
چ دڵدارێک باوەڕ دەکا!

***

هەژارێک بووم سەد جار مردوو
وەک قانگەڵاشکی بابردوو
زریان لەسەر ڕێی لا دەدام
شەماڵ سندەی پێدا دەدام
گێژەڵووکە دەیسووڕاندم
بۆ ڕەشەبای دەڕەتاندم
سووکتر بووم لە پرزە کایەک
نە پەسیوێک، نە پەنایەک
هەر هێندە بوو دەبزووتمەوە
خۆڵەمێش بووم دەشسووتمەوە
جارس لە ژین بێ تاو و تین
وشکی دڵ پڕ شەپۆڕ و شین

له سۆڵەی کوڵۆڵی چڕژاو
له تینی نەگبەتی برژاو
فێنکاییم له دنیا قاتی
چیم زۆر بوو بەڵاو نەهاتی
نه مرۆ، نه جانەوەر بووم
هەژگەلێکی خاکەسەر بووم
پشتم جەدەو له بێگارا
بێگار به هەر چوار کەنارا
یەخسیری چەند توخم و جۆران
چەند ڕەگەز له خاوەن زۆران
یەکی سپی یەک زەردە یەک ڕەشە
جنێوفرۆش به هەڕەشە
نرکەت نەیه ئاغات ترکە
چرکه مەکه عارەب سرکە
کوێخای سەر بێگار تاجیکه
سەرشۆڕ بەو چی دەڵێن بیکه
شەو مەیه دەر دەتڕفێنن
گوریسیان هەس دەتخنکێنن

***

له مەودای زۆر ساڵانمدا
له دەرگای زۆر ماڵانم دا
مەردێک نەبوو سەر دەرێنێ
بەخێسه بێ تێم ڕامێنێ

تفیشیان پێدا نەدەدام
دوژمنم بوون ئۆقرە و هەدام
هەڵوەدا، شێواو، سەرگەردان
ئاوارەی سەر هەرد و بەردان
بێ هێز، سیس و زەرد هەڵگەڕاو
زەبوون و توانا لانەماو
نا هومێد بەرەو هیچ دەچووم
بۆ خۆم پیادە سوار بوو پشووم

***

گاوێک نازانم چۆن گاوێک
هاتە بەرم کانی و ئاوێک
لەسەر کانی شەنگەدارێک
جێ سانەوەی گەشت هەژارێک
بڵێم چۆن بوو سەرچاوەکەی
چۆن بدەم پەسنی ئاوەکەی
سەد جار شیرنتر لە گیانم
ڕوونتر لە فرمێسکەکانم
ئاوی حەیاتی گۆڕین بوو
کە لە خەدر بە پەرژین بوو

***

خۆم گەیاندە بەر سێبەرێ
دنیا ئێرەییم پێ بەرێ
نەک هەر من بەسەت هەزاران

له تازه لاوی هەژاران
له پیری یەخسیری خەم چێژ
لە دایک زارۆی مەمک مێژ
هەموو کوردێکی دڵ برین
بێکەس و هەژار، جگەرخوین
بە ملیۆن گیان و دڵ توونی
بە کزی و کەساسی و زەبوونی
گەلە دیلی لە ژمار بەدەر
دڵ پڕ کەسەر بێ سەروبەر
لە چنگ خوێنمژان ڕاکردوو
بەغیلیان دەبرد بە مردوو
لاکە لاک تین داتەکاو بوون
بەرەو ئاوێک چاوە چاو بوون
وێڕای من گەینە سەر دەراو
بەر سێبەری فێنک و هەراو
خوڕەی ئاو هاشەی گەڵای دار
هەتوان بوو لە گیانی زامار
لەو ژێر سایە حەساینەوە
دەستەو لەحاز بووژاینەوە
لەبیر چوو یەخسیری و نەبوون
هاتینەوە سەر دونیای ڕوون
پاش مردن زیندوو بووینەوە
بەرەو ژین تێ هەڵچووینەوە

ئەو سـایە چەورە لە سـەرمـان
بوو بە گـەورەتر ڕێبـەرمـان
بە هێـزو گـوڕ ڕاپـەڕاندین
کـوردخـۆرانی پێ بەزاندین
بـووینـە نمـوونـەی ئـازایـی
بووینە لەشکری خـودایی
ئەو شـەنگە دارەی سـەرچاوە
مـستـەفـا بارزانیی ناوە
بەڵێ مـستـەفـا بارزانی
هەمـوو کـوردێک بە قـوربانی
***
بیست ملیـۆن پـتر گـەلی کـورد
بێ هەست و خـوست زۆر سـاڵان مـرد
بارزانـی گـیـانـی ژیاندەوە
لە گـورگـانی ئەسـتـاندەوە
گـوێ هەڵخـەن لە هەمـوو لایە
هەر قـرمـە و زرمـە و هەرایە
تەقـەی تفـەنگی هەر کـوردێک
بـۆ ئـازادی لـەهـەر هـەردێک
بـە ئـاشـکـرا، بـە ڕەوانـی
دەڵـێ بـە یـادی بـارزانـی
بارزانـی سـەرەتـای دانا
هـەر ئـەوە هـاوار و هـانا

خاوەن زۆران و کوردخۆران
کەوتوونە بەر لێزمە و بۆران
ئاوات بە زیندوو بوونەوە
ڕاپەڕین، تێ هەڵچوونەوە
لە بارزانییەوە بوو بە باو
لە بارزانییەوە بووینە پیاو
دەمی ئەو کوردی ژیاندەوە
زامی سەختی برژاندەوە

***

کەسێ خۆی سەرچاوەی ژین بێ
بۆ دڵساردان هێز و تین بێ
چۆن باوەڕ دەکەن مردووە
نەخێر بارزانی زیندووە
زۆر زیندووتر لە پێشووە
یادی بۆ کوردان تێشووە
تا وشەی ئازادیخوازی
تا لە ڕێی وڵات گیانبازی
بمێنێ کە هەر دەشمێنێ
بارزانی نوشست ناهێنێ
دنیا بمرێ ئەو نامرێ
مردن پێشی ئەو ناگرێ
کاکە مستەفا بارزانی
تۆ بۆ کوردان گیانی، ژیانی

هـەر بـژی وەکـــــــــــوو، هـەر ژیـاوی
هـەر بمـێـنـی وەک هـەر مـــــــــــاوی

***

١/٣/ ١٩٨٦- یادی حەوتەمین ساڵی کۆچی بارزانی:

## ئەستێرەیەکی گەش

دەڵێن ئەوانەی خــۆشـــەویســـتـــمـــانـن
تـــا لـــەبـــەر چـــاون لـــەبـــەر دڵانـــن
یـەکـــــتـــــر نەدیـتن، لێـک دووربـوونـەوە
دەبـن بـەمــــــایـەی لـەبیـــــر چوونـەوە
بەڵێ بـۆ کـــەس و دۆســـتـی ئـاســـایی
ســـــەبووری دەرە مــــەودای جـــــودایی
نـەک بـۆ مــــــــەردێکی بـە لـەش نـەدیـوە
نـاوی تـەواوی دنـیـــــــای تـەنـیـــــــوە
ئەو مـــەردەی کـــە بۆ لەبیـــر چوون نابێ
بـا بـە ڕوواڵـەت لـە گـــــڵکۆشـــــدا بێ

***

کـــــاکـــــە بـارزانـی ئـەو خــــودان نـاوە
کـــە کـــورد لـە ســـۆنـگەی ئەوڕا ناســـراوە
هێـــــژای بـلیـــــمـــــەت لە ئـازایـەتـی
بـارانـی ڕەحـــــمـــــەت بـۆ کـــــوردایـەتی
چاکـــتـــــرین ڕێبـــەر چـاکی بێ وێـنە
ئەو لـە داگـــیـــرکـــەر تۆڵە ئەســـتـــێنە
ئـەو ترســــــێنـەرەی دوژمـنـانـی کـــــورد

ئەو حـەقـسـێنەرەی مـەزڵـوومـانی کـورد
ئـەو سـەر سـەروەرەی ئـازای ئـازادە
ئـەو دادپـەروەرەی دژی بـێـدادە
کێ بێ لـەدنـیـا بـا دڵکوێریـش بێ
زۆریش گـێـژ و هوڕ زۆر بێـخـێـریش بێ
دڵـی بێ و بـڵـێ بـارزانـی نـەمـا
خـوا نەکـا قـەڵای هومـێـدان ڕمـا
کێ بێ هەر تۆزێ کـوردی خـۆش بوێ
لە یادکـردنی هەرگـیـز بسـرەوێ

***

نـەمـازە منـێـک، مـنـێـکـی هـەژار
خـاکـەی هاڕاوی چەرخی ڕۆژگـار
منی هیچ و پووچ لە هیـچـیش کـەمـتـر
لەخـەم، لەجـوودی سـەرم بەتەمـتـر
شـڕە سـیـپـاڵێک کـەس نەیدەویسـتم
چیم دەگـوت هیچ کـەس لێی نەدەبیسـتم
جـگـەر بـریـنـدار، کـز و لـەش بەبـار
هـەڵـوەدای زەبـری نـەیـاری زۆردار
لەدنیـای بەرین تەنگاو، سـەرگـەردان
ئاتاجی دەسـتی خـوێڕی و نامـەردان
ئاوارە لـەدەشت، پەتیـارە لە کـێـو
دەوریان تەنیـبـووم جن و خـێـو و دێو
ڕۆژم شـەو، شـەوم پڕ لەداخ و دەرد

فرمێسک و چاوسوور دیم و ڕوومەت زەرد
ڕێ نەدیو، پەلم دەکوتا کوێرانە
کونداسا لانەم لەناو وێرانە
هەناسە و دڵ سارد ئەسرین گەرم و گوڕ
تا بینەقاقەم چەقیبوومە قوڕ
تا دەبزووتمەوە پتر ڕۆ دەچووم
نوقمی گێژاوی ناهومێدی بووم
چاوم دەگێڕا لەڕووی ناچاری
بۆ مەرگێک شایەد بمبێ ڕزگاری
لەپڕ لە ئاسۆی پڕ تەمی ژیانم
ئەستێرەیەک گەش خۆی دا نیشانم
تیشک ئەنگێوتر لە کاروانکوژە
ڕەواندی هەرچی تاریکی و مژە
سپیی هەڵگێڕا ڕەشایی تاڵەم
وشکایی هێنا بەئاخ و ناڵەم
بزەی هاوێشتە سەرلێوی سیسم
تەرەو ئاوابوو بەختی نەگریسم
هێز و تین هاتن بە هانامەوە
خۆشی و گەشی و هات، هات بەلامەوە
***
ئەو هەسارەیەی وێنەی جوانی بوو
زەردەی بەزەیی کاک بارزانی بوو
کەتمە بەر سایەی پیرۆزەی پیرۆز

ساردە زستانی کردم بە نەورۆز
لەوساوە سایەی ئەوبوو بە ئەنوام
بوومە بنیادەم بە مرۆ ناسرام
ڕزا، هەڵوەرا تووڵی رکەی بەند
ئازا و ڕزگاربووم لەداو، لە کەمەند
توونی، نەبوونی گڕی کوژاوە
گرێی زمان و دڵم کراوە
بوومە بولبولێک لە باخچەی شادی
چریکەم دەهات بەرەو ئازادی
هەر کردەوەیێ زانیم و توانیم
بەتان و پۆوە کرپی بارزانیم

***

هەرچەند بەڕواڵەت لێی هەڵبڕاوم
بە واتەی خەڵک سێوی کراوم
چۆن باوەڕ دەکەم ئەو بابە گەورە
ئەو هەژار دۆستە، ئەوسایە چەورە
سایەی لەسەر من رەویبێتەوە
ڕێزم دوای بەرزی نەویبێتەوە
بارزانی لەمن جوێ نابێتەوە
ڕەنگی وەفای ئەو قەت ناچێتەوە
تا لەسەر زەوین ژینێکم هەیە
تا لە ڕەگ و خوێن تینێکم هەیە
بارزانی لەدیار دڵ و گیانمە

یادی ئەو ویردی سەر زمانمە
دوای مەرگیش ئەگەر پرسییان نیشانیم
دەڵێم هەژاری کاکە بارزانیم

***

١/ ٣/ ١٩٨٧- یادی هەشت ساڵەی کۆچی بارزانی:

## شابازی چیا

هەتا زەمانە دەچێ و دێ و هەتا زەوین لە خولە
هەتا ددانی زوڵم تیژ و بەختی ئێمە کولە
هەتا شەوم بەسەرا دێت و ڕادەژێم بێ خەو
هەتاکوو ڕۆژی ڕەشم دێتەوە و دەبێتەوە شەو
هەتا کەژێکی دەبینم بەخوێنی کورد سوورە
لە کوردستانێ کە وێران کراو و خاپوورە
بەهەڵپ وکەڵپی درندان دڕاوە مەڵبەندم
یەکێک و دوو نییە زۆر مۆری پێوە پێوەندم
بەگشتی ئەم گەلە کوردە وەکوو گەلەی بێ شوان
چەقۆی بیانی لەبان گەردنە نە سەر نە زوان
نزار و بێدەرەتان، بێدەروون و دەربەدەرن
لەوەندی بەر پەت و داری پیری بەند و دەسبەسەرن
دەکەن بە چاوگی شەڕ خزم و قەوم و هاوڕەگەزم
بەخوێنی کورد مرە نامۆ، چ شینی بێ و چ بەزم
گەلی هەناسە براو، بەش نەماو لەژین لە وەڵات
کە دێتە بیری منی دڵبرینی بێدەسەڵات
بەچاوی لێڵەوە دەڕوانمە خێڵە بێکەسەکەم

به ئاخ و داخەوە داد دادمە کوانێ دادرەسەکەم
لەکوێیە هەڵمەتی شابازەکەی چیاو ڕازان
ببێ بە تۆڵەستێنی گرۆی بەلەنگازان
بکێشێ خەنجەرێ مووکار لە حاندی نامەردان
ببێ بە ڕێبەری جاران لە هۆزی سەرگەردان
هەمیشە مەردی یەکەم ئەو بووە لە دنیایێ
چلۆنە ئەمڕۆ لە مەیدانێدا گورەی نایێ
دەڵێن چ بەهرە دەدا داد نەماوە بارزانی
لەشی لەخاکی رەشایە و لەلای خودا گیانی
ڕۆحم دەڵێ بە دڵم گفتی وا دەدڵ مەگرە
ئەوی بە مەردی ژیاوە هەتا هەتا نەمرە

***

١/ ٣/ ١٩٨٨- یادی نۆیەمین ساڵی کۆچی بارزانی:

## خوایە بەس نەبێ ئیتر

بارزانی باوک و برای کورد
لە شەوە زەنگا چرای کورد
هیوا و هومێدی کوردستان
ڕووگەی ڕاستی کوردپەرستان
لەم بەهەشتەی کوردەواری
چەوسان و ڕەنج بەخەساری
چەند بەرەمان هاتین و چووین
بەنی و کۆیلەی بێگانە بووین
کەس نەناس و بێ خەبەر ماین

تۆ ڕێی شەرەفت نیشان داین
بەڕێبەری پێشمان کەوتی
هیچ گاوێک تاوێک نەسرەوتی
لەهەرکوێ بووی بۆهەرجێ چووی
چقڵی دڵی نامەردان بووی

***

ئەی ئەوەی بۆ ڕزگاری کورد
لەڕای خوا جیهادت دەکرد
ئەی هەمیشە لەبەر چاوان
جێ شانازیی هەموو پیاوان
ئەی نموونەی ئازایەتی
بێ هاوتا لە مەردایەتی
بێ وێنە بۆ ئەمەکداری
ڕەوێنی تەمی هەژاری
ئەی ئەو مەردەی تا هەتایە
باسی چاکەت بنەی نایە
گەر بە ڕواڵەت بەر پێواری
بەگیانی پاک ئاگاداری
دەبینی چمان بەسەر هات
دە هەژمار نایە کارەسات
ڕەوەدەی زێدی کوردخۆران
خوانەناس و خاوەن زۆران
شیشاونە گیانی گەلەکەن
ملە دەکەن، پەلە دەکەن

گریویانە بۆ نەمانمان
جارکێشانە بۆ قڕانمان
سڵ ناکەن لەخوێن ڕشتنمان
بێ سووچ و تاوان کوشتنمان
هەرگرتنە و لەداردانە
هەر مەنگەنە و ئازاردانە
بەر تۆپ دانە، بۆمبارانە
سووتانی گوندو شارانە
تالآنە، هەست و نست چوونە
بەدەستی زاڵم دیل بوونە
ئەنوامان بەند و زیندانە
گفتیان هەر ژەقنە و سندانە
کێش کە لە بەندان دەرچوونە
ڕەوینە و لێکتر دووربوونە
بەهەزاران و هەزاران
وانە لەناو مەکۆی ئاواران
وەک تۆمی هەرزن بلآوین
بەبنیادەم نەناسراوین
باب ئاگای لە کوڕ نەماوە
خوشک بێ برا، کیژ بێ باوە
زارۆمان لە ناز بێبەشن
خوشک و دایک سەر بەهەشن
لەمایەی ژیان بەش بڕاو
لێقەوماو، ئاشتەبا نەماو

هەر گەڕەو هەر تەشقەڵەیە
هەر پێ وەگوێزین تەڵەیە

***

تەنانەت زمانەکەمان
شایەتی هەر مانەکەمان
کە خەڵاتێکی خودایە
لای خوانەناس ناڕەوایە
ڕەوای نابینن بیخوێنین
بە کوردی یەکتر بدوێنین
گەلی کورد شێست چەرخە ژیوە
هەرگیز دەردی وای نەدیوە

***

کاکە تا تۆ لەناومان بووی
هەژارپەروەر بۆ خودا بووی
ئێستاش کە چوویتە بارەگای
دیارە خۆشەویستی خودای
بێژە خوایە پشوو تاکەی؟
بۆ ڕوحمێ بەو کوردە ناکەی
بە بەڵێن و سۆزدانەکەت
کە هان لەناو قورئانەکەت
فەرمووتە: «لەپاش تەنگانە
نۆرەی سانەوە و خۆشیانە
دنیا دەستاودەست پێ دەکەین
ستەمکاران لەناو دەبەین

ئەوپەڕی بەزە لای منە
دەست درێژکەر پێم دوژمنە»

***

دەی سا کێ لەم هەردو بۆیە
وەک کورد شیاوی بەزەی تۆیە
کێ لەم سەرزەوییە هەراوە
وەکوو کوردی لێ قەوماوە
خوایە کە منت بردەوە
بە ئیدریس تۆڵەت کردەوە
ئیدریسیشت لێ ساندەوە
برینت لێ کولاندەوە

***

خودا بۆخاتری خوداییت
بۆ خاتری تاک و تەنیاییت
با بەس بێ خۆ لە کورد بواردن
بە کەڵپی گورگان ئەسپاردن
نزای ژنەبی و بێ باوان
هاوار خوای ڕۆندک لە چاوان
دەریای بەزەت وەجۆش بێنێ
پێل بدا و خەم بڕەتێنێ
ئەو گش پێشمەرگە دڵپاکە
ڕێڕەوی ئەم ڕێگە چاکە
کە گیانی خۆ فیدا دەکەن
داوای مافی ڕەوا دەکەن

ڕێگەی هەقییان گرتۆتە بەر
بەگیان بوونە لەمپەر لابەر
دەس لەدەس یەکا پێکەوە
هومێدیان بە تۆ پتەوە
دەی تۆش ئاوڕ لێوەدانێک
جارێک ئازادانە ژیانێک
لەم یەخسیریە ڕزگاربوونێک
تۆزێک وەک خەڵکی تر چوونێک
چی تر بێ پەنا نەمێنن
تۆی تۆ لەبیر چوون نەچێنن
خواپەرستان لەیاد مەکە
خودا نەناسان شاد مەکە
ئەم سەرۆکە و پێشمەرگانە
کە وەک تۆڵای پۆڵا وانە
مەسعوود و یار و هاوکاری
وەسەرخە بەرەو ڕزگاری

***

٣/ ٣/ ١٩٨٩: یادی دەیەمین ساڵی کۆچی بارزانی

## کورد لە فەرمووودەی تۆ ناگا

ئێمەی کورد چین؟ نایەژم کێین
دەبزوویننەوە، دەچین و دێین
بەڕواڵەتی جانەوەرین
کامی؟ لە گشتیان کەمترین
جانەوەری کێوی و کەوی

زلی، گچکەی، بەرزی، نەوی
وەربکەون، بلەوەڕێن
سەربەستن، لێیان دەگەڕێن
هەر لە مێروو تا مەل و مار
هەیانە شوێنێ بۆ ستار
هیچ لا بێ لان و لانە نین
بێ بوودڕ و کولانە نین
هەر گەلی کوردە لەم ناوە
بێ نانە و بێ لانە ماوە
لەماڵی خۆی تەرە کراو
هێز لێ بڕاو، دەورە دراو
لەهەموو لاوە ڕاو دەکرێ
تووش تەپکە و تەڵە و داو دەکرێ
زوان بەستە، دەم دادووراو
گشتی خاوە و خڕی بڵاو
خاکێ کە دەبوو هین خۆی بێ
لە سۆنگەیەدا نان و دۆی بێ
لەت لەتە داگیرکراوە
چەند مۆری پێوە نراوە
داهاتی سەر زەوینەکەی
بەروبۆی، وشکە و شینەکەی
بەفیڕۆ بۆ ئەم و ئەوە
ڕۆژیش بێ بۆ ئەو هەر شەوە

بەیدەس کراوین لە خۆمان
بووینە دەسەمۆی نامۆمان
لەخۆ بلاو، بۆ ئەوان کۆین
ئەشێ سەولەی ئەوان بخۆین
غەواره درزیان داداوین
گەرەک جاجکی وان بجاوین
بە چەند نرتک ناونراوین
بە چەندین ڕەنگ، ڕەنگ کراوین
خۆمان لەبیر بردۆتەوە
ڕەگەزمان لەبیر چۆتەوە
لەجەم کەم و بەدەم زۆرین
لاپرەسەنی بەرماو خۆرین
بۆ دانی ئەوان بووینە ئاش
بیلامانێ یەک بووینە جاش
لە جاشەتیشدا چەند جۆرین
سۆرین، شینین، بۆزین، بۆرین
جاشدارەکانیش دژ یەکن
لەسەر پاشوون چەنگ وەچەکن
بە جووتە تێکمان بەردەدەن
سەیر باز و گازمان دەکەن
شەڕ و کێشە و حەلەلایە
شەڕ لەسەر لێفەی مەلایە
شێر و خەت، وشک و تەڕیانە

لەسەر زێدی کورد شەڕیانە
ئێمەی کە پووک وەک پەڵاشین
بۆ دەستەچیلەی شەڕ باشین
با دەستەچیلە گڕ بگرێ
چش با جاشگەلیان قڕ بکرێ
لەئاکام هەرکام سەرکەوت
یان ناکام فسی دا و خەوت
نابێ شین گێڕ بین بۆ مردوون
بۆ گەنج و ڕەنجی بابردوون
ناشێ دڵتەنگ و پەشێو بین
زۆرەکیش بێ، کەن لە لێو بین
بۆ سەر داوەت بان کراوین
بارەبەری نان و ئاوین
گەرەکە بچمە ناو بەزم
لە زەماوەندا هەڵبەزم
هەڵپەرکێکەش لە چ لایێ
بە چەند زوڕنا و چەند هەوایێ
زیندە باد، یەعیش و یاشا
بێژم، هەر لەخۆم کەم حاشا
بژی بێژم وە زوانی خۆم
زۆر گران تەواو ئەبێ بۆم
نیشانەی گەل پەرستییە
مەرجی جاشبوون بێ هەستییە

سزای گەلخواز لای جاشداران
قەنارەیە و گوللەباران

***

جارێک لە نێرینەی شەوا
جیهان لە غوڕابی خەوا
منی شەکەت پڕ ژان و دەرد
بە ئەسری گەرم و ئاخی سارد
ڕووی زەردم بەرەو حەوا کرد
گازندەم لەلای خودا کرد
خوایە خۆت ئەیزانی چ تۆین
ئاخر خۆ ئێمەیش کۆیلەی تۆین
لەوەتا لەم سەرزەمینەین
لەژێر ئەم عاسمانە شینەین
هەر پشتمان بەتۆ بەستووە
هەر بەنی تۆمان رستووە
دەتگاتێ ناڵە و نووزەمان
خوا هاواری بە کڕووزەمان
ئەم حەمکە ڕۆڵە کوژیاوە
ئەو گش ساوایە بێ باوە
ئەو گش کیژە ئازیەت بارە
ئەو گش پیرە لێو بەبارە
ئەم لەهیی خوێن و ئەسرینە
ئەم هەموو شەپۆڕو شینە

دەبیەی، دەبینی هەر دەمێ
کوا لە هەوری بەزەت نەمێ
وتیان تۆ زۆر خاوەن بەزەی
دژ ئەم کاریەلە ناحەزەی
دەردی کوردی وا لێقەوماو
دڵی بەردیش دەکاتە ئاو
چۆنە هیچ ڕوحمی پێ ناکەی
تاکەی ئەم بازاڕە تاکەی؟
کێی تر لەسەر ئەم زەویتە
وەک کورد شیاوی بەزەویتە

***

لەپڕ گوێم لە قاقایەک بوو
زانستی ناخویایەک بوو
بەئاوەزم پێ ئەخەنی
کە ئەی خێوی مژی گەنی
خوا کاری وە بنیادەم چەس
لەخۆی بەرپرسیارە هەرکەس
دەردی کورد کەی کاری خوایە
مەیخە مل خوا ئەم خەتایە
خۆت بدۆزە بزانە چیت
وەیدۆزە مایەی نەگبەتیت
تۆ گەلێکی لەچاو گەلان
نەفامتر لە ورچی تەلان

چەندین چەرخە لەوساوە هەی
نە تێگەیوی نە تێ دەگەی
دەستت گرت بەکلکی تازی
گورگت لەخۆت کردە قازی
ئەو جێیی ناوت نا زێدی کورد
بەهەشت ئێرەییی پێ دەبرد
هەرچی پێداویستی ژیانە
مایەی خۆشیی لەش و گیانە
لە بەهرەی کشتوکاڵەوە
لە خەزێنەی ژێر چاڵەوە
مشەیە لەزێدی تۆدا
بۆ خۆت هەمووت بەفیڕۆدا
خۆت کرد بەچیلکە و چاڵی دەشت
بۆ ئاردووی ئاورگی زەردەشت
لە موبید و موغ پەرستی
پووشیشت نەهاتە دەستی
نەگۆڕای تا دنیا گۆڕا
تا دین و دنیاشت دۆڕا
فێربووی سەربەست نەدەژیای
بەبێ پڕ و پووچ نەدەشیای
لە چۆڵ گلا بووی کەوتیە چاڵ
تازی هەڵینای بە شەماڵ
وابووە پتر لە هەزارساڵ

شـــــڕه بەرەی کــــۆنـه ســـــیـــــپـــــاڵ
بـۆ مــــــەلا ، بـۆ شـــــــێـخ، بـۆ دەروێـش
ســـــەربەخـــــۆ خــــۆت کـــــردە ڕمـکێش
بـەڕیـش و پـرچ و حـــــــاو و حــــــــوو
مــــــرۆڤـــــایـەتیـــــیـت لـەدەست چـوو
تەکـــــیـــــــە و پـیـــــرت هەبا بەس بـوو
مــــــاڵـی خـــــوا بێ تـۆ بێـکەس بـوو
دەتـوت کێ لـه خـــــۆشـــــیـــــان لاربێ
بـا بـەر بـە حـــــــــــۆریـان تـەیـار بێ
تـۆ هەر لە شـــــوێن خــــەیـاڵ گــــەڕای
خـــۆشـــیت نەویـست ببــــڕای ببــــڕای
دنیـــــــات دا بە دنـیـــــــا خـــــــۆران
خـــــــــاوەن زێـڕان، خـــــــــاوەن زۆران
بێ سـڵ کـــــــــردن لـێت هـاتـنـه پـێش
خــانی گــێـــژ و تووتنی خــۆش کــێش
تا خــوێنتــیــان بۆ مــژیا مــشــتــیــان
چەندیشــتــیــان بۆ کــوژیا کــوشــتــیــان
لە ئـاکـــامـــــا بەشـــــیـــــان کـــــردی
هــەرکـێ چـیـی بـەرکـــــــــــەوت بـردی
بـریـای، خـــــوریای و قــــــویت دریای
تـۆ هـەر وتت بـەتـەمـــــــای خـــــوای
هیـــوات بوو خـــوات بێــتـــه فـــریا
کـــــــــــــەی بـەر ئـەدا داری بـریـا

پاش مەرگیش لەبەر دڵکوێری
تۆڵەت بەخودا دەسپێری

***

گەلانی لا لە تەکیە و پیر
لەبیر دەرکەوتن بەتەگبیر
بوونە ڕوناکبیر، بوونە ژیر
پس پسیان کرد گەوی زنجیر
خەیاڵات نەدەلوا بۆیان
هانایان بردە بەر خۆیان
پڕو پووچیان کوژاندەوە
سیسایەتیان بووژاندەوە
من منیان بوو بە تۆتۆیی
ژینیان زۆر بەرەوپێش ڕۆیی
لەسۆنگەی ئازادیخوازی
بازیان دا سەر پیشەسازی
دەریایان پشکنین شەشدانگ
لەسەر باڵان فڕین بۆ مانگ
بە جەوهەرانی هونەروەر
لەسەر زەوی بوونە سەروەر
هیچ جانەوەرێکیان نەبوارد
حەزیا بوون ماریشیان دەخوارد
تۆیش کە لە ورگی ماردا بووی
پێشە شکیاو هاڕدرابووی

ماری کوردخۆریشیان خواردن
بەتوونی ورگیان ئەسپاردن
تۆی کە قەت وەک مرۆ نەچووی
لە نەبوو نەبووتریش بووی
بەعەزمی چوارەم گەیشتووی
هێشتا هەر ئاتاجی نوشتووی
دەمت نەماوە، هەر بەدەم
ناوی خۆت ناوە بنیادەم
دەتبینم لەم دنیای بەرتەنگ
خۆت لێ گۆڕیوم بە چەند ڕەنگ
سووری، شینی، بۆری، کەسکی
خەیاڵ بەرپانی، بیرتەسکی
کرمانج و سۆران و گۆران
بێ ئاگان لە باو لە بۆران
نیوە هەر دەم بە نزایە
نیوەش دڵداری حەزیایە
لە هەموو ژینتا سەرانسەر
هەر جارێک هاتت هاتەبەر
لەبەر وڕی و گێژی و کاسی
خدری زیندەت دی و نەتناسی
ئەو هومێدەت بارزانی بوو
نموونەی لەکارزانی بوو
گەلپەرست و داناو زانا

مەردێ بوو بە هەموو مانا
بە ئازایی بێ وێنە بوو
تاسەنگی لە هیچ کوێ نەبوو
قەستەسەری زۆرداران بوو
دلۆڤانی هەژاران بوو
غیرەت شانازیی پێ دەکرد
هونەر کڕنووشی بۆ دەبرد
نیو چەرخ پتر ئەو مەردە
ئەو نەبەزە، ئەو نەبەردە
بەتەمای دەست و بازووی خۆی
تێکۆشا ، تۆ بزانی تۆی
تێبگەی کە تۆش ئینسانی
بەدەردی دیلیت بزانی
نیازی وابوو ئازادت کا
بە کامەڕەوابوون شادت کا
بەبێ چەک بەدەستی خالّی
قۆلّ و مەچەکی هەلّمالّی
لەداگیرکەران ڕاپەڕی
ڕیزی کوردخۆرانی دڕی
تۆپاندنی و چەکی کردن
بەجارێک زەندەقی بردن
قڕی خستە داگیرکەران
ناوبانگی گەییە هەندەران

پەڵەی نەنگیی تۆی سڕیەوە
ئابڕووی دزراوتی کڕیەوە
بەڵام تۆی لە هونەر تەکیو
لە ژیان قەت ئازادی نەدیو
وا فێری نانی نامۆ بووی
دژی ژینی سەربەخۆ بووی
بوویتە بەڵاگێڕی دژت
بوویتە مەتاڵ بۆ خوێنمژت
تفەنگ بەشان، خەنجەر لەمشت
فرشتەی بەختی خۆت دەکوشت
یان بێ لایەن سەیرت دەکرد
حیزەبخۆیی دەرت دەبرد
ڕێوشوێنی بارزانیت نەویست
ئامۆژگارییەکانیت نەبیست
تۆی نەخۆشی لەسەر مردن
قەڵس بووی لە دەرمان کردن
گەر تۆ قەدری خۆت زانیبا
شوێت شوێی بارزانی با
ئێستا جاش نەبووی بۆ کەران
ئاڵات دەشەکا لەسەران
عارەبی لە هەر پیس پیستر
لە بەرازی هار نەگریستر
نەیدەکرا هێرشت بۆ بێنێ

سامان و گیانت بڕفێنێ
گوندت بەر بلدۆزەر بدا
مشکی و خۆڵت وەسەر بدا
بەو نیازەی بنەبڕت کا
بە شیمیایی قڕت کا
بکات لە گوندان و شاران
وردە و یەخسیرت بۆمباران
هەڵەبجە و بادینانی تۆ
زێدی پڕ پیت و جوانی تۆ
لە ژێر ئاگر ببنە خاپوور
هەژدیهاش سەیرکەن لە دوور
سەیرە گوتت حەزیا ئامان
بمگەنێ دەستم بە دامان
تۆ چیت لەسەرت بێنە جواو
تۆی وەک کەوی کوڵێو خوراو
دەنگی برچی کوا دەیگاتێ
دژت نانی تۆی دەداتێ
ئێستاش لەپاش دەربەدەریت
دەگەڵ ئەم ژینەی بێ وەریت
هەر بینا بەم زوانەی نەدوور
وەک ڕەشەکانی چەرمەسوور
هەر ناوت بێ و خۆت نەمابی
بی بی جانی سینەما بی

گوتمێ زانستی بە ئاگا
کورد دەفەرموودەی تۆ ناگا
کوردی وا هەژاری کێوی
نازانێ تۆ چ داخێوی

***

١/ ٣/ ١٩٩٠ - یادی یازدە ساڵەی کۆچی بارزانی:

## وەک بارزانی نابێتەوە

بارزانی باوکی پیرۆزم
جێی فەخر و شانازیی هۆزم
ئەوە ماوەی یازدە ساڵە
کە لە من سەد هەزار ساڵە
هەر بەرواڵەت لێم تەریکی
وەکی دیش هەر لێم نزیکی
لە تۆ دوورەدیدار ماوم
خۆشم نازانم چۆن ژیاوم
خەمی دووریت کردی کارێ
ئۆقرەم نییە بەهیچ بارێ
هێندەی دوور لە تۆ مامەوە
لە توونی خەم تاوامەوە
نەما هێز و پێز و توانم
کە لەلام، بێ سەر و زوانم
لەسوێت وا کزە سۆماییم
ناتبینێ چاوی ئاساییم

بە گوێ لە بەختی نەگریسم
ناشیم فەرموودەت ببیسم
نامکرێ وەک جاری جاران
بێمە لات وێڕای هەژاران
یەک یەک بەسەرمان کەیەوە
دڵخۆشیمان بدەیەوە
بەڵام لەگیانی نزارم
لە دیدەی دڵی پەژارم
ون نابی و هەرگیز ون نەبووی
من بێ تۆ تۆش بێ من نەبووی
شەو بەخەو یا بە بێداری
های لە لام و تۆم لێ دیاری
لە دنیا هەر تۆ دەبینم
بۆ بوویە رووگە بۆ ژینم
تا باسی خاوەن هونەران
کە هەڵکەوتوون لە هەر دەران
لە کتێبان وەدەخوێنم
لە وێنەی تۆ رادەمێنم
لە هەمبەر تۆیان رادەنێم
گورجێ گشتیان وەلا دەنێم
لە بەزەیی بە هەژاران
کۆڵ نەدان لەرووی بەدکاران
لەمپەری ستەم پەڕاندن
گەل بۆ ئازادی بزواندن

لەسەر فەقیر فیز نەنواندن
دڵی خوێنمژان تۆقاندن
وەفاداری دەگەڵ یاران
هانا و پەنا بۆ هەژاران
نەمدیوە کەس وەکوو تۆ بێ
ناشێ هیچ کەسیش ولۆ بێ
لەوساوە دنیا دنیایە
هاوتای بۆ تۆ پێ شک نایە
کاکە بارزانیی ڕێبەرم
ئەی تانجی سەرم، سەروەرم
لەو ماوەی، ئێوە کۆچو کرد
ئەگەر پرسیار بکەی چو کرد
لەو ساوە بۆ لای خودا چووی
لە ئێمە تەرکە دینا بووی
دوور لەتۆ سێوی ماینەوە
سیس بووین و نەبووژاینەوە
هات و بەختمان وەرکەوتن
دوژمنمان لێ وەخۆ کەوتن
لە ئاوای و گوند و شاران
هەزاران کران بۆ مباران
لەهەر لا گەمارۆ دراین
کوژراین، براین و دیل کراین
بە هەزاران لە دار دراین
زۆرمان زیندە بەچاڵ کراین

بە دەردی ژاپۆنیان بردین
بە دەرمانان قڕیان کردین
ئاوارە بووین و دەربەدەر
دەرمان داوی بێ چارەسەر
ئیدریسی جێنشینی تۆ
ڕۆڵەی ئازا و ئەمینی تۆ
هانا بوو بۆ برینداران
چارەساز بوو بۆ بێچاران
کۆنە زامی برژاندەوە
کولمانی دامرکاندەوە
مخابن چەرخی دڵ بەکین
ئەویشی پێ ڕەوا نەدین
بەڵام با چەرخی بێ باریش
داگیرکەری کوردەواریش
تێ بگەن کوردستان خواردن
خۆ لەمافی ڕەوا بواردن
بەسەر چوو و باوی نەماوە
ڕۆڵەی کورد پەیمانی داوە
تا ماوە کە هەر دەشمێنێ
لە ئازادی واز ناهێنێ
تا مافی ڕەوای دەستێنێ
لە بارزانی جێ نەمێنێ

***

بۆ کاک ئیدریس

## گوڵی خانەدانی بارزان

ئاخ و داخ لە بەختی خەوتوو
لە ئێمەی کوردی کۆسکەوتوو
بۆ ئەو باسەی ورە بەزێن
دڵی بەرد و پۆڵا تەزێن
وتیان کاک ئیدریس کۆچی کرد
بە مەرگێکی کتوپڕ مرد
ئیدریس دڵسۆزی هەژاران
مایەی خۆشی و گەشەی یاران
زراو تۆقێنی کورد کوژان
چقڵی گلێنەی خوێنمژان
گوڵی خانەدانی بارزان
وریا و پاکژ و لە کارزان
ئەستێرەی ڕێنموونی گەل
ناوەخت ئاوابوو لە کەل

***

لە هەموو لای کوردەواری
چەمەرەیە و ئازیەت باری
پیر و پیرەک و کیژ و کوڕ
لاوانی پێشمەرگەی دڵپڕ
لە مەرگی ئەم جوانە مەرگە
خڕ کوڵ و زووخاو لە جەرگە

دڵ شەوتی بە پەرۆشن
چاو بەڕۆندک و ڕەشپۆشن

***

بێ سۆیە مردن گشتییە
ڕێ و شوێنێکی سروشتییە
هەرچی دەژی دەبێ بمرێ
کێیە بەر لەمردن بگرێ
بەڵام زەمانەی نالەبار
چەپگەری بێ بەقای غەددار
لەم کارەشیدا بێ بەختە
دوورە بەزەیە، دڵسەختە
وەک پیسکەی چنۆک زێڕی پاک
دەشارێتەوە لە ژێر خاک
قەڵپ و چرووک دەکار دەکا
باری بێ باران بار دەکا
گەنجی وەک ئیدریس دەڕفێنێ
هانایەک لە کورد دەستێنێ
کەچی داگیرکەرەکانمان
رزق و ڕۆزی بەرەکانمان
ماوە دەدات گەلێک ساڵان
بۆ کوشتنی کورد و تاڵان
فەلەکی دەک ژێر و ژوور بێ
وەک وڵاتەکەم خاپوور بێ

***

ئیـــــــدریس برای لەمـــــــێـــــژینم
رووناکـــــــایـیـی شـــــــەوی ژیـنـم
تامی مــــەرگی خــۆت پێ چێـــشـــتم
بۆ خـــــەمـــــانت بەجێ هێـــشـــــتم
قــــــــــــەرار بــوو بــەر لــەتــۆ بمـرم
جـــــــــــێـگـە لـە لای بـابـە بـگـرم
ئـێــــــرەیـیت هات پـێـــشم کـــــەوتی
پـێـش مـن لـە لای بـابـە خـــــــــەوتـی
زۆر بــە هــەڵــپــــــــــــە چـاوەنــۆڕم
هـاوســـــای گـــــڵـکۆی تـۆ بێ گـــــۆڕم
ژێـر پـێـی بـارزانـی بـێ ســـــــــــەرم
هـەژارێـکـی بـەخـــــــتـــــــــەوەرم

***

## شینگێڕی

کـــــاک هێـــــمن برای شـــــیــــرینم
چاوان دەگـــــــێـــــــڕم نـاتبــــــیـنم
زل کـــــــــوێـران دەڵـێـن مـــــــــردووە
کــــۆچی یەکـــــجـــــاریی کـــــردووە!
دڵـەی پـڕکــــــــــڵـــــــــۆڵـی هـەژارم
گــــیــــــانی بێ ئۆقـــــرە و قـــــەرارم
بـەمـــــــــــەرگی تـۆ بـاوەڕ نـاکـــــــــا
چۆن بێ منـی لـەتـوێی خـــــاکــــــا؟
تـۆیـەک هـۆگــــــــــــری مـنـداڵـیـم

هاوشکڵی و هاوکرچ و کاڵیم
هەمدەمی دەمانی لاویم
تەواوکاری ناتەواویم
هاو هەنگاو لەرێی خەباتا
هاوبەش لەهات و نەهاتا
هەواڵ دڵداری کوردستان
هاوپێشمەرگەی زێدپەرستان
هاوسروود خوێن، بۆ ئازادی
بۆ رزگاربوون لە بێدادی
هاوسەنگەر دژی داگیرکەر
نامۆی خوێنمژی سەرەخەر
هاوقەتار لە دەربەدەری
بە هەژاری و خاکەسەری
هاوقەڵەم، هاوبیر و هاوهەست
هاو زمان، هاودڵ و هاودەست
هەر یەکێک بوو«هەژار هێمن»
منیش هەرتۆ بووم، تۆش هەرمن
روحێک بوین دابەش لە دوو لەش
دوو لەشی ماندووی بەخت رەش
پەیمان بوو بە جێم نەهێڵی
وێڵم نەکەی لەشوێن خێڵی
باری خەم وێکڕا هەڵبگرین
دواجاریش پێکەوە بمرین

تۆی کوردی وا خاوەن بەڵێن
چی تۆی کردە پەیمان شکێن
گەوی بەین و بەقات هەڵبوارد
خۆت بەئاسوودەیی ئەسپارد
لا باری خەم خواریت لادا
ئەویش بە مل مندا دا
جاڕز بووی لە دونیای بێفەڕ
دونیای پڕ لە دەزبڕی و گەڕ
دونیای وڕ و گێژ و کاسان
گەوهەر و ئەمەک نەناسان
دونیای بازاڕی نامەردان
دونیای خەم و کوڵ و دەردان
خەلەسی لەدەم هار و مار
تەکیەوە لەو ژینی گەمار
ژیانی پڕژانی بێ دەرمان
گەیشتییە هەواری هەر مان
بۆ ئەو کۆچەی بێ من کردت
ئەو بەشە خۆشییەی تۆ بردت
زامی گیان و دڵ بەسۆیە
شین بۆ خۆمە نەک بۆ تۆیە
خۆزگە بەر لەتۆ دەمردم
تۆ شیوەنت بۆ دەکردم
دوور لەتۆ دڵگۆمی خوێنم

بــە گـــــــــــــازنــدەوە دەتــدوێــنــم
مـنـش وەک تـۆ قـــــــــەڵـسـم لـە ژیـان
«بۆ چت جێ هێــشــتم هێــمن گــیــان»*

***

٢٤/١٠/١٣٦٤- تەخمیسی بارگەی یاران، هەژار شیعری مام هێمنی تەخمیس کردووە:

## ژارگەی ماران

بەر بەرۆچکەش هەیە ســەرمــامــە شــەوان من چ بکەم
ئەم منـاڵانە کــــە بێ کــــراس و کــــەوان من چ بکەم
دڵی بردووم کـــچـــەتیـــوی کـــەرەوان من چ بکەم
«دێت و رادەبرێ وەکــــوو ســــەروی رەوان من چ بکەم
کــــە بەقــــوربانی نەکــــەم رۆحی رەوان من چ بکەم»

***

من نە شــەرقــیم و نەغــەربیم و نە ئەمــریکی و نەرووس
نەمــوسـڵـمـانی بەڕاســتـیم و نەجــووم و نە مــەجــووس
پیــــر و زور هانم و خـــورپەی دێ دڵم بۆ کـــچێ لووس
«قــەدی ئەو شــۆخــە وەکــو دووخ و خــەدەنگە ئەفــسووس
پشــتــەکــەم کــۆمــە وەکــوو مــاڵی کــەوان من چ بکەم»

***

ســــەرە لەرزۆک و قـــول و چۆکــە شل و زگ پەنەمـــاو
لاملم خـــوارە، پشـــووم ســـوارە، پرووش و کـــزەچاو
چوار پەلم فل بوو لەشــــــیــــــشم بۆتە لانکەشکاو

* ئەم دێڕەی دوایی بە حیسابی ئەبجەد ئەبێتە ساڵی وەفاتی مامۆستا هێمن (١٣٦٥).

«تازە هەنگاوی شلم کوانێ دەبێ بۆ شەوڕاو
جوانە زۆر جوانە بەڵێ ڕەوتی کەوان من چ بکەم»

***

بەزگی برسی خەوم نایەت هەرچەند وەربکەوم
ئارەزووم هەر ئەوەیە نانێ گەرم بێتە خەوم
وەکی ڕەشکێکی ڕزیو پس پسە گش قەڵف و گەوم
«زەبری ئاوزەنگی بڕاو شل بووە دەستی جڵەوم
دێ دەنا پڕمەی بۆر و بەدەوان من چ بکەم»

***

دمدمی چی ئەوە دوێنێ بوو ئەمن زۆر کەونم
دایکە وای ڕەحمەتی ئەوسایە کوتابووی تەونم
وشک و ڕەق بوومەوە تازە دەگەڕێم بۆ شەونم
«ژوانی خۆش هەڕەتی لاوەتی دێتە خەونم
کاتی ئاویلکە لەگەڵ زیندە خەوان من چ بکەم»

***

خەڵکی پێی وایە لە خۆشیانا هەروا گاڵەم دێ
نا ، براکەم لە دەسی زاڵمەکان زاڵەم دێ
ورتەی کۆنە برینانی دەماواڵەم دێ
«شەو هەتا ڕۆژێ لەبەر ئێشی لەشم ناڵەم دێ
دێتە گوێم دەنگی گەلۆ و نیوە شەوان من چ بکەم»

***

لە چیایان و لەدەشتان و لە لادێ و شاران
هیچ شتێک ئێستە نەماوە وەکوو جاری جاران

دە وەرە ســــــەیرێ بە ڕۆژی مـــــژ و گـــــۆپاڵ باران
«بارگـــــەیان پێکەوە پێـــــچـــا و بەڕێ بوون یاران
لــە دنــێ وا بــەتــنــێ پــاشــی ئــەوان مــن چ بــکــەم»
***
دەچمــە لای هەرکــەسێ بۆ کــارێ دەڵێی کــوێر و کــەڕە
یەک دەڵــێ لاچۆ لەبەر چاو ئەوی تر ئـێــــــژێ هەڕە
ئەوی بۆ م مـــاوەتەوە چاوی تەڕ و پێـــســـــتی گـــەڕە
«ژیانی من ئێـــســــتـــە وەکـــوو خـــۆری دەمی زەردەپەڕە
پێم نەمـــا تین و گـــوڕ و هێـــز و تەوان من چ بکەم»
***
خـــــۆم وەکـــــو زەڕنەقــــوتە و زارۆڵەکـــــانم رووتن
حـەوتی وام هەن کـە دەمی خـواردنێ وەک حـەو حـووتن
دوێنێ ئێـــــوارێ لەســـــەربانی هەڵم خــــست تووتن
«ســــروە هات خـــونچـــەگـــوڵی باخی ئەدەب پشکووتن
باخـــــەوانی گـــــەرەکـــــە تازەجــــەوان من چ بکەم»
***
خـــاڵەباس یادی بەخـــێـــر ئەو دەمی دایکی مـــردبوو
هەروەها وشک و برینگ نایە قـــەبر نەیشــــتـــبـــوو
دێیـــەکـــەی ئێـــمـــە هەمـــووی دێم و تەلان و گـــرد بوو
«ئاو نەبوو ئەو دەمی هێـــمـن مـــەلەوانی کــــورد بوو
ئاو شـــــوکــــر زۆرە وەرن زوو مـــــەلەوان من چ بکەم»
***

# فەرهەنگۆک

ئامادەکردنی: شوکور مستەفا

**ئەپژێنێ، پژاندن**: خوێنی کەپووی پژا، پژاندی: بەردا، ڕشتی.

**ئیوهی و تەوغی و شەگگە و چک ویک**: بە پێی جۆری کایەی جگێن دەگوترێن.

**ئەلیوشن**: فڕۆکەیەکی ڕووسییە.

**ئاگـــری**: چیـــای گـــری داغێ، تورک "Agri Dagi"ی پێ دەڵێن. نەگریسانە ویستوویانە نێـوەکـە بگۆڕن، دەکـاتێکدا، پێش وەی لە تورکسـتـانڕا بێنە ئەنەدۆڵێ، بەچیـای ئاگـر «ناسـراوە».. تا نـهـۆژی، کـانـی ئاورپژێنە... دوو کـونی هەیە... لە کـوردسـتـانی تـورکـیـایە، داسـتـانی «چیـای ئاگـری»ی یەشـار کـەمـال وەخوێنی، تێ دەگەی، ئەو کێوە ئەفسانەییيە چەس...

**ئوردووی سوور**: سپای ڕووسیای کۆمۆنیست.

**ئازادیو سەند**: ئازادیتان وەرگرت.

**ئاوەژوو**: بەرەواژ، پشتەو ڕوو، واژی.

**ئێروو**: بژیو، تفاق، پێداویستی ماڵ.

**ئۆف نەنە**: هاواری ترکان لە کاتی تەنگاویدا.

**ئەرخـەوان**: دارێکە لە چەشنی پەڵک گـوڵێکی سووری جوان دەگرێ، لەگۆڕستـانی مامەیارە زۆرە. ڕەنگی ئەرخـــەوانی (ارغـــوانی)، (اْرجوانی) سوور. لەتیرەی پەروانەوارانە.

**ئیرهابی**: تێرۆریست، پیاوکوژ، خراپکار.

**ئال**: سـەراب، ئاڵ، سـووری تێـر... وشـەیەکی تورکییە.

**ئاونگ**: ئاونگ، خوناو، شەونم.

**ئاڵەکـۆک**: هەپەڵۆک، هەپڵـۆک. هەژار دیوانی یەکەمی بەنێوی «ئاڵەکۆک»ەوە نێوناوە.

**ئاڵقەتیز**: گیایەکی گەڵاخڕی ڕەنگ زەیتوونییە، شیرەکەی مایەی زگ چوونە. خوشیلک.

**ئامێز**: باوەش.

**ئوێلدم**: بە تورکی، ئای مردم.

**ئامێد**: دیاربەکر.

**ئازیەت**: کـۆست، پرسـە، وشـەیەکی عـارەوییـە (أذية)... کـاورا ئازیەت بارە: تازێمـانەی هەیە.. ڕەنج، ئازار.

**ئەزموون**: تاقی کردنەوە.

**ئەزگوری**: من فیدات، منت قوربان، بە گوریت بم. گـــوری: گـــاوگـــەردوونە، بەلاوەگـــێـــڕە، بەلاگـەردانە، بالاگـەردانە، ئەوەی بەدەوری بالادا دەگێڕدرێ...

**ئیشکانی**: وشکانی.

**ئاخ**: گڵ و خۆڵ.

**ئەنی**: هەنیە.

**ئاوێستا**: کتێبی پیرۆزی زەردەشت.

**ئەقطاعی**: فیودال.

**ئەفسوون**: سیحر.

**ئەسرین**: فرمێسک، ڕۆندک.

**ئەفیون کێش**: تلیاکی.

**ئەم حەمکە**: ئەم هەمووە.

**ئەویندار**: عاشق.

**بەزە**: بەزەیی.

**باداباد**: چ دەبێ با ببێ.

**باوی مـحـەممەد صـەلاوات**: شـەڕی مـوسـوڵـمـان و کـافـران، یـا شـەڕی کـوردان دەگـەڵ نەیاران، ڕۆژگاری شەڕەکانی کوردی کوردستانی ئێران لە دژ تیـریاکـیـیـان، لەسـەردەمی کـۆمـاری مەهاباددا.

**بێ بەزە**: بێ بەزەیی، بێ دلۆڤانی، بێ ڕەحم.

**بژیشک**: کـەسێکی چارەسـەری نەخـۆشـان بـکا. فـارسـیـیـەکـەی (پزیشک)ە، ئەسـڵـەکـەی

پەهلەوییە و زۆر سیغەی دیکە هەیە... مام هەژار بە (بژیشک)ی نووسیوە، دەیگوت، دەگەڵ (ژی)دا هاوسەروکارە، چونکە بژیشک، دەست لە ژینی مرۆ وەردەدا.
**برش**: کەروو، کەرە، پوو.
**بژ**: لک و پۆپ.
**بیگ بن**: سەعاتە گەورەکەی شاری لەندەنە.
**بژیو**: مایەی ژیان و گوزەران.
**بزووت**: بسووت. سەرکەبزووت، سەلکەبزووت، ئەودارەی لە ئاگردانی ڕادەکرێ و سەرەکەی دەسووتێ، واتە داری سەربسووت، سووتاو... کۆڵەودژیشی پێ دەگوترێ. بەمانا: بزووتن، بزاوتیش دێ.
**بان بانک**: جانەوەرێکە لە تیرەی سمۆرە، دەست کورت و قاچ درێژە، لەرەوەزە بەردانددا دەژی. لە چیرۆکاندا گۆیا پاسەوانی سەر گەنجینە و خەزنانە...
**بەیار**: زەوینی نەکێڵدراو، بوورە، ڕەقەن.
**بنەوش**: گوڵی وەنەوشە. قوماشێکی ڕەنگ وەنەوشەیی.
**بۆر**: ڕەنگی سپیی ئامالْ زەرد.
**بەیبوون**: گوڵە خونچە ئاسای زەردی چکولەی بۆن خۆشە، لە «بەی»و «بۆن» هاتۆتە گۆڕێ.. واتە (بۆن بەی)، ئەوەی بۆنی وەکە بۆنی بەهێیە...
**بەدەو**: جوان.
**بێژان**: دابێژتن. قسە ببێژە و بپێژە و ببێژە.
**بیزا**: گیایەکی بەناوبانگە بۆ ترشیات و بۆ ناو شیرێژیش بەکار دێ.
**بێن**: بۆن.
**بی**: داری بی (بید).
**بەرامە**: بۆنی خۆش.
**بادام**: چوالە، باوی، باڤی، بەهیڤ.
**بەلاڵووک**: میوەیەکی کێویلەی وردی ڕەنگ سووری تێرە، بۆ ڕەوانی زۆر چاکە، دارەکەی سوورە و، بە بەرامەیە و دار جگەرە و گۆپاڵ و داردەستی لێ دروست دەکرێ. برینی گوناهە...
**بەرگا**: کەسێ کە پێش گای تازە جووت دەکەوێ، تا فێرە جووتی کا. بەرگاییلکە، بەو پەرەوڵە چکۆلەیە دەگوترێ، کاتێکی، گاران ڕادەدرێ وەپێش دەکەوێ و وردە گەنە لە لەشی گاوگۆتاڵ دەکاتەوە...
**بۆرچین**: مێچکە مراویی ماڵی.
**بارە**: دەنگی بزن... قارە: دەنگی مەڕ. بارۆکە، بارِ.. بۆ کەو و مریشک دەگوترێ.
**باشوو**: واشە، واشووکە، (باشق) مریشک و جووجەڵە و پەرەوڵان دەرفێنێ.
**بەی**: بەهێ.
**بێز**: قێز.
**بایەخ**: نرخ.
**بورجی بەڵەک**: قەڵای پاشای جزیرێ.
**بوستان**: بێستان.
**باش قەلا**: شارێکە لە کوردستانی تورکیا.
**بازوبەند**: بازیبەند. ئەوەی شێخ بۆ خەڵکی دەکا و لە بازوو دەبەسترێ، شێخ مەحموودی نەمر، ئەو بازیبەندەی بۆ زۆر لەکەڵە پیاوانی دەنووسی، گوللە کاری تێ نەدەکردن. گوللە بەند. شێخ بۆ د. موسەددەقیشی نووسیوە...
**بازن**: دەست پێچک، بازەند، ئەوەی دە مەچەک دەکرێ.
**بیلمەزی پیس**: ئینکەبەرد، سەهەند و ملهوڕ. وشەیەکی تورکییە.
**بزگوڕ**: پارچە بافتی کۆن و ڕزیو.
**بەرمورو**: ملوێنک لە متومووروو، گەردانە... ملوانک، ملوێنە.
**بێگار**: کاری سوخرە، کاری بێ کرێ، ئاغا و بەگلەران، بە زۆرەکی لە فەلایان باردەکرد.
**بەژ**: وشکانی، (بەڕ).

**باهۆ**: شان و پیل، بازوو.
**بەند**: برگەیەک لە ستران، حەبس و زیندان، مانەوە، حیلە و گزی و فزی، درۆی گەورەی هەڵبەستراوە.
**بووگە**: بووە، بە(سنەییانە).
**بۆران**: وەیشوومە، تۆف.
**بەدەو**: جوان.
**باکنگهام**: شارێکە لە ئینگلستان.
**پرۆلیتار**: ئەوەی ئەگەر کاری ڕۆژانە نەکا لە برسان دەمرێ.
**پێ خەف**: پێخەو.
**پارسەنگ**: بۆ چاوگرتنەوەی تەرازوو شتێکە دەخرێتە تای تەرازوو، تا بەرانبەر ڕاوەستێ – کە قاپێکی بەتاڵ لە لنگە تەرازوویەک داندرێ، بەرد، یا هەر شتێکی دیکە بە ئەندازەی قورسایی دەفرەکە بخرێتە نێو تایەکەی دیکەی – پێ دەڵێن.
**پسیک**: پشیلە.
**پشتیر**: تەویلە، یەختەخانە، گەوڕ.
**پاڵۆ**: تەمەڵ و بێکار.
**پەڵوولە**: چێشتی ئارد و ڕۆن.
**پەسیو**: هەڵامەت، پزوو.
**پەرەنگ**: لەرزانەی گوارە، سکڵ، پۆلوو.
**چنوور**: گیایەکی زۆر بۆن خۆشە، گەڵای لە گەڵای شویت دەچێ.
**پۆلکە**: سێوەڕە.
**پونگ**: گیایەکی بە بۆن و بەرام و تیژئاماڵ و تاڵی نەعنایی.
**پرپرە**: بریقە، پوولەکە، پەرەنگی گوارە، پەڵپینە، پڵپڵە.
**پاسار**: پەنا، گوێ سوانە، سوانده، بە چۆلەکە (کێشکە)یان بۆیە «پاساری» گوتووە؛ چونکە خۆ دەپاساران وەدەشێرن، یان هێلوون دەکەن.
**پەپوو، یا پەپۆ**: کوندەبوو، مخابن، حەیف، باڵدارێکی سەربە کڵاوی بەناووبانگە، کوندەبوو، بوومە کوێرە، کونەبوو. شاوێران صادق هیدایەت، نووسەری گەورەی ئێرانی، داستانێکی بە نێوی «بوف کور»ەوە هەس، وەیخوێنە..
**پەپۆ**: دنکی میوە.
**پەرەسلێرکە**: بەلەسیرک، پەرەسێلکە.
**پۆست**: پێست، دەستە، دەستەودایەرە، (پۆست نشین).
**پاوانە**: پاوەنە، خڕخاڵ.
**پیلاقە**: پێلەقە، لەقە.
**پێسیر**: یەخە و بەرۆک.
**پاماڵ**: پێخوست، پێشێل.
**پۆلوو**: سکڵ، پەرەنگ، پشکۆ.
**پار**: بەش، پاژ.
**پیوار**: غەیب، نادیار.
**پەی کردن**: بۆ گەڕان بە دووی شتێکدا، دنیا سەروبن کردن.
**تاودان**: تەنگاوبوون.
**تاڵوو**: تاڵک، دار کۆڵوو.
**تاران**: دوورکەوتنەوە و پەرت بوون و پەرەوازە بوون.
**تاراندن**: فراندن، جێ پێ لەقکردن، ڕەهەناندن...
**تافتە**: جۆرێ تەندراوی ئارموشە، داخکراوی ڕۆن، قاڵ کراو.
**تارا**: تیلماسکێکی ئارمووش، هەوری، کە بە بەر سەری بووکیدا دەکەن، یا سەرپۆشی سووری بووک.
**تیسوێ**: تیس، گیایەکی دڕکاوییە، سواپ، ساپ، بەردێکی پان و لووسە ساپانێی پێ دەکرێ، بۆ سەرمەنجەڵە یاپراخیش بەکاردێ.
**ترشۆکە**: گیایەکی گەڵاپانی هێندێ گەورەیە و لە گوێ بەرخە دەچێ، لە دێراوان شین دەبێ و زۆر ترش و مزرە. پەڵەی سوور سووریشی

پێوەیە...

**تیروتانە**: تیر: تیری کەوان، تانە (طعنە)، نووکە ڕمب، نووکە نێزە، یا بە ڕمب و نێزە دە یەکێ ڕاکردن.

**تەماڵ**: کەروێشک دەحەشارگەدا، کەروێشکی دە تەماڵدا گرت. لە هێلانەیدا گرت.

**تاقـە**: تاق، تاقـچـە، ئەوەی ناو دیوار کـە شـتـی تێـدا دادەندرێ، پارچە قـومـاش، بە کـەوێ دەکرا، بێلداری هەبوو، ئێ دەعسەش بەکەوێ دەکرا.

**تۆڕاندن**: هەڵ تۆڕاندن، جـــووتـکە هاویشتن و بەلەسە بوون.

**تاق تاق کەرە**: تووتەک، قژاکە.

**تەڕلان**: مەلێکی ڕاوکەرە لە تیرەی باز و شەهێن، جوان چاکی دڵ ڕفێن.

**تێکوڵ**: توێکڵ.

**تورکی حیـز**: حیـز، ترسـەنۆک، خـوێڕوو، گـاندەر، قووندەر، سووزانی، سەلیتە.

**تریاک**: تلیـاک، ئەوەی لە گـوڵە خـاشـخـاشی دروست دەکرێ و مایەیەکی بێ هۆش کەرە.

**تۆق**: ئاڵـقـە، گـەو، قـەف، تەپڵـەسـەر، بڵندترین جـێگا لەهەر شـتـێک، ملەوانەی یەکـپـارچە لەزێڕ.

**تار**: داوی مـــوزیک، تاریـک، ڕایەڵـی تەون، تاڵـەمـوو، ڕەنگی بێ بریسک و مـات، دوو ڕۆژی دووا دووای زسـتـانێ و سێ ڕۆژی نوای بەهارێ.

**تووڕاندن**: فوو بەئامرازی موزیک یان کەڵەشاخدا کردن، فیرکاندن.

**تریقە**: دەنگی خەنین.

**تەنی**: تەنک، ڕەشیی مەنجەڵ، ڕەشایی نیشتووی دووکەڵ، هیس، ناسکی سووک.

**تێشو**: بژیوی سەفەر، تۆشە.

**تووتەک**: قژاکە، تاق تاق کەرە (تەیری هەق).

**تورت**: زۆر ناسک، لەبەر ناسکی زوو دەشکێ.

**توور**: توورک، توورەکە.

**توز**: دەرمان، چاوغومار.

**تیرێژ**: تیشک.

**تراو**: ترنگ، دۆی زۆر ئاو، شینە ماستاو.

**تەلاش**: تەقالا.

**تەڵاش**: تڵیش.

**توێڵ**: نێوچاوان.

**تاپۆ**: قەباڵە، تارمایی، قەرەنتوو.

**تریفە**: تیشکی مانگ.

**تیراوێ**: برینێکە، چاک نابێتەوە.

**تاڵ**: هەودا.

**تژی**: پڕ.

**تەڵا**: زێڕ، ئاڵتوون.

**تەشەن**: وەبن دانی برین، تەشەنەکردن، هەوکردن، چڵک کردن..

**تاخ**: گەڕەک.

**جان پۆڵاد**: گیـان پۆڵا، بە بنەماڵەی (جنبلاط)ی کـــۆنە کـــوردی یەزیدیی دورزیی لوبنانێ دەگوترێ، کەمال جونبوڵات وەختی خۆی بە خزمەت بە هەشتی مەلا مستەفای بارزانی گەیشتووە.

**جەلە**: ڕستە، ڕست، شۆرتک، جەڵەب، کۆمەڵە ئاژاڵ، گەردانە لە گیاو گۆڵ دە مل دەئێخرێ.

**جووتێر**: جۆتکار، وەرزێر.

**جەزایرچی**: کێشک گر، حەسەس چە.

**چاخ، چاغ**: سەردەم، کات.

**چەراندن**: لەوەڕاندن، چەرە و بستە خواردن.

**چیلک**: گۆپکەی گوان و مەمک، یا هەر شتێکی بۆ ڕاگوێزتن دەست بدا، وەک دەستە چیلک. چیلکە، وردە چێوە.

**چەقچەقە**: نێوو دەنگی ئامێرێکە بە پلووسکێکی چکۆلەوە دەبەسترێ، دان لە دۆڵیانی ئاشەوە سەرەوژێر دەکاتەوە نێوان هەردوو بەرداش و

به خول و سوڕی بەرداش هەڵ دەرەقیٚ و دەکەوێتە هەلەکە سەما، تا دان لە پلووسکەوە بهەژێنێ و ببزوێنێ. بەمەسەل دەگوترێ: «ئاش دەگەڕێ و چەقچەقە سەری خۆی دێشێنێ». قەزوانی سوێر، گیایەکە، شیرەی بنکەی وەک جاچکە ئەجاون. گوڵی گەوەن [گوێنی] بە هەنیە دا دەدرێ و شەقەی لێوە دێ. تامی شیرنە...

**چورە پۆپنە**: جورە، باڵندەیەکی سەربەکڵاوەی چکۆلەیە، بەمەسەل دەگوترێ، جورە خۆی چی بێ و گۆشتاوی چی بێ.

**چەکمەرەق**: چەکمەبۆر، کۆنە نەجیم، کۆنە نەجیوزادە.

**چەلەنگ**: شۆخ و شەنگ، دەفری تەنەکە، چلۆکی دار، چلەپۆپە، ئێکلیل، داماو.

**چاوئەنداز**: ئەوەندە بەرایییەی بەرهەتەری چاو بکەوێ، دیمەن.

**چەرچی**: ئەوەی شمەک بەسەر چارەوێ و ئێستر و ئارەوانەو لەوان بابەتان، بەگونداندا دەگێڕێ و بە بەروبووی کشتوکاڵ و ئاژاڵی دەگۆڕێتەوە... بە گونداندا دەگەڕێ و دەڵێ: دێوەرە بازن، دێوەرە بنێشت، دێوەرە پارچە، وهتد... دێوەرەشیان پێ دەگوت، بازرگانی لە مەڕا دەست پێ دەکا.

**چلپاو**: لیتاو، قوڕاو، لاساماو، لێمشت، دقناڤ.

**چل چەشمە**: لە کوردستانی ئێرانە.

**چورت**: جرت، زرت، جرت لێدان.

**چۆرزەلە**: [جووت زەنە] دووژەنە، ئامێرێکی موزیکی بە فوولێکردن دەتووڕێنێ.

**چێڵ**: مانگا.

**چێل**: پەرژین.

**چرێت دەکەوێ**: حەددت چییە.

**چاروێ**: چارەوێ، گوێدرێژ.

**چ خودا بەرداره**: چۆن خوا هەڵدەگرێ.

**چلە**: خواردەمەنی.

**چل**: لقەدار.

**چقڵ**: دڕک، دڕوو، ستڕوو ئەسڵەکەی تورکییە (چاقرتیکان) [ئاسن دڕک].

**چیای ساسۆن**: لە کوردستانی تورکیایە.

**چەتوون**: وشەیەکی تورکییە (Chetin چتین) بە مانای سەخت و دژوار و کەللەڕەق.

**چاشنی**: تام کردنی ئاشی، چێژتنی چێشت.

**چوێڵ**: بارەبەری پاشوو خواروخێچ (چەوت و چوێڵ).

**چاوگە**: دیمەن، چەشمەنداز.

**چاورەق**: خێزانێکن لە گەڕەکی شوانان شکست هەڵدەبستنەوە.

**چوو**: جگ، قاپ.

**حەزیا**: ئەژدیها، ئەستیاک، زوحاک، پادشای مادان، [ماردوش]، بۆیەشیان وا پێ گوتووە، چونکە کوانێکی گەورەی وەکە مار، ئەژدیها لەسەر شانی ڕووابوو، بە مەژ مرۆ، دادەمرکایەوە.

**حەمایەل**: وشەیەکی عەرەبیە، بازیبەند، یا ئەوەی شیری پێ هەڵدەگیرێ، بەملەوە دەکرێ. [الحمائل، حمالة السيف].

**حیلکە**: دەنگی تریقەی خەنین. هێندێ جار لەجیاتیی (حیلە)ی ئەسپ و ماین، بەهەڵە دەگوترێ.

**حاند**: بەرامبەر، هەمبەر.

**حاجی کۆیی**: حاجی قادری شاعیری گەورەی کورد لە کۆیە.

**حەپین**: وەڕین. شێخ ڕەزا دەڵێ: وا ئەزانم سەگە و لەمن ئەحەپێ.

**حولله مەرەسی**: گەمەیەکە بە سێ جگ دەکرێ هەر چەندی ببرێتەوە ئەگەر تاقە جارێک، هەر سێ میچ وەک یەک نەهاتن، هەرچی بردوویەتەوە ئەیدۆڕێنێتەوە و دێتەوە سەر سێ جگەی

پێشوو..

**خـواکـردن**: خـو کـردن، ڕەخـسـان، دەرفـەت بۆ ڕەخسان.

**خواس**: پەتی، ڕووت، پێخاوس.

**خـەرتەل**: سـەرگـەڕ، کـەپنەک داڵ، سـیـسـارکـە کـەچەڵە، مـردارخـۆر. وشـەیەکی تورکـیـیـە [Kartal].

**خو، خوە، خوەدان**: ئارەقەی لەش.

**خونکار**: پادشا، سوڵتان، خوداوەندکار.

**خـوێن مـژەکـانو هەڵقـەنان**: خـوێنمـژەکـانتـان هەڵکەند.

**خوناوکە**: وردە بارانی نەرمی هێدیی نەرم. [وردە بارانی ژێر دەواران]، دەنکە دەنکەی ئارەقەی دەمـوچاو. ملوانکە، لە مـێخـەک و مـەرجـانو هتد دروست دەکرا.

**خونچە**: غونچە، گوڵی هێشتا نەپژیو.

**خاکی**: زۆر بەتەنگ دنیاوە نەهاتگ، ڕەنگی وەک ڕەنگی خاک.

**خشپیلە**: چکۆلەی جوانکیلە، خشپلانە.

**خـشـخـاش**: گـوڵەخـاتوونە، تریاکی لێ دروست دەکرێ. ڕەبەنۆک، پاوانەی بە زەنگوڵە.

**خاوە**: پیتاکی میری، سەرانە.

**خـوشـیلک**: گـیـایەکی کـە لاسکی یا وەڵگی دەشکێنی شیـری لێ دەردەپەڕێ. بۆ ڕەوانیی زگ خاسە.

**خرخال**: پاوانە، پاوەند.

**خـانی لەپزێڕین**: ئەمـیـر چۆلاقی برادۆست، کـە قەڵای دمدمی ڕۆنا و زۆر مەردانە بەرگریی لە دژی تلیاک چیبیان کرد، بەڵام، کوردی غایەن، ئاوی لە قـەڵایێ لێ بڕینو، ڕەخنەیان دەقـەڵا کـرد و تەقـاندیانەوە و سـەرچاوەی ئاو و بژیویان لێ بڕین، تا دووا پشـوو پیـاوانە شەڕیان کرد.

**خوویا**: ئاشکرا و بەرچاو.

**خەلسان**: ڕزگار بوون، دەرچوون.

**خوێڵێن**: کانگەی خوێ.

**خـەیتی ئەبیـەڵ**: (الخیط الأبیض) هەودای سپی (ئەوسـا منیش وەک مـەلای کـورد خـوشـکی صـادم بەلامی قـەڵەو دەزانیو دەگـەڵ مـەتەڵ خستومتە تای تەرازویەک، لێم ببوورن).

**خانی**: ئەحمەدی خانی .

**خـاکـەلێـوە**: سـەرەتای بەهارێ. هەوەڵ مـانگی بەهار.

**خرینگە**: دەنگی وێک کەوتنی خشڵو زێڕ و زێو.

**خەزێم**: لووتەوانە [خزامة].

**خامۆش**: کوژاوە، دامرکاو، بێ دەنگ، کپ.

**خـەزا**: غـەزا، چوونە شـەڕی سـورمـانان بۆ سـەر کافران.

**خێوی شەو**: خوای شەو، جندۆکەی شەوگار.

**خـازەلی**: خـەنزڵ، ئاگرۆکە، تۆپە ڕاکردن، کـەری سـوور، مـەلا تەق تەقـێن، هەنگڵـە شـەلە، جغزێن: چەند گەمەیەکی منداڵانن.

**دێران**: گـــوێدان، ئـاودان، گـــونجـــان، جێ تێدابوونەوە.

**دەوار**: کوێنی ڕەشماڵ.

**دەسـتـەچیلە**: ئاورهەڵایسـێن، دەسـتـە چیلکە، ئەوەندە ئاورەی لە ئاگـردانێکی یەکـێکی دەخوازییەوە.

**دەستو دە کلکی**: دەستان بەکلکی.

**دار کـوتکە**: دارکـوک، دارتەقـێن، باڵدارێکە، بەدەنووک داران کـون دەکـا و هێـلانەی تێـدا دەکا. دارە سمەشی پێ دەگوترێ، قوڵتە.

**دنبەک**: دمبەک، دومبەڵەک.

**دنە**: هاندان.

**دوورنا**: وشـەیەکی تورکـیـیـە، بەکـوردی قـازی قولێنگە.

**دەڵ**: سەگەمێ، دەڵەک، نەنێر.

**دیل**: یەخسیر، بەردە.

**دەسمـاڵ**: دەستەسر، چەورە، سەرپۆشی تەنکی ژنان، مێزەر.
**دۆم**: هۆزێکی کۆچەری کوردە.
**دووگرد**: بەرماڵ.
**دەفر**: ئامان، ئیربار.
**دوومان**: تەپو مژو دووکەڵ.
**دەست گرتە**: دەستگیران.
**دین**: دیتن، ئایین، ئەم وشەی «دین»ە بە بنەچەکە کوردی– فارسی– پەهلەوی– ئاوێستاییيە...
**دێم**: ڕوومەت.
**دیلان**: هەڵپەڕکێ، هەرزاڵە، جۆلانە.
**دژدار**: پاسەوانی کەلهە، دژدار، دژەوان.
**دنە**: هاندان.
**دەڵ**: دەڵەک.
**دەوی**: دەوەن، درەخت.
**دەقنە**: نان چنینەوەی فەقێ.
**دەوار**: چارەوێ و گاوگۆتاڵ، کۆن، تاوڵ، سیاماڵ، خێوەت.
**ڕژد**: هەورازی کـوور، هەورازێ کـە بەدژواری لێی بەسەر دەکەون، ڕپیسکە.
**رابن**: هەڵستن.
**ڕۆژی ژمار**: قیامەت.
**ڕا**: تەکبیر، ڕێگە.
**ڕەزوان**: باغەوان، ڕەزوانی بەهەشت هەر لەو تیرەیە «روضة»ی عارەبیش هەر ڕەزەکەی کوردە...
**ڕێزەڵە**: ڕەزڕەزۆک، گیایەکە هەر دەڵێی تانجبەندکراوە.
**ڕنوو**: بەفری زۆرو لەسەر یەکدی کەڵەکەبوو، [بەهمەن].
**ڕەپینا**: نێوی جێگایەکە.
**ڕەژی**: زووخاڵ، ڕەژوو، خەڵووز، کۆمر.
**غومار**: تۆز، گەرد.
**ڕووبەند**: پۆشی پشوین، پەچە، پێچە.
**ڕۆینە**: جۆرە شایی‌یەکە، لە گەرمیان «قەراخی»ی پێ دەگوترێ.
**ڕەش بەڵەک**: شاییو زەماوەندو هەڵپەڕکێی ژنو پیاو پێکەوە.
**ڕووگە**: قیبلە.
**ڕچە**: بزنە ڕێ، ڕێگایەکی باریک، ڕچەی شکاند: سەردەقی شکاند، بۆ یەکەم جار دەستیان پێ‌کرد.
**ڕەگەل**: بەگەڵ، دەگەڵ، لەگەڵ.
**ڕکە**: قەفەس.
**ڕاکە**: لابەرە، هەڵگرە.
**ڕاز**: نهێنی، ئەوەی لەدڵدایەو لۆ هەموو کەسێ نادرکێندرێ.
**زاروزیچ**: منداڵەوردکە.
**زەردە زیرە**: باڵدارێکە لە کەناری دەچێ، زەردەواڵە بەدڕکیش دەگوترێ.
**زەند**: کتێبێکی ئایینی زەردەشتە.
**زرێ**: پۆشاکی لەئاڵقە ئاسنو زەردو مس، بۆ شەڕ لەبەر دەکرێ. [زرێپۆش].
**زەند**: نێوان جومگەو ئانیشک، بڕەدار، قەڵاشکەری.
**زیقە**: زیرە بەدەنگی تیژ.
**زارا**: نێوە بۆ ژن، کەو، ژەرەژ.
**زەردەپەڕ**: تیشکی نزیک ڕۆژاوابوون.
**زایە**: پیزە، تۆل، لەدەست چوو، ون، گوم.
**زرە**: دەنگی ڕاتڵەکانی زنجیر.
**زەردە زیرە**: زەرباف، زرکتک، زەردەواڵە، زەرگەتە، سویرەمۆزە.
**زوڕنا**: سوورە نەی، ئامێری موزیک، بەفوو لێدەدرێ.
**زەرتک**: گیایەکە بەنی پێ ڕەنگ دەکەن.
**زەردە**: بزە، تیشکی تاو لە بەیانو ئێوارە.
**زەنگ**: ڕۆنی تاویاو، زەنگوڵە، ڕکێف، درز، قەڵش، ژەنگ، زیل.

**ژنانە**: ترسەنۆک.
**ژوان**: ئەو جێی دوو دڵدار بەڵێن بە یەکدی دەدەن و یەکدی ببینن.
**سۆ**: کونی دەرزی، ئێش‌و ژان.
**سوێ**: ژان، حەسرەت.
**سەریشک**: سەربەش.
**سەوە**: سەبەتە.
**سەردار ئاباد**: گوندێکە.
**سەرەڕۆ**: زۆر پەلەکار.
**سازندە**: زوڕناژەن.
**سارەوان**: وشترەوان، لە سەحراوان.
**سواپ**: بەردی لوس‌و پانکەڵەیە.
**سەر هەڵگرتن**: ڕۆیشتنی بێ گەڕانەوە.. کوڵ، خەم، قولت.
**سندان**: نەخۆشییەکە، دەزگای ئاسنگەر.
**سوون**: تیژکردن.
**سیاوەش**: کوڕی پادشای ئێران ئەفراسیابی پادشای توران کوشتی‌و ئەو شەڕە سەدان ساڵ درێژەی کێشا و هەر بۆیە، بۆ شتێکی لەبڕانەوە نەیە، دەگوترێ: «بوو بەخوێنی سیاوەش».
**سیروان**: ڕووباری سیروان. لەکوردستانی ئێرانەوە بەرەو وڵاتی کوردستانی عیراقێ دەڕوا.
**سازو سەمتوور**: ساز، ئامرازی موزیک. سەمتوور: ئەوژی ئامێرەکا موزیک یا دنە. سەنتوور.
**سێ پێیی**: جۆرە شایی‌یەکی کوردییە، قەراخی.
**سڵسڵەو پلپڵە**: زنجیری بە پوولەکە.
**سوخمە**: زوخمە، لەسەر کراسەوە لەبەر دەکرێ، جۆرە یەلەگێکی ژنانە، لەخامەکی سەوز و سوور و هتد دروست دەکرێ، ئەوە بۆ ژن... ئی پیاویش هەیە...
**سایە**: سێبەر، سادە.
**سولتان ئاباد**: نێوی شارێکە. کۆن بەچەمچەماڵ گوتراوە.
**سەرتۆپ**: یەکەم لە جوانی، یا لەئازایەتیدا.
**سریلە**: باڵدارێکی چکۆلەی جوانە دوو پەڕی وەک دوو شاخی لێ بڵند بوونەوە.
**سوورە قانگ**: جۆری مراویی سوور و سپییە.
**سوێسکە**: سۆسکە، تەیهوو.
**سێر**: تێر.
**سیروو**: ریشۆڵە.
**سەوڵ**: گوڵی پۆپە کەڵەشێرە، داری سەروو، داری قەیاخ ئاژۆتن.
**سێوەرە**: سێپەرە، جەت.
**سوێسن**: گوڵێکە زۆر بۆن خۆش.
**سندم**: پێوەندی ئاسن.
**شیشۆقە**: لەتکە سواڵەت‌و شووشەی ڕەنگاو.
**شەوەکی**: بەرەبەیان.
**شەندەومەندە**: مەسەلە دەڵێت: شەندە لەمەندە کەمتر نییە. یانی هەموو کەس وەک یەکە لە ماف‌و بەشدا.
**شەپاڵ**: جوان و نازەنین.
**شەماڵ**: مۆم، شەم.
**شەمزینان**: بەرەی شەمەدین، ناوچەی شەمدینان، تەرگەوەڕ و مەرگەوەڕ.
**شەشدانگ**: تێکراییی ملک، ئێستری پشت پان‌و قەویلە.
**شلە**: سووری پنۆک پنۆک.
**شلوێ**: لێخن، شێلوو.
**شێخانی**: شاییی شێخانی.
**شەدە**: مشکی، بەسەرەوە دەبەسترێ.
**شاڵ و شاپک**: کورتەک و شەڕواڵی کوردی باکووری کوردستان.
**شاهۆ**: نێوی کێوێکە لەکوردستانی ئێران.
**شێلاقە**: باڵدارێکی لنگ درێژە. قامچی، تازیانە.
**شنگ**: زۆر، هێز، ئەسپنگ، شینکەی کەم، ددانی

لێ گیرنابێ.
**شنۆ**: سروە، کزەبا، شنە.
**شلێـرە**: گـوڵێکی سـووری ئاڵ، یان زەردی پیـاڵە ئاسایی‌و سەرەونخوون.
**شێست پەڕ**: قەتمەر، پڕ.
**شەکەت**: ماندوو، هیلاک، وەستیای.
**شەوەزەنگ**: شەوی زۆر تاریک.
**شۆ**: شیوەرد.
**شەما**: مۆم، شەم.
**شەمێ**: شەم (شمع)، مۆم.
**شەپاڵ**: جوان‌و نازەنین.
**شڕۆڵ**: شڕو بێ بزگوڕ.
**شکێر**: بەر ئەشکەوت.
**شالوور**: جۆرە بولبولێکە.
**شەش پەڕ**: جۆری تۆوی جۆ.
**شات**: لکەداری یەکساڵەی چڕۆ.
**عابی**: ڕەنگی ئاویی ئاماڵ شین، ئابی.
**عـاجی**: هەر شـتـێکی لەددانـی فـیل، لەشـەفـرەی پیل، سازکریاوێ، کۆشکی عاجی.
**غەریبەنگ**: گیایەکە تۆوی وردی وەک خاشخاش دەگرێ.
**فیز**: کیبر و بایی بوون.
**فەلە**: عیسەوی، مەسیحی.
**فێرگە**: مەدرەسە.
**فرچک**: مەلاژگ، مەلاشوو.
**قـوبڵـە**: گـەڕەکێکە، جێگەی وەفـایی، شـاعیـری بەناووبانـگ بـووە، لەشـــیـــعـــرێکا دەڵـێ: «وەفـایی ئاخـری خـێـر بێ دەمـێکە بێ سـەرو شوێنە، شیعری «شیرین تەشی دەڕێسێ» لە شیعرە هەرە بەرزەکانیەتی.
**قۆچە قانێ**: بەردەقانی، کەهنیک، قەڵماسک.
**قاچاندن**: ڕفاندن.
**قاشاغ**: لاسکی گەنمەشامی.
**قـانک**: دووکەڵ، دەرفەت، بۆ دووبارە بازی کردن، دەنگی خوێندنی دوڕنا.
**قوت**: ڕووت.
**قزە**: ترسنۆک.
**قاو**: نەخۆشیی بەرزەولاخ.
**قەڕاڵ**: شا.
**قەباڵە**: قۆچان، سەنەد، قەواڵە.
**قاش**: کووز، نقێم.
**قەپ**: گاز.
**قوش**: باڵندە.
**قاژ**: قاژوو.
**قـــومـــری**: باڵدارێکە لەتیـــرەی کـــۆترەباریکە، یاکەریم.
**قـازیاخـە**: گـیـایەکی ئاوییـە گـەڵای لەپێی قـاز دەچێ. وشەکە تورکییە (قاز آیاغی).
**قـوڕاو**: گـۆشـتـاوێکی چەورە کـە بە مـاسـتـەوە دەخورێ.
**کافەی شمشاد**: مەیخانەیە لە تاران.
**کڕنوش**: ئیکلام.
**کەژ**: زۆر سپی.
**کارگ**: مریشک.
**کـەوش**: بەگـەل دەرچوونی کـیـژ و کـوڕانە بۆ گـیـا کردن‌و ئاهەنگ گێڕان.
**کەوی**: ماڵی.
**کەسەر**: خەم‌و کوڵ.
**کەڤر**: بەرد، تەوەن، کەمەر، کەور.
**کەن**: پێکەنین.
**کل**: سورمە.
**کل کردن**: ناردن.
**کڵ**: جێگەی سوور کردنەوەی ئامانی گڵ.
**کێشەر**: جاذبة.
**کـــێـــشکچی**: پاســـەوان. ئەم وشـــەیە بەئەسڵ تورکـیـیـە. لە ئیشـیـکچـیـیـەوە دروست بووە. ئێـشـک بە مـانـا حـەرەمـســەرایە، جـاران بە بەرپرسی چاودێریی حـەرەمـســەرایان دەگـوت

«ئێشیک ئاغاسی».

**کرێت**: دزێو، ناشیرن.

**کرمۆڵ**: دەموچاو ئاولاوی.

**کەتنە**: کەوتنە.

**کەوتی**: تۆپی.

**کول**: خەم، قوڵت.

**کۆمەگ**: یارمەتی.

**کاک**: نیاز مەلا ئەمجەدی قەڵایە کە نازناوی شیعری: کاک، بوو.

**کۆپین ئاوا**: گەڕەکێکە لە مەهاباد.

**کۆڵە**: مەسەلێکی مەشهورە دەڵێن: خوا هەقی بزنی کۆڵە لە شاخدار دەستێنێتەوە.

**کەزی**: پرچ.

**کۆلەدار**: ئیستعمارگەر.

**کانی سانان**: نێوی جێگایە.

**کەلوو**: کولۆ.

**کوند**: کونە، کوندەبوو.

**کەسەر**: خەم.

**کڵاوژێر**: تاسکڵاوی زێڕی ژنان.

**کرمەک**: جۆرە خشڵێکی زێڕی ژنانە، لە کرم دەچێ.

**کلۆجە**: کوڵەنجە، یەلەگی ژنان.

**کەمبەر زیو**: پشتێند زێو.

**کەمبەرچین**: کراس یا کەوای ژنانەی ناوقەد قرتێنراوی چین چین.

**کنج**: جلکو کەلوپەل، جلوبەرگ.

**کووم**: کڵاو.

**کەلاک**: جەستەی مردار.

**کەڵ**: بڕەدار، نێرەگامێش، گای نێر، گیان لەبەرێکی کێوییە. درشت، ئازاو بەکار [کەڵەمێرد، کەڵەپیاو، کەڵەگا...].

**کەندەسمە**: کاسەڵە شینکە، مەگەزخۆرە.

**کەونارا**: دێرینە، لەمێژینە.

**کەروێشکە**: بزفتی خەلەودان بەدەم باوە.

**کام**: ئاوات، ئارەزوو، نەخۆشی، بلۆقاوی زاری یەکسم کە ژەمبردەی ئالیک دەبێ.

**کاڕە**: دەنگی بەرزی پەزو بەرخ، قاڕە.

**کاسەڵەشینکە**: قژاکە، تاق تاق کەرە، یاحەق، مەلێکە.

**کوڕ کوڕ**: قەتێ.

**کفر**: داری کفر، قتەروو، لەحاویە و دەم چەمان دەڕوێ، تێروو.

**کەما**: گیایەکی بەرزی گەڵادەرزییە، کارگی کەما لەهەموو کارگێ چێترە. دەگەڵ. «لۆ»دا، کە ئەویش هەر گیایەکی بەرزی گەڵا دەرزییە، بۆ ئالیکی ئاژەڵ دەبار دەکرێ.

**کووزەڵە**: کوزبەرە، وەک کەوەر و تەڕەتوورە دەخورێ، تامی توور دەدا، لەنێو ئاوی خوڕدا دەڕوێ.

**کاردو**: کاردی، هاز.

**کوڕادە**: قوڕادە، تەڕەکێوی.

**کەنێر**: گیایەکە گوڵی جوانی هەیە. نێوی دوو جۆرە داریشە، یەکیان بە دڕوو، ئەوی دییان بێ دڕک.

**کڵاوبن**: جۆری ڕێواس.

**کەزی**: پەلک، پرچ.

**کەلەم**: گیایەکە لە تیرەی کەلەرم، بنەکەی وەک پەتاتە دەکرێ بە چێشتی «برنج و کەلەم» عەجەم زۆری حەز لێ دەکەن، لە کەربەلاو نەجەف و بەغدا (تمەن کەلەم)ی پێ دەڵێن.

**کامیۆن**: لۆری.

**کابان**: کەیوانوو، کەیوانۆ، خانمی ماڵێ، بنەوانە.

**کاکی بەکاکی**: پانو بەرین و بێ ئەم سەرو ئەوسەر.

**کۆک**: تەیار و ڕێکوپێک.

**کەل**: چیا، کەژ، کۆ، کێو، قەڵشت، بڕەدار، جێگەی ددانی کەوتوو، بەهرە، فائیدە، نێوەندی دوو چیا.

**کاڵ**: هەرزنە تاڵە.
**گزە**: حیلە، فێڵ.
**گەوکردنەوە**: پێکەوە لکاندن.
**گەوەڕ**: گەوڕ، تەویلە.
**گیانەلاّ**: سەرەمەرگ، گیاندان.
**گۆرمزە**: گیایەکی کوێستانییە.
**گەلەخوێ**: خاوەن مێگەڵ.
**گرار**: دانەوێڵە، شۆربا.
**گەلۆ**: داخۆ.
**گرێی بەرکۆژە**: دوگمەی یاخە.
**گڕ**: بڵێسە و گڕگرتن.
**کڵکۆ**: قەبر.
**گـوێن**: باڵدارێکە شـەوتارۆژ هەر دەڵێ: هم هم دەش حیلینێ.
**گۆڕ**: زەوی ڕێکو تەختە، قەبر.
**گەماڵ**: سەگی نێر.
**گزیر**: بەردەستی کوێخا لە گوند، جاش کوێخا.
**گوڵ عەنبەر**: خورماڵ.
**گەردانە**: ملوانکە.
**گـۆبەرۆک**: ڕێزە دوگـمـەی زێڕو زێو کـە لە بەرۆکو پێسیر دەدرێ.
**گـێلگێلە**: ڕیزە گـولێنگەی تێکخـراو بۆ سـەر و شەدەی ژنان.
**گـرژاڵ**: ڕەنگێکە بۆ مـەرەز کـە لەنێـوان ڕەشو سووردایە، سووری ئاماڵ ڕەش.
**گـۆشـتـە زوون**: گـۆشـتـی سـاغ کـە لە پاش سـاڕێژ بوونەوەی برین سەرهەڵداتەوە.
**گــاڵە**: دەنگی پێکەنینی سـاوا، هەراو هوریا، قریوە.
**گوشاد**: وەکری.
**گۆڵ**: ئاڵۆزی و لێک ئالاّوی.
**گەز**: قەپ، گاز.
**گـێلم بەریاغ**: (Golin Parmagi) تورکـیـیـە، واتە: قـامکی بووک، (أصـابع العـروس) بەحـارەوی، بە جـۆرە شـیـرنیـیـەک دەگـوترێ لە جۆری بورمە.
**گوێ بەرخە**: گیایەکە لە گوێی بەرخ دەچێ.
**گوڵە بابوونە**: گوڵە بەیبوون.
**گێلاخە**: گیایەکە بۆ چێشت خۆشە.
**گوزروان**: گیایەکە بۆ دەرمان چاکە، بنی دوورە.
**گۆوەند**: شایی.
**گـیـابەند**: گـیـایەکـە زۆر بۆنو بەرامی خـۆشـە، کیژوکاڵان بەزڵفیاندا دەکەن.
**گەزیزە**: بلازیر، گوڵێکە سەرەتای بەهارێ دەپژێ.
**گیسک**: کەزی، پرچ.
**گرد**: تەپە، تەلان.
**گزرە**: گیای وردکراو بۆ چەرەو لەوەڕی ئاژەڵ.
**گژە**: دەنگی بای بە تەوژم.
**گورد**: چاپکو ئازا، بەگوڕ، ئەم وشەیە لەشانامەدا هاتووە و بە مانای ئازایە.
**گوێ سوانە**: سواندە.
**لاجانگ**: نێوان ڕوومەتو ئەستۆ.
**لکێن**: پێوە نووسان.
**لێڕ**: دارستان، جەنگەڵ.
**لێو**: لیکاو.
**لالەباس**: باغـێکە، گـۆمی تەتەکـە لە نزیک ئەو باغەیە.
**لک**: پەل، لکە: پەلە.
**لەک لەک**: حاجی لەقلەق.
**لاوک**: سترانی قارەمانیەتی، لاوژە.
**لووشـە**: قـووت دانی بەسـاغی، گـیـایەکی دە ناو دۆکولێوی دەکرێ.
**لالە هەباسی**: گـــولێکی بەرزە بالاّیە، بە زۆر ڕەنگیان هەیە، گوڵی حەوت ڕەنگ.
**لاولاو**: گـولێکی ناسکی بە زۆر ڕەنـگ، بەدەوری لکو چڵەداردا لوول دەخوا، لاڤلاڤک.
**لەمنتان کەوی**: ئافەرم، بتان ڕەژم، قـسـەیەکی بۆ دەنەدانو هاندان دەگـوترێ، هێندێ جـار..

لەمنت نەکەوێ. . دەگوترێ.
**لۆری**: ئۆتومبیلی بارهەڵگر، کامیۆن.
**لوان**: ڕۆیین، گونجان.
**لیتە**: قوڕەلیتە، چڵپاو، هڕی، لەهی.
**لەک**: تیرەیەکە لەلوڕ، سەگەوەندەکانیان بەدزی کل لە چاو ڕفێن نامێن، حەمە سەعید بەگی جاف لە کتێبی «ئاوارە»کەیدا زۆری باس کردوون، بەزۆری لای کولیایی و چواروەند دەژین... حیکایەتی جەیران چاوەکەم، لەو ناوچەیە ڕووی داوە...
**لەز**: خێرا، خێرایی.
**لەش بەبار**: نەخۆش.
**لیچ**: لچ.
**لاسەرە**: خشڵێکی ژنانە بەلایەکی سەرەوە قاییم دەکرێ.
**لاگیرە**: زەنبەرێکە بەلای سەرەوە قاییم دەکرێ.
**لوولاک**: لوولاق، گاڵلۆر.
**لەرزانە**: خشڵێکی ژنانە.
**لوولە**: خشڵێکە بۆ دووعا تێخستن، بەزۆر مانای دیکەش هاتووە لوولەو زنجیر لەزێڕ.
**ماسی گرە**: باڵدارێکە بەماسی دەژی.
**مەخمەر**: پارچەی مەخمووری ڕەنگ سەوز، مەخمەڵ.
**مشت**: دەست.
**ماڵو وێران**: ماڵتان وێران.
**مشت**: دەست، ناو لەپ.
**مەگین**: مەگەر.
**ما چی کەم**: ئەدی چ بکەم.
**مژی**: مێشک.
**مر**: تێر، تورخەکردوو.
**مرۆگورێن**: پیاوکوژ.
**مێشە**: دارستانی بی لەدەم چەم، لێرەوار، بێشە.
**مەزرەق**: شیلاقەی نوک ئاسن.
**مەولەوی**: نازناوی بنەماڵەییێکە بژیشکی دەکەن.

**ملە**: ڕقەبەرێ، ڕەگ برە.
**ماسوو**: گوندێکە لەنێوان لاجانو سابلاغا، هەژار منداڵیی خۆی زۆر لەوێ بەسەر بردووە.
**مازێ**: نێوی چیایەکە لە کوردستان.
**مز**: کرێ.
**مەرنەمووک**: «من ربُّك» پرسیارێکە لە کاتی تەڵقینی مردوودا دەگوترێ. واتا: خودات کێیە؟
**مەتاڵ**: قەڵغان، مەرتاڵ، کان، مەعدەن.
**مووچ**: جومگە، ماچ، ڕووناخۆش، قوت٠ گوێ مووچ.
**مەلوول**: مات، زەبوون.
**مەچک**: مەچەک، زەند، نێوان جومگە و ئانیشک.
**مەندێ**: گیایەکی کوێستانییە دەگەڵ ژاژیو پەنیر دەکرێ.
**مێخەک بەند**: بەرمووری لە مێخەک.
**مەکسی**: قسەی سەرزارەکی بە بێ کردەوە.
**ماڵیاوا**: گوندێکە لەکوردستانی عێراق.
**ماک**: ئەسڵ، بنەما، بنواشە، بە زۆر مانا دێ...
**مۆزە شینە**: کەوش، مووزک، پێڵاو.
**مێکوک**: دار بەلەک، کۆرتیزۆنی لێ دەردەهێندرێ، مایەی کۆکا کۆلاو بیپسی کۆلاشی لێدەردەهێندرێ، لەزۆر جێگا، شەربەتی «سووس»ی لێ دروست دەکرێ. لە مووسڵو بەغداو شامو قاهیرە باوە.
**مێژۆرد**: گیایەکە بۆ ئاژەڵ زۆر خۆشە.
**ملوانە**: گەردانە، ملوانکە.
**مێلاقە**: ڕەبەنۆک، کلاوسوورە، تەنها گولێک دەگرێ، بە تەنهاشە، بۆیە ڕەبەندیان پێ‌گوتووە... بندوورەشی پێ دەگوترێ.
**مفتەخۆری**: بەلاش خۆری، مشەخۆری.
**مەکۆ**: جێگەی کۆبوونەوەی خەڵک، کۆگا، مەکۆی دزان.

**مامیرن**: گیایەکی بۆ دەرمان دەشێ.
**موشکوڵ**: چەڵەمە، کەڵەم، ئاستەنگ، گرفت.
**نەفرین**: لەحنەت، لەعنەت، نفڕ.
**نریا**: نرا.
**نەورۆزە**: گوڵێکی زەردە بەر لە گەزیزە دەردەچێ.
**نوقم**: نقوم، ژێر ئاوکەوتوو.
**نەبەرد**: شەڕ، گەڕ، جەنگ.
**نواڵ**: شیوەڵەی چکۆلە بەقەد چیاوە. زۆر مانای دیکەی هەیە.
**نزار**: نسێ، نسار، نسرم، لێڕەوار، مانای دیکەی زۆرە.
**نیاگان**: باپیران.
**واز**: ئارەزوو.
**وازی**: گەمە، حەز.
**والآ**: بەتاڵ، کراوە، سەروەتاک، ڤالا، ئالآو والآی بووکەڵە.
**واتن**: وتیان.
**وزە**: تاقەت، تابشت، بڕست، بڕشت، تاوشت.
**وەگوێزن**: ڕاگوێزن.
**هەتوان**: مەڵحەم.
**هەڵپە**: پەلە، تەماح، تاسەی زۆر.
**هەلووک**: دارێکی هێند بستێکە و دادراوە، هەلووکێن بازیەکەیەتی.
**هەیڤ**: مانگی عاسمان.
**هەڕەت**: دەرفەت، کێس، گەرمەی شت، زۆریی شت، [هەڕەتی جوانی].
**هاکا**: لەپڕ، هەربینا، لە نکاو هەر کاتێکت زانی.
**هەیهات**: دوورە، لە کران نایە.
**هەی داد**: هاوار بە دەنگمەوە بێن.
**هەڵۆ**: باڵدارێکی ڕەشی ڕاوکەرە، زۆر بەهێزە.
**هەوێردە**: باڵدارێکە کەمێ لە ڕیشۆڵە زلتر، کونج کونجییەو زۆر ئاشقە هەرزنە، زۆر قەڵەوە. [ئوێردەک].
**هەڵدێر**: تاڤگە، جێگەی زۆر بەرز و قیت لە شاخدا.
**هەڵز**: گیایەکی بەناووبانگی گەڵآ دەرزییە، لە تیرەی کەماو لۆ. بۆ دەرمان دەشێ، بۆ چێشت خۆشە و لەوەڕی چاکە.
**هێرۆ**: گیایەکە بۆ دەرمان دەشێ، هەڵمەڵە.
**هەلەلە**: بالۆرە بەگەروو، هەیگۆ، هەیگۆ.
**هەر بینا**: هەر کاتێکت زانی، لە ناکاو لە پڕ.
**هامێز**: باوەش.
**هەوای تێکەڵ**: ئاهەنگی چەند قۆڵی.
**هەوری**: پارچەیەکی ئاوریشمی تەنکە ژنان بەسەر خۆی دادەدەن.
**هەژگەل**: لکەداری وشکەوەبووگ.
**هەندرێشن**: گیایەکی کوێستانی.
**هێڵە**: ئاموور.
**هەڵوەدا**: عەودالّ، لە دووی شتێک وێڵ و سەرگەردان.
**هەراشە**: زۆر گەورە بوو.

# ناوەڕۆکی بۆ کوردستان

**بەشی دووەم** 

# دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی
# ئاراس
## هەتا ئێستە ئەم کتێبانەی خوارەوەی بڵاوکردووەتەوە:

(١) هەڵکەوتی دیریکی لە کوردستاندا. دانانی: حوسێن حوزنی موکریانی.
(٢) سەروا. دانانی: د. عەزیز گەردی.
(٣) ژنی کورد بەستەم دەورە دراوە. دانانی: د. کوردستان موکریانی.
(٤) الحرب الكردية وإنشقاق ١٩٦٤. تأليف: ديڤيد ادامسن وجرجيس فتح الله.
(٥) رحلة الى رجال شجعان في كردستان. تأليف: دانا ادامز شمدت. ترجمة وتعليق: جرجيس فتح الله.
(٦) جمهورية مهاباد ـ جمهورية ١٩٤٦ الكردية. تأليف: وليم ايغلتن الابن. ترجمة وتعليق: جرجيس فتح الله.
(٧) كردستان أو الموت. تأليف: رينيه موريبس. ترجمة وتعليق: جرجيس فتح الله.
(٨) كرد وترك وعرب. تأليف: سي.جي. ادموندز. ترجمة وتعليق: جرجيس فتح الله.
(٩) طريق في كردستان. تأليف: أي.ام. هاملتن. ترجمة وتعليق: جرجيس فتح الله.
(١٠) ئەدەبی رووسی و کێشەی پاستیرناک. دانانی: د. مارف خەزنەدار.
(١١) لە پێناوی راستی و کورد و خانیدا. دانانی: محەمەدی مەلا کەریم.
(١٢) کۆچی سوور. رۆمانی: حەمە کەریم عارف.
(١٣) مساهمة علماء كردستان في الثقافة الاسلامية. تأليف: محمد زكي حسين.
(١٤) لە کوردستانی عێراقەوە هەتا ئەوبەری چۆمی ئاراس. نووسینی: مورتەزا زەربەخت. وەرگێڕانی لە فارسییەوە: شەوکەت شێخ یەزدین.
(١٥) فەرهەنگی کوردستان. دانانی: گیوی موکریانی.
(١٦) خاک و کێشەی مان. رۆمان: عەزیزی مەلای رەش.
(١٧) امارة بهدينان الكردية. تأليف: صديق الدملوجي . تقديم: د. عبدالفتاح علي بوتاني.
(١٨) المجتمع البشري لماذا يشبه مستشفى المجانين...؟. تأليف: مسعود محمد.
(١٩) جوایەز. بەرهەمی نۆ شاعیری هەولێری.
(٢٠) نەخشەی رۆنانی رێژەی کار لە زمانی کوردیدا. ئەندازیار د. شێرکۆ بابان.
(٢١) زریزەی زێڕین. دانانی: محەمەد ساڵح ئیبراهیمی.
(٢٢) شێخ رەزای تاڵەبانی شاعیری گەورەی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست. دانانی: ئەحمەد تاقانە.
(٢٣) خۆیبوون و شۆڕشی ئاگری. دانانی: رۆهات ئالاکۆم. وەرگێڕانی: شوکور مستەفا.
(٢٤) عەبدورەزاق بەدرخان. دانانی: جەلیلێ جەلیل. گۆڕینی بۆ کوردی باشوور: شوکور مستەفا.
(٢٥) القومية الكردية و د. عبدالله جودت في مطلع القرن العشرين. تأليف: مالميسانژ. ترجمة: شكور مصطفى.
(٢٦) کۆمەڵناسیی گەلی کورد. دانانی: مارتن ڤان براوینسن. وەرگێڕانی: شوکور مستەفا.
(٢٧) هەڵبژاردنەکانی کوردستان. دانانی: بەدران ئەحمەد.
(٢٨) تنوع الكرد في العراق ـ مدخل الي السياسة. تاليف: سامي شورش.
(٢٩) هەڵەبجە ـ کارەساتی کیمیابارانی ساڵی ١٩٨٨. دانانی: هەورامان عەلی توفیق.
(٣٠) گاڵتە بەچەک. رۆمان ـ نووسینی: جێمس ئۆڵدرج. وەرگێڕانی: د. عەزیز گەردی.
(٣١) لە مۆرکە تایبەتییەکانی رێزمانی کوردی. دانانی: د. شێرکۆ بابان.

(٣٢) بەرەو ڕێزمانی کوردی، بەرەو زمانی نووسین. دانانی: د. شێرکۆ بابان.
(٣٣) نادرنامەی ئەڵماس خانی کەڵهوڕ. ئامادەکردنی: شوکور مستەفا.
(٣٤) نظام الأناضول الشرقية. تاليف: اسماعيل بيشكچي. ترجمة: شكور مصطفى.
(٣٥) سینتاکسی رستەی کوردی. د. کوردستان موکریانی.
(٣٦) فەرهەنگی شارەزوور. کوردی– ئینگلیزی. دانانی: د. شەفیق قەزاز.
(٣٧) الصراعات الدولية. تأليف: محمد احسان رمضان.
(٣٨) مەلا مەحموودی بایەزیدی یەکەمین چیرۆکنووس و پەخشاننووسی کورد. دانانی: د. فەرهاد پیربباڵ.
(٣٩) گێتی زیندەوەر. دانانی: عەلائەدین سەجادی.
(٤٠) مێژووی پەخشانی کوردی. دانانی: عەلائەدین سەجادی.
(٤١) دیوانی شێخ رەزای تاڵەبانی. ئامادەکردنی: شوکور مستەفا.
(٤٢) كردستان ودوامة الحرب. تأليف: محمد احسان رمضان.
(٤٣) ڕۆمانی ڕێگا. دانانی: محەمەد مەولوود مەم.
(٤٤) مقالات حول القضية الكردية. تأليف: فوزي الأتروشي.
(٤٥) حياتي الكردية أو صرخة الشعب الكردي. مذكرات: نورالدين زازا.
(٤٦) بۆ کوردستان. دیوان: هەژار موکریانی.

## ئەم کتێبانەی خوارەوەش بەڕێوەن:

(٤٧) جنوب كردستان في الدراسات الانثروپولوجية. ترجمة: جرجس فتح الله.
(٤٨) مبحثان على هامش ثورة الشيخ عبيدالله النهري. تأليف: جرجس فتح الله.
(٤٩) مهد البشرية او الحياة في شرق كردستان. تأليف: دبليو. أي . ويگرام وادگار. تي. أي. ويگرام. ترجمة: جرجيس فتح الله.
(٥٠) حەمکێ توڤی. دانانی: د. مەسعود کتانی.
(٥١) فەرهەنگی مەرگ و ژی. فەرهەنگێکی کوردی – کوردییە. دانانی: مەلا خەلیل مشەختی.